# سەردەم

گۆڤـارێکی تایبەتـە بـەوەرگێڕان و کـەلتووری بیـانی

دەزگـای چـاپ و پەخشـی سـەردەم دەریدەکـات

ژمـارە (14) نیسـانی . 2001 – سـاڵی سـێیەم

خاوەنی ئیمتیاز : شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین :

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: یادگار ئەوڕەحمان



ناونیشان:

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839 یان 4347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

# سەردەم

ژمارە (14) نیسانی 2001 ساڵی سێیەم

## ■ فیکرو فەلسەفە 3



## ■ دەقی هەڵبژاردە 63



## ■ گفتوگـۆ 83



## ■ فایلی ژمارە 105

### مارکس و مارکسیزم



## ■ وێستگەکانی سەردەم 189

# سەردەم

# فیکرو فەلسەفە

- پیر بۆردیۆ
  - چۆن ئەڕوانمە فەلسەفە
- ئیسلام لە مێژوودا
- شێخەکان و ئایدیۆلۆژیاکانیان

هاشم سالح

کارل پۆپەر

محەمەد ئەرکۆن

فالح عەبدولجەبار





# "پییر بۆردیۆ" و
## سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخ

■ هاشم سالح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



"پییر بۆردیۆ" بە یەکێك لە گرنگترین سۆسیۆلۆژەکانی فەرەنساو تەنانەت خۆرئاواش دادەنرێت. "بۆردیۆ" گەیشتۆتە قۆناغی داڕشتنی تیۆریای تایبەت بەخۆی، ئەمەش ئاستێکە تەنها سۆسیۆلۆژە مەزنەکانی وەك "دۆرکهایم" یاخود زانای مەزنی ئەڵمانی "ماکس ڤیبەر" پێی دەگەن. تا ئێستا چەند کتێبێکی سەرەکی بڵاوکردۆتەوە کە هەریەکەیان لەکاتی بڵاوبوونەوەیدا دەنگدانەوەی خۆی هەبووە، لەوانە: (سۆسیۆلۆژیای جەزائیر- *1961*، جیاوازی- *1979*، هەستی عەمەلی یان شارەزایی راستەوخۆ- *1980*، چەند مەسەلەیەك دەربارەی سۆسیۆلۆژیا- *1980*، مرۆڤی ئەکادیمی- *1984*، فەلسەفەی ئەنتۆلۆژیای سیاسی لای مارتن هایدگەر- *1988*، خانە دانەکانی دەوڵەت- *1989*، پاشان ئەم دواین کتێبەی کە ئێمە لە سەرو باسی داین، ئەویش کتێبی وەڵامەکانە - *1992*). "بۆردیۆ"

لەم کتێبەیدا ئەو سەرەتا تیۆرییو پرانسیپە مەنهەجیانە دەخاتە روو کە لە هەشتاکاندا بەسەر کارەکانیدا باڵادەست بووە.

کتێبەکە لە بەرگەوە بۆ بەرگ بریتییە لە گفتوگۆیەکی دوورو درێژ یان ژمارەیەك گفتوگۆ کە یەکێك لە توێژەرە رۆژنامەنووسەکان، لە هەریەك لە شیکاگۆو پاریس لەگەڵیدا سازی داوە. کاتێك زانکۆی شیکاگۆ داوەتی "بۆردیۆ"ی کرد بۆ پێشکەشکردنی چەند لێکچەرێك دەربارەی تیۆریاکەی، "لویك ڤاکان"ی رۆژنامەنووس چاوی پێی کەوت و بە درێژایی ماوەی مانەوەی لەوێدا جێی نەهێشت، ئەویش بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵیدا. پاشان کە گەڕایەوە پاریس بۆ تەواوکردنی گفتوگۆکە "ڤاکان"یش گەڕایەوە لەگەڵیداو، لە قوتابخانەی خوێندنی باڵا بۆ سۆسیۆلۆژیا دیدارەکەی تەواوکردو، کتێبێکی دوورو درێژی (267) لاپەڕە گەورەی لێ هاتە بەرهەم.

بەم دواییانە بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە کتێبانە لە فەرەنسادا بۆتە شتێکی باو، بە دەگمەن بیریارێکی مەزن دەبینیت کتێبێکی بە شێوەی گفتوگۆ نەبێت. ئەمجۆرە کتێبانەش ئاسانترن بۆ تێگەیشتن و، خوێنەریش توشی بێزاری ناکەن وەك ئەوەی لە خوێندنەوەی کتێبێکی زۆر تایبەت و وشکدا روودەدات و، تێگەیشتنی لە لایەن خوێنەرەوە کارێکی ئاسان نییە.

هەرچۆنێك بێت "لویك ڤاکان" چەندین پرسیاری جۆراوجۆرو رووگیری لە "بۆردیۆ" کردووەو، پێشەکییەکی درێژیشی بۆ نووسیووە، بە مەبەستی رونکردنەوەی تەوەرە سەرەکییەکانی فیکری ئەو بیریارە فەرەنسییە.

"ڤاکان" لە سەرەتاوە دەڵێت: ئەو توێژینەوە زانستییەی لە ماوەی سی ساڵی رابردوودا "پییر بۆردیۆ" بەرهەمی هێناوە بە گرنگترین دەسکەوتی توێژەرانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی دادەنرێت. کاریگەری ئەم سنوورەکانی سۆسیۆلۆژیا دەبەزێنێ بۆ ئەوەی بگاتە ئەنترۆپۆلۆژیاو سۆسیۆلۆژیای پەروەردەو مێژوو، زمانەوانی و زانستی سیاسی و فەلسەفەو رەخنەی هونەری و ئەدەبی. هەروەك چۆن کاریگەری سنووری فەرەنسای بڕیووە بۆ ئەوەی بگاتە وڵاتانی ئەوروپاو ئەسکەندەناڤیاو ئاسیاو ئەمریکای لاتین و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەو شتەی لە بەرهەمەکانی "پییر بۆردیۆ"دا زۆرتر مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە هەموو سنوورەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان دەبەزێنێت و، ئیعتیراف بەو ئاقارە پسپۆڕخوازیە بەرتەسکە ناکات کە زانستەکان لە یەکتری جیادەکاتەوە، بەڵکو سوود لە هەموویان دەبینێت بۆ داڕشتنی تیۆریاو زاراوە تایبەتیەکانی خۆی، هاوکات چارەسەریشی بۆ ئەو کێشە ئەزەلیە بەردەوامەی نێوان خودگەرایی و بابەتگەرایی، واتە ئەوەی روحی (یان رەمزیە) لەگەڵ ئەوەی مادیە، لە نێوان تیۆریاو پراکتیك یاخود مومارەسەی عەمەلیدا دۆزیەوە. چونکە ئەو ئیعتراف بەو دابەشکردنەی نێوان دووانە لێکدژەکان ناکات و، پێی وایە ئەمە پاشماوەی تیۆریای تەقلیدیەو ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە لێی تێبپەڕێنرێت. هەروەها مەنهەجیەتێکی تازەش پێشنیار دەکات بۆ دەربازبوون لەو تەڵەزگەیەی بونیادگەری پێی گەیشتووە.

*ئەرکی سۆسیۆلۆژ چییە؟ یان بە زمانی "پییر بۆردیۆ" وەزیفەی ئەو چییە؟*

ئەرکی سۆسیۆلۆژ بە بڕوای ئەو ریتییە لە پرۆسەی ئاشکرا کردن و هەڵماڵینی پەرد لەسەر رووی بونیادە شاراوەکان یان بونیادە تولەکان کە کەس ئیعترافی پێ ناکات، یاخود کەس نای بینێت (لەبەر هۆیەکی زۆر سادەو ساکار) ئەریش ئەوەیە کە

نادیارەو لەبەرچاو نییە. خەلکی پێیان وایە ئەوان لە هۆکاری رەفتارو هەڵسوکەوتەکانی خۆیان دەگەن، تەنها لەبەرئەوەی خۆیان بەو کارانە هەستاون و خۆیان جێبەجێیان کردوون. بەڵام لە راستیدا ئەوان نازانن و لەو هۆکارانە بێ ئاگان. ئەمە ئەوەیە کە سۆسیۆلۆژ هەوڵدەدات بۆیانی روون بکاتەوە. سۆسیۆلۆژ پەردە لە رووی ئەو میکانیزمە شاردراوەو یاسا نادیارانە هەڵدەماڵێت کە جڵەوی کۆمەلگە دەکەن، بەڵام بەبێ ئەوەی کۆمەلگە خۆی درك بەمە بکات.

"پییر بۆردیۆ" بە پێچەوانەی سۆسیۆلۆژیای کلاسیکیەوە کۆمەلگا بە گشتی و تێکڕا پێکەوە تاوتوێ ناکات، بەڵکو بەسەر چەند یەکەیەکی بچووکدا دابەشی دەکات تا کاری تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەی بۆ ئاسان بکەن.. بەمجۆرە دەبینین بەجیا باس لە جیهانی سەندیکا کرێکاریەکان یان سەندیکای خاوەن کارەکان و، یاخود تەنانەت جیهانی وەرزش یان جل و بەرگ یاخود مۆدەو.. هتد، دەکات. هەموو ئەمانەش ناودەنێت کایە یان گۆرەپان، و سەرجەمی ئەم کایانەش کۆمەلگە پێکدەهێنن. بەڵام لای "بۆردیۆ" بڕیارێکی سەرتاسەری نادۆزێتەوە بەسەر تەواوی کۆمەلگەدا، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئەو ئەمە شتێکی نازانستی‌یەو، لەو رۆشنبیریە گشتگیریەش بە توندی بە ئاگامان دێنێتەوە کە دەڵێت: (هەرو شتێك دەربارەی هیچ شتێك یاخود هیچ شتێك دەربارەی هەموو شتێك).

ئەو پێی وایە پێویستە تەنها حوکم بەسەر حاڵەتێکی دیاریکراو و سنووردارا بدەین، واتە حاڵەتێك کە بتوانین بە فیعلی لێیبکۆڵینەوەو تێی بگەین. سەرەڕای ئەوەش جیاوازیەك لە نێوان دیدوبۆچوونی ئێمە بۆ جیهانی کۆمەلایەتی "یان بۆ کۆمەلگە" و، لە نێوان حەقیقەتی کۆمەلگە وەکی خۆیدا هەیە. چونکە ئێمە پێمان وایە بۆچوونمان لەسەر واقیع خودی واقیع خۆیەتی، ئەمەش هەڵەیەکی تەواوە، لەبەرئەوەی واقیع بەو ئاستە شەفاف و ناسك نییە وەك ئێمە مەزندەمان دەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە.

بەر لە هەموو شتێ پێویستە سۆسیۆلۆژ خۆی لە هەموو بیروبۆچوونێکی باو دووربخاتەوە، پێش ئەوەی دەست بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کۆمەلگە بکات. چونکە کۆمەلگە دیدو بۆچوونی زۆر گەورە دەربارەی خۆی دروست دەکات و وەکی (حەقیقەتێك) بەسەر هەموانیدا دەسەپێنێت، بۆیە پێویستە ئەم دیدو بۆچوونە زەبەلاحانە وەلا بخرێت بەر لە سەپاندنی حەقیقەتە زانستیەکان. کەواتە سۆسیۆلۆژی رەخنەگر لە حاڵەتێکی ناکۆکی و ململانێی بەردەوامدا دەژی لەگەڵ ئەو واقیعەی چواردەوریدا، بەر لەوەی بتوانێت بگاتە کەشفکردنی راستیەکانی کۆمەلگە. دابڕانیش لەگەڵ بیروڕای باو یاخود لەگەڵ رای گشتیدا یەکەمین پرانسیپی ئەبستمۆلۆژیە کە پێویستە سۆسیۆلۆژ پابەند بێت پێیەوە.

بەلام بێگومان سۆسیۆلۆژیش ناتوانێت بەردەوام لەگەڵ حەقیقەتە زانستیەکاندا بژی! لەبەر ئەوەی ئەمە شتێکی مەحاڵەو رەنگە لە سەرەنجامدا ببێتە مایەی شێتی. بۆیە مافی خۆشیەتی کە وەکی هاوڵاتیەك، وەك مرۆڤێکی ئاسایی لە کۆمەلگەدا بژی. مرۆڤیش تەنها بە راستی ناژی و هەندێ جار کەش و هەوای حەقیقەت زۆر ساردو سڕەو تەحەمول ناکرێت (کێ دەتوانێت حەقیقەت هەموو حەقیقەت لە ئەستۆ بگرێت؟). بەلام پێویستە هەموو ئەمانە لەبیر بکات کاتێك دەچێتە ناو لابوری سۆسیۆلۆژیاوە، ئەوکات لەوە دەکەوێت کە هەر هاوڵاتیەك بێت، بۆ ئەوەی ببێتە زانایەك زاناو هیچی تر.

بەمجۆرە دەبینین کەوا زانست ئاسان نییەو، مەرجی قورسی دەوێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لەو بوارەدا شتێك ئەنجام بدات، گەروا نەبوایە ئەوا تەواوی خەڵکی دەبوونە زانا، ئەمەش بۆ خۆی مەحاڵە.

## ململانێ لە نێوان "ژان پۆڵ سارتەر- و -کلۆد لیڤی شتراوس" یان لە نێوان "خودگەرایی ریزپەڕ- و - بابەت گەرایی ریزپەڕ"دا

هەرچۆنێك بێت سۆسیۆلۆژی فەرەنسی "پییر بۆردیۆ" پێی وایە دوو میتۆد بۆ لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی کۆمەڵگە هەیە: یەکەمیان بابەتگەراییەکی ریزپەڕە (یان بونیادگەرییە)، دووەمیشیان خودگەراییەکی ریزپەڕە (یان فینۆمینۆلۆژییە). یەکەمیان لە فکری هاوچەرخی فەرەنسیدا پێشەنگی بونیادگەری "کلۆد لیڤی شتراوس" نوێنەرایەتی دەکات. دووەمیشیان "ژان پۆڵ سارتەر"ی نەیاری نوێنەرایەتی دەکات.

مەنهەجیەتی یەکەم بە شێوەی زانستی (فیزیای کۆمەڵایەتی) لە کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە، واتە لە دەرەوەو بە شێوەیەکی بابەتی ژمێریاری ساردو سڕ دەڕوانێتە کۆمەڵگە. واتە وەها لە بونیادی کۆمەڵگە دەکۆڵێتەوە وەك چۆن بونیادی مادەیەك تاوتوێ دەکات، ئەم مەنهەجە کۆمەڵگە پارچە پارچە دەکات و دەست دەکات بە ئەناتۆمی کردنی، بە پێودانگی ماتماتیکی ورد چاودێری دەکات و دەیپێوێت. تایبەتمەندێتی ئەم مەنهەجیەتە ئەوەیە (ئەو وەهمە دەڕەوێنێتەوە کە بڕوای بە شەفافیەتی جیهانی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵگە هەیە، بەڵام مەترسی لەوەدایە ئیرادەی فەردی و تاکەکەس دەسڕێتەوە وەك ئەوەی ئەوانە تەنها ئامێری بەشت بووبن).

هەرچی مەنهەجیەتی دووەمە کتێبە بەناوبانگەکەی "ژان پۆڵ سارتەر" (بوون و نەبوون)، بە چاکترین شێوە تەعبیری لێدەکات. ئەم بە پێچەوانەی بونیادگەراکانەوە پێی وایە مرۆڤ (یاخود بکەرە کۆمەڵایەتیەکان بەپێی زاراوەی سۆسیۆلۆژیا) بەردەوام لە رێگای مومارەسەی عەمەلیەوە، جیهانی کۆمەڵایەتی خۆیان دروست دەکەن و ژیانی رۆژانەیان رێکدەخەن. لە روانگەی فینۆمینۆلۆژیای کۆمەڵایەتیەوە، کۆمەڵگە وەها دێتە بەرچاو وەك ئەوەی بەرەنجامی بڕیارو کارو چالاکیە فەردی و تاکە کەسیەکان بێت و.. کۆمەڵگەش بە شێوەیەکی راستەوخۆو شەفاف خۆی بەرچاوی فەردەکانی دەخات. خەسڵەتی ئەم مەنهەجیەتە لەوەدایە تاکەکان لە ئیرادەی هوشیاری یان لە هێزو توانای خۆیان بۆ گۆڕینی واقیع بێ بەش ناکات، کارێك کە بونیادگەریی "کلۆد لیڤی شتراوس" دەیکات.

بە بۆچوونی "بۆردیۆ" دوو کەموکوڕی گەورە و ترسناك لەم مەنهەجیەتەدا هەیە. یەکەمیان ئەوەیە کە بونیادە کۆمەڵایەتیەکان بە کەم دەگرێت و، وەك بەرەنجامێکی ستراتیژیەت و کارو چالاکی فەردی سەیری دەکات. بەڵام ئەوەی راستی بێت (واقعی بابەتی) بوونی تایبەتی خۆی هەیە کە لە دەرەوەی ئیرادەی فەردی ئێمەدایەو خاوەنی یاسای ناوکۆیی، خۆیەتی، گەروا نەبوایە ئەوا دەمانتوانی بەپێی خواست و ویستی خۆمان گۆڕانکاری تێدا بکەین و دەسکاری بکەین.

تاقیکردنەوەش پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێنێ. چونکە زۆرجار هەوڵی گۆڕینی کۆمەڵگ دەدەین بەڵام سەرکەوتوو نابین و، زۆرجار لە رێی سەرکێشیەکی بێ سەروبەرەوە هەوڵی ئەوە دەدەین باز بەسەر قۆناغەکاندا بدەین، بەڵام کاتێك بە خۆمان دەزانین دەگەڕێینەوە بۆ دواوە لەبری ئەوەی بەرەوپێش

بچین. کەواتە واقیع بە ویست و ئارەزووی ئێمە ناگۆڕێت، بەڵکو واقیع ڕێسای بابەتیانەی خۆی هەیە. ئەمەش یەکەمین ڕەخنەیە کە ئاراستەی تیۆریاکەی "سارتەر" دەکرێت. هەرچی ڕەخنەی دووەمیشە ئەوەیە گەر ڕاستیش بێت تاکە کەسەکان واقعی کۆمەڵایەتی چ لە ڕووی فەردی و چ لە ڕووی دەستەجەمعیەوە پێکدەهێنن، بەڵام ئەوە ئەوان نین ئەو کلیل و ئامرازانە دروست بکەن کە لە پێناو ئەم پرۆسەی پێکهێنانەدا بەکار دەهێنرێت. بە واتایەکی دی ئەوان بە تەنها سەرپشك نین لە هەڵبژاردنەکانیاندا، بەڵکو هاوکات ناچارن بە هەڵبژاردنێك.

## ئەلتەرناتیڤی "پییر بۆردیۆ"
## بۆ مەنهەجیەتی هەریەك لە "سارتەر" و "شتراوس"

"بۆردیۆ" پاش ئەوەی ڕەخنە لە بابەتگەرایی – میکانیکی لەسەر شێوەی "شتراوس" و خودگەرایی – فینۆمینۆلۆژی لەسەر شێوەی "سارتەر" دەگرێت، هەوڵدەدات ئەلتەرناتیڤێك لە جیاتی هەردووکیان بخاتە ڕوو.

"بۆردیۆ" پێی وایە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تا خۆمان لەو دوانە لێکدڕانەی ماوەیەکی دوورو درێژ باڵادەست بوو بە سەرمانەوە ڕزگار بکەین. وەك دوانە لێکدڕەکانی (خودگەرایی/ بابەتگەرایی، بونیادگەری میکانیکی/ فەردانیەتی سەرکێش، جەبریەت/ ئازادی و... هتد). چونکە ڕێگایەکی دیکە هەیە بۆ بینینی واقعی کۆمەڵایەتی و تێگەیشتن لە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان، ئەم ڕێگایە (یاخود تیۆریایە)یش "بۆردیۆ" دەیهێنێتە ئارا.

ئەم زانایە پێی وایە نابێت لەمڕۆ بەدواوە دیلی ئەو دوانە لێکدڕە هەڵبەستراوانە بین، چونکە لە واقیعدا ناکۆکی و دژایەتی لە نێوان ئەو دوو تیۆریایەی پێشوودا نییە (واتە تیۆریای سارتەر و تیۆریای شتراوس) بەڵکو یەك یەکتری تەواو دەکەن. هۆکەشی ئەوەیە جیهانی کۆمەڵایەتی خەسڵەتێکە دوالیزمی ئەزەلی هەیەو، مرۆڤ بە سروشتی خۆی خودو بابەتە، کۆمەڵگەش بە هەمان شێوە. هەرکاتێك دەگەوێنە تاوتوێکردنی کۆمەڵگە پێویستە لە سەرمان ڕەچاوی هەردوو مەنهەجیەتەکە بکەین. یەکەمجار پێویستە بیروبۆچوونە گشتگیریەکان و بیروباوەڕە باوەکان وەلاوە بخەین، لە پێناوی ئاشکراکردنی بونیادە حەقیقیەکان و ئەو زەبرو زۆرە بابەتیانەی لە واقیعدا هەن. دوای ئەوە دەبێت خودگەرایی بێنینە ناوەوە بە مەبەستی زانینی ئەوەی چۆن چۆنی لە ڕەوتی واقیعدا بەشداری دەکات و، ڕادەی کاریگەرێتی لەسەر واقیع چەندە؟

ئەم دوو چرکەساتە لە چرکەساتەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی پێکەوە پەیوەستن و هەریەك ئەوی دی تەواو دەکات، چونکە وەسفی بابەتی پێش حوکمی فەردی دەکەوێت نەك بە پێچەوانەوە. بۆیە دەکرێت بڵێین ئەولەویەت دەگەڕێتەوە بۆ چرکەساتی یەکەم یان مەنهەجیەتی یەکەم، کە بواری ئەوەمان دەداتێ بە شێوەیەکی زانستی– بابەتی لە بونیادی واقیع تێبگەین. هەرچی لێکدانەوەی خودگەرایییە ئەوا لە دوایدا دێت، لەبەر ئەوەی بە پێی گۆڕانی مەوقعیەتی خودی کارا لە گۆڕەپانی کۆمەڵایەتیدا گۆڕانی بەسەردا دێت.

چونکە هەر خودێکی بکەر بۆچوونی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەویش بەپێی مەوقعیەت و پلەوپایەکەی. سەرەڕای ئەمەش "بۆردیۆ" پێی وایە چونیەکیەك لە نێوان بونیادە کۆمەڵایەتیەکان (واتە بابەتگەرایی) و، نێوان بونیادە ئەقڵیەکان (واتە خودگەرایی)دا هەیە.

## "پیر بۆردیۆ"
## (هایدگەرو دێریداو فەیلەسوفانی تەفکیک) دادگایدەکات.

دوای ئەوەی بەشێکمان لە تیۆریای "پییر بۆردیۆ" لەمەڕ سۆسیۆلۆژیا خستە بەردەست، هەندێکی تر دەچینە ناو ئەم کتێبەوە تا بزانین رای بەرامبەر بە "هایدگەر"ی مەزنە فەیلەسوفی ئەڵمانیا چۆنە. ئێمە لە سەرەتای ئەم باسەدا باسمان لەوە کرد کەوا "بۆردیۆ" کتێبێکی تەواوی بە ناونیشانی (ئەنتۆلۆژیای سیاسی مارتن هایدگەر) بۆ "هایدگەر" تەرخان کردبوو، بیروبۆچوونەکانی هەندێک مشتومڕی لە ناوەندی فەیلەسوفانی ئەڵمانیاو فەرەنسادا دروست کردبوو، هێرشەکانی وەک هێرشێک بۆ سەر سەرجەمی فەلسەفە درایە قەڵەم.

وەک دەزانرێت فەلسەفەو سۆسیۆلۆژیا لە هەوڵی یەکلایکردنەوەی کێشەکانی نێوانیاندان. فەلسەفە سۆسیۆلۆژیا بەوە تاوانبار دەکات کە لە وردەکاری مادیدا رۆدەچێت و ئاگاتە ئاستی ئەو، هەروەها سۆسیۆلۆژیاش فەلسەفە بەوە تاوانبار دەکات کە شتێکی ئەبستراکت و سەراپاگیرەو پێویست نییە. بەردەوام تا ئەمڕۆش ئەم کێشەیە درێژەی هەیە. لە سەروبەندی ئەم مەسەلەیەدا "لویک ڤاگان" ئەم پرسیارەی رووبەڕووی "پییر بۆردیۆ" کردەوە: ئەو کتێبەی سەبارەت بە "هایدگەر" نووسیتان چەندین پرسیاری وروژاند، لەوانە مەسەلەی بەکارهێنانی سیاسیانەی فەلسەفە لەلایەن هەندێک فەیلەسوفانی هاوچەرخەوە، لەم بارەیەوە دەڵێن چی؟.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا وتی: من هەلی ئەو گفتوگۆو مشتومڕەم قۆستەوە کە بەم دواییە لە فەرەنسادا سەبارەت بە کارەکانی "هایدگەر" دروست بوو، تا هەڵوێستی خۆم روونبکەمەوە. بەمەش ویستم پەردە لە رووی هەندێک کێشەی سیاسی هەڵبماڵم کە لە هەندێک مومارەسەی فەلسەفی دیاریکراودا بەدی دەکرێت، وەک ئەوەی لە ساڵانی شەست و لە بواری هونەریدا تەشەنەی سەند، ئەویش لە رێی شکۆبەخشین و ستایشکردنی کارو بەرهەمەکانی "نیتشەو هایدگەر"ەوە. "بۆردیۆ" لێرەدا مەبەستی ئیشەکانی "فۆکۆو دولۆزو دێریدا"یە، بەڵام بەبێ ئەوەی ناویان بهێنێت. خەسڵەتی ئەم ئاقارە فەلسەفیە حەزکردن بوو بە بەزاندنی حەرامکراوەکان، یاخود بەزاندنی هەموو سنوورەکان. پێموایە ئاقارێکی لەمجۆرە زۆر ئاڵۆزو تەمومژاوییە لە رووی فیکری و سیاسییەوە، گەر نەشڵێم کەوا جێگای گومانە.

لەبەرئەوە "کێشەی هایدگەر" دەرفەتێکی گونجاو بوو تا ئەوە روونبکەمەوە کە پەڕگیری فەلسەفی یاخود تەرکیز کردنە سەر واقعێکی ئۆرستۆکراتی کۆمەڵایەتی بە واتای تەرکیز کردنە سەر چینێکی دیاریکراو دێت، ئەم ئۆرستۆکراتیە کۆمەڵایەتیەش لای خۆیەوە تەرکیز دەکاتە سەر هەڵوێستێکی دژیانە بەرامبەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان، بەم پێیەش ئەوا نوێنەرانی ئەم ئاقارە فەلسەفیە ناتوانن دیدگایەکی واقعیانە سەبارەت بە جیهانی کۆمەڵایەتی یاخود دەربارەی کۆمەڵگە دروست بکەن.

ئەمەش بۆ خۆی دەرەنجامی خراپی لەسەر ژیانی رۆشنبیری دەبێت و، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەمان کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسیش دەبێت. کاری رێکەوتیش نییە کە پڕۆژەی فەلسەفی فەیلەسوفەکانی ساڵانی شەستی فەرەنسا لە دژی زانستە مرۆڤایەتیەکان دروست بوو، لە ئەمریکاشدا بووە مایەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلێکی نارەزایی لە دژی ئەو زانستانە، ئەم تەوژمەش لەژێر ناوی تەفکیکو رەخنەگرتن لە دەق بوو. هەروەها بووە مایەی بڵاوبوونەوەی ناعەقڵانیەت لەژێر ناوی "پۆست

مۆدێرنـە"دا. ئـەم ئامـاژەی دواییـان بـە ئاشـکرا مەبەست لێی "ژاك دێریـدا"یـە. جـێی باسـە کێشـەو ململانێی نێوان "بۆردیۆ" و ئەو فەیلەسوفانەی سـەر بە ئەوەی خۆیین بە ماوەیەکی بەر لەو کاتـە دەسـتی پێکرد. بیرمە کاتێك ئامـادەی لێکچـەرەکانی دەبـووم لە (کۆلیج دیی فرانس)– لەوێدا وانەی سۆسـیۆلۆژیای دەوتەوە– بەردەوام پـلارو رەخنـەی تونـدی دەگرتـە فەلسـەفەو فەیلەسـوفەکان. ئـەوەی بــە کـەموکوڕی دەزانـی لـەواندا ئــەوەبوو کـە ئـەوان تـا ئێسـتاش بـەردەوام دوورن لـە کێشـەو گرفتـە واقعیـەکان و، مامەڵـە لەگـەڵ رووداوە واقعیـەکاندا ناکـەن. هاوکـات کاری مەیدانی بۆ توێژینەوەی زانستی ئەنجام نادەن.

لە دوایدا بە ئاشکراو لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامـەکان شەڕو ململانێیەك لە نێوان ئەو "دێریدا"دا هەڵایسـاو، ڕۆژنامــەی (لیبراسـیۆن) بەشـێکی ئــەو شــەڕەی بڵاوکردەوە. بەڵام پاشان "بۆردیۆ" یـەك لایەنـە ئـەو شەڕەی راگرت، ئەویش لە رێی نامەیەکی شەخسیەوە کـە ئاراسـتەی (لیبراسـیۆن)ی کـردو، رونیکـردەوە درێژەدان بـە مشـتومڕ لەگـەڵ ئـەو فەیلەسوفەدا بێ ئاکامــە و ئامانگەیەنێتــە هیــچ. شــایەنی باســە فەلسەفەی "ژاك دێریدا" لە چەند سـاڵی دوایـدا بۆتـە کۆمەڵـە تەلیسم و ئاماژەو زاراوەیـەکی وا کــە هیـچ مانایەکی نیـیە، بـە کورتیەکـەی فەلسـەفەکەی بۆتـە وشەسـازی و گەمـەکردن بـە زاراوەکــان بـەبێ هیـچ ئامانجێکی دیاریکراو. بەمەش ئەم فەیلەسوفە زۆر لـە راستگۆیی خۆی لەسەر گۆڕەپانی فکری فەڕەنسی لە دەستدا. بەڵام هەر لـەم ئان و ساتەدا شێوازو بـیرو بۆچوونەکانی لەناو رۆشنبیری عەرەبیدا دەستیان بە بڵاوبوونەوە کرد. ترس لەوە هەیە ئەمە ببێتە مایـەی تێکدانی مەسەلەکان و بڵاوبوونەوەی زمـانێکی ئـاڵۆزو بـەگرێ و گــواڵ لــەناو کلتــوورو فیکـری عـەرەبیدا، ئەمەش دواین شتە کـە ئێمـە لـە ساتەوەختی ئێستا پێویستمان پـێی بێت.

ئێمە پێویستمان بە رێبازی تازە هەیـە لـە بـواری توێژینەوەی زانستیدا تا یارمەتیمان بدات بـۆ ئـەوەی کێشەکانمان بخەینەڕوو، هاوکات یارمەتیدەرمان بێت تــا دەســت نیشــانی ئــەو کێشــانە بکــەین و چارەسەریشیان بۆ بدۆزینەوە.

من ئەمانە بۆ ئەوە ناڵێم تا هـەرچی خەسڵەتێکی ئیجابی هەیە لە فیکری "ژاك دێریـدا"دا نـەفی بکـەم، هەروەها ئـەم قسانەش بـۆ ئـەوە ناکـەم تـا رێگا لـە وەرگێڕانی کارەکانی بگرم بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی. چونکـە بێگومــان ئــەو یەکێکـە لەوانــەی بــاس و لێکۆڵینەوەی گرنگـی بەرهـەم هێنـاوە، بەتاییـەت لـە قۆنـاغی سـەرەتایدا هاوکـات مەنهەجیـەتی تــەفکیك سوودو گرنگی خـۆی هەیە گـەر بێت و بـە راسـتی و دروستی لێی حاڵی بیت، بـەڵام رۆچوون لـەم ئاقـارە تـەفکیکی و تەجریدیـەدا شتێکی زەرەرمــەندە، بــە تایبەت گەر هاتوو هاوشـان بەمـە دوورکەوتنـەوە لـە زانسـتە مرۆڤایـەتی و کۆمەڵایەتیـەکان پـەیڕەو کــرا. چونکـە زانســتە مرۆڤایــەتی و کۆمەڵایەتیــەکان لــە گرنگــترین ئـەو شـتانەن کـە لــە ئێســتادا ئێمــە پێویستیمان پێیان بێت.

**سەرچاوە:**

*هاشم صالح: قراءة في الفكر الاوربي الحديث– الطبعة الاولى، 1994.*

# چۆن ئەڕوانمە فەلسەفە

■ نووسینی: کارل پۆپەر

● و. لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵڵا سیوەیلی



-1-

چۆن ئەڕوانمە فەلسەفە، ناونیشانی یەکێکە لەو نووسینە بەناوبانگ و پڕپایەخانەی هاوڕێی کۆچ کردووم فریدریك وایزمان. لەو نووسینەدا زۆر لایەن هەیە کە من بە دڵمەو کۆمەڵە خاڵێکی تیایە کە جێگەی ڕەزامەندی منە ئەمە لە کاتێکدا کە شێوازی من تەواو جیاوازە لە هی ئەو.

فرێز وایزمان و زۆرێك لە هاوڕێکانی ئەیانەوێ بیسەلمێنن کە فەیلەسوفەکان جۆرێکی تایبەتن لە خەڵك، فەلسەفەش ئەتوانرێ وەك چالاکی تایبەتی ئەوان سەیر بکرێ. ئەوەی کە ئەو ئەیەوێت لەو نووسینەدا دەری ببڕێت لە ڕێگەی، نموونە هێنانەوەوە ئەوەیە کە چ شتێك کاراکتەری جیاکەرەوەی فەیلەسوفێك وە کاراکتەری جیاکەرەوەی فەلسەفەیەك پێك ئەهێنێت، ئەگەر بێت و بەراورد بکرێت لەگەڵ بابەتە ئەکادیمیەکانی تری وەك ماتماتیك و فیزیك؟

بەم جۆرە ئەو هەوڵ دەدات کە بە شێوەیەکی تایبەت پێناسەیەك بدات بە سووبو . الاکی یەکانی فەیلەسوفی ئەکادیمی هاوچەرخ وە کەش و هەوایەك دەربخات کە ئاخۆ فەیلەسوفەکان لە ڕابردوودا چیان کردووە.

تەنها ئەمانە جێگەی خۆشحاڵی نین و بەس، بەڵکو نووسینەکەی وایزمان رادەیەکی بەرچاوی تێکەڵ بوونی تایبەتی لەم چالاکی‌یە ئەکادیمیانە پیشان دەدات وە تەنانەت بۆ وروژاندنی هەستی خۆشیش. ئاشکرا تر بڵێین ئەو، بە هەڵسەنگاندنی لەم گروپە تایبەتەدا، بە جەستەو رۆحیش فەیلەسوفە وە هیواخوازە کە شتێك لەو وروژاندنی خۆشی‌یەمان بۆ بگوێزێتەوە کە لە نێوان ئەندامەکانی ئەم جڤاتە تایبەتەدا دابەش کراوە.

--2--

ئەو شێوازەی کە من لێوەی ئەڕوانمە فەلسەفە تەواو جیاوازە. من لەو باوەڕەدام هەموو ژنێك یان پیاوێك فەیلەسوفە بەڵام هەندێکیان بە رادەیەکی زیاتر لە هەندەکەی تر. بێگومان من رازیم بەوەی کە شتێك هەیە وەك گروپێکی جیاوازو تایبەتی خەڵك کە بریتیە لە فەیلەسوفە ئەکادیمیەکان؛ بەڵام من دوورم لە هاوبەشی کردنی وایزمان لەو حەماسەدا کە بۆ چالاکی‌و رێبازی ئەوانی هەیە.

بە پێچەوانەوە من وا هەست دەکەم کە زۆر هەیە بگوترێت دەربارەی ئەو کەسانەی کە متمانە بە فەلسەفەی ئەکادیمی ناکەن. بەهەر شێوەیەك بێت من بە تەواوی دژی بۆچوونێکم (بۆچوونێکی فەلسەفیانە)، کە کاریگەری‌یەکەی تاقی نەکراوەتەوەو هەرگیز ناویش نەبراوە، وە دراوەتە پاڵ نووسینە پرشنگدارەکەی وایزمان:

مەبەستم لە ئایدیای نوخبەیەکی رووناکبیرو فەلسەفی‌یە.

بێگومان من دان بەوەدا ئەنێم کە بە راستی چەند فەیلەسوفێکی مەزن هەبوون وە هەروەها ژمارەیەکی کەمی فەیلەسوف هەبوون کە لە زۆر رووەوە پەسەندن بەڵام شکستیان هێناوە لەوەی کە ببنە مەزن. بەڵام هەرچەند ئەوەی کە ئەوان بەرهەمیان هێناوە دەبێت گرنگی و بایەخی گەورەیان هەبێت بۆ هەر فەلسەفەیەکی ئەکادیمی، کەچی فەلسەفە پشتیان پێ نابەستێت بەو رادەیەی کە هونەری شێوەکاری بە شێوەکارە مەزنەکان، مۆسیقا بە کۆمپۆزەرە گەورەکان پشت دەبەستێت. سەرەڕای ئەمانەش، فەلسەفەی مەزن بۆ نموونە وەك فەلسەفەی پێش سوکرات- پێشینەترە لە هەموو فەلسەفە ئەکادیمی و پیشەیی‌یەکان.

--3--

بە بۆچوونی من، فەلسەفەی پیشەیی (*Professional Philosophy*) کارێکی زۆر باشی بە ئەنجام نەگەیاندووە وە پێویستی‌یەکی بە پەلەشی بە بەرگری کردن هەیە لە بوونی خۆی. تەنانەت من وا هەست دەکەم کە ئەو راستی‌یەی کە خودی خۆم فەیلەسوفێکی پیشەیم حاڵەتێکی جدی دژی خۆم دروست ئەکات کە وەك تاوانبارکردنێك وایە لەلام. وە پێویستە لە سەرم کە خۆم بە تاوانبار بزانم و وەکو سوکرات داوای لێبوردن بکەم.

من ئاماژە بە ئەپۆلۆژی (*Apology*)یەکەی ئەفلاتۆن ئەکەم چونکە لە کۆی ئەو کارانەی کە دەربارەی فەلسەفە نووسراون من لە هەموویان زیاترم لا پەسەندە. من وایدائەنێم کە ئەو پۆزش خوازی‌یە لە رووی مێژوویی‌یەوە راستە وە ئەوەمان پێ دەڵێت کە سوکرات لە بەردەم دادگای ئەثینادا وتویەتی. من ئەم کارەم خۆش ئەوێت چونکە لێرە پیاوێك قسە ئەکات کە خاکی و بوێرە. وە داوای لێبوردنەکەی سوکرات زۆر ساکارە: ئەو سورە لەسەر بە ئاگابوونی سنورەکانی خۆی‌و ئەزانێ کە نادانایە، وە ئەو رەخنەگرێکە بە تایبەتی لە هەموو زمانە تایبەتە بەرزو دیارەکان، وە هێشتاش هاوڕێی هاونیشتمانی‌یەکانیەتی، وە هاووڵاتی‌یەکی باشە. ئەمە تەنها داوای لێبوردنی سوکرات نیە، بەڵکو بە

تێڕوانینی من، ئەمە ئیعتیزار (*apology*)ێکی کاریگەرە بۆ فەلسەفە.

-4-

بەڵام با ئێمە مەسەلەکە بەلای تۆمەت بارکردنی فەلسەفەدا بشکێنینەوە. زۆرێک لە فەیلەسوفە مەزنەکان، لە نێوانیاندا هەندێك لە هەرە مەزنەکان کارێکی زۆر باشیان ئەنجام نەداوە. من لەمەودوا ئاماژە بە چوار فەیلەسوف لە فەیلەسوفە مەزنەکان ئەکەم -ئەفلاتون، هیۆم، سپینۆزا، و کانت.

ئەفلاتون، کە مەزنترین و قوڵترین و بەهرەدارترین فەیلەسوفە، تێڕوانینێکی هەبوو بۆ ژیانی مرۆڤ کە بەلای منەوە قێزەوەندەو بگرە ترسێنەریشە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو نەك تەنها فەیلەسوفێکی گەورەو دامەزرێنەری قوتابخانەی پیشەیی فەلسەفەیە، بەڵکو شاعیرێکی مەزن و بە توانانیش بووە. وە ئەو سەرەڕای کارە جوانەکانی تری هەستا بە نووسینی (پۆزش)ی سوکرات.

ئەوەی تەگەرەی خستە بەردەم ئەفلاتون و زۆرێك لە فەیلەسوفە پیشەییەکانی دوای ئەو، بریتی بوو لەوەی کە ئەو بە پێچەوانەی سوکراتەوە لە شانشینی فەلسەفەدا باوەڕی بە نوخبە هەبوو. لە کاتێکدا کە سوکرات داوای ئەکرد کە بەڕێوەبەری دەوڵەت ئەبێت دانا بێت واتە ئەبێت بە ئاگا بێت لەوەی کە چەندە کەم ئەزانێت، ئەفلاتون داوای ئەوەی ئەکرد کە ئەبێت فەیلەسوفە فێرکراوەکان حاکمی رەها بن (لەو سەردەمەی ئەفلاتونەوە، مێگالۆمێنیا بووە نەخۆشیەکی بەربڵاوی فەیلەسوفەکان[1].

سەرباری ئەمەش لە کتێبی دەیەمی (یاساکان)دا ئەفلاتون دامەزراوەیەکی داهێنا کە بوە ئیلهام بەخشی ئینکویسەیشن *Inquisition*[2]، وە ئەو نزیك بوو لە بەشیاو زانینی سەریازگەکانی دەستگیرکردن بۆ چارەسەرکردنی رۆحی ئەو کەسانەی کە بیروباوەڕی جیاوازیان هەیە.

داڤید هیۆم، کە فەیلەسوفێکی پیشەیی نەبوو، لە دوای سوکراتەوە ئەو لەوانەیە لە رووی بایەخ و باش هاوسەنگی‌یەوە راستەو رووترین بێت لەناو هەموو فەیلەسوفەکانی تردا. وە ئەو بە تەواوی خاکی و عەقڵانی بوو وە بە شێوەیەکی گونجاو پیاوێکی بێ عاتیفە بوو وە لە ژێر کاریگەری ئاراستەیەکی سایکۆلۆژی بێ بەخت و هەڵەدا بوو کە بریتی بوو لە تیۆری مەعریفە (کە وای فێرکرد کە متمانە بە هێزە سەرنجڕاکێشەکانی عەقڵی خۆی نەکات) وە بوە خاوەنی ئەو رێبازە ترسێنەرەی کە بریتی بوو لەوەی "عەقڵ تەنها کۆیلەی هەستەکانەو وە هەرگیز ناتوانێت لە شێوەی تردا دەربکەوێت جگە لە خزمەت کردن و گوێ رایەڵی کردنی هەستەکان نەبێت".

من ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە هەرگیز هیچ شتێکی مەزن بە بێ سۆز بەدەست نەهێنراوە، بەڵام من باوەڕم تەواو پێچەوانەی دەستەواژەکەی هیۆمە. رام کردنی سۆزەکانمان بە مەعقولیەتێکی سنورداری ئەوەی کە لە تواناماندایە، بە بۆچوونی من بریتی‌یە لە تەنها هیوایەك بۆ مرۆڤایەتی.

سپینۆزا کە باشترینە لە نێوان فەیلەسوفە مەزنەکاندا هاوشێوەی سوکرات و هیۆم بە پیشە فەیلەسوف نەبوو بەڵکو تەواو پێچەوانەی هیۆم دەدوێ، بەڵام من بە شێوەیەکی ئەبینم کە نەك تەنها هەڵەیە بەڵکو لە رووی ئاکار *ethic* یشەوە ناپەسەندە. سپینۆزا دیتێرمنست[3] بوو (بە هەمان شێوەی هیۆم). وە بەلای ئەوەوە سەربەستی مرۆڤ تەنها لە هەبوونی تێگەیشتنێکی روون و جیاوازو تەواوی ئەو رووژانە راستەقینەیەی کە لە کردارەکانمانەوە سەرچاوە ئەگرێت دروست دەبێت: "کاریگەرییەك کە بریتی‌یە لە سۆزێك وە هەر ئایدیایەکی روون و جیاوازمان لێ دروست کرد لە

سۆزی ئەکەوێت". سەرباری ئەمەش، ئەو سۆزە کە ئێمە لە چنگیداین و نائازادین، دوای ئەوەش ئێمە بیرۆکەیەکی ئاشکراو جیاوازمان هەیەو لە هەمان کاتیشدا لە لایەن سۆزەوە سنوردار یان دیاری کراوین، بەڵام ئێمە ئەومان گواستۆتەوە بۆ ناو بەشێکی مێشکمان. کە ئەمەش بە تەنها بریتی‌یە لە ئازادی، ئەمە بەپێی قسەکانی سپینۆزا. من ئەم بۆچوونەی سپینۆزا بە فۆرمێکی نەپارێزراوو ترسناکی عەقڵانیەت لە قەڵەم ئەدەم، ئەمە سەرباری ئەو راستی‌یەی کە من خۆم عەقڵانیم.

جارێ بەر لە هەر شتێك من باوەڕم بە دیتێرمینیزم نی‌یە وە هەروەها لەو باوەڕەدا نیم کە سپینۆزا یان هەر کەسێکی تر لە پاڵپشتی قسەو بەڵگەکانی خۆیدا دەمەتەقێی بەهێزی بەرهەم هێنابێت، یان لە پاڵپشتی کرداری سازشکاری نێوان دیتێرمینیزم و سەربەستی مرۆڤدا هیچی وای بەرهەم هێنابێت. بەلای منەوە دیتێرمینیزمی سپینۆزا بریتی‌یە لە هەڵەیەکی نموونەیی ئەم فەیلەسوفە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بێگومان زۆرێك (نەك هەموو) لەو کردارانەی کە ئێمە دەیکەین دیاری کراو یان تەنانەت پێشبینی کراویشە، ئەمە یەکەم، دووەم، جگە لەمانەش رەنگە تا رادەیەك ئەوە راست بێت کە ئەو (سۆزە)ی سپینۆزا مەبەستیەتی ئەبێتە هۆی ناسەربەستی ئێمە. فۆرمەڵەکەی سپینۆزا کە من ئیقتیباسم کردووە وامان لێ ئەکات کە لێپرسراو نەبین لە بەردەم رەفتارەکانماندا لە کاتێکدا کە ئێمە ناتوانین ئایدیایەکی عەقڵانی و ئاشکراو جیاوازی پاڵنەری کردارو رەفتارەکانمان پێك بهێنین. بەڵام من جەغت ئەکەمەوە کە ئێمە هەرگیز ناتوانین ئەمە بکەین، وە چەندێك ئێمە عەقڵ خواز بین لە کردارو هەڵس و کەوتەکانماندا لەگەڵ هاودروستکراوەکانماندا، بە بۆچوونی من، بریتی‌یە لە هەرە گرنگترین مەبەست (بە دڵنیایی‌یەوە سپینۆزاش بەم شێوەیە بیری کردۆتەوە)؛ وە لەو باوەڕەدا نیم کە ئەوە ئامانجێك بێت کە ئێمە هەرگیز بتوانین بڵێین پێی گەیشتوین.

لە نێوان فەیلەسوفە پیشەگەرەکاندا، کانت یەکێکە لەو فەیلەسوفە پەسەندو بەرز هەڵکەوتوانەی کە هەوڵی دا گرفتەکانی هیۆم سەبارەت بە رەت کردنەوەی عەقڵ و گرفتەکانی سپینۆزا سەبارەت بە دیتێرمینیزم چارەسەر بکات کەچی هێشتا ئەو لەو دوو هەوڵدانەدا شکستی هێنا.

ئەمانە هەندێك بوون لەو فەیلەسوفانەی کە لای من زۆر پەسەندن. تۆش دوایی تێئەگەیت کە بۆچی من هەستێکی پۆزشخوازیانەم هەیە بەرامبەر فەلسەفە.

-5-

من هەرگیز ئەندامێك نەبووم لە بازنەی ڤیەننای پۆزەتیڤیستە لۆژیکی‌یەکانی وەك هاوڕێیانم فریدریش وایزمان، هێربێرت فێیگل و ڤیکتۆر کرافت. لە راستی‌دا ئۆتۆ نیورانت منی بە "نەیارە رەسمی‌یەکە" ناوەزەند کردبوو. من هەرگیز بانگهێشت نەکرابووم بۆ هیچ یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەو بازنەیە، رەنگە ئەمەش بەهۆی ئەو ناو دەرکردنەی من بێت وەك نەیارێکی پۆزەتیڤیزم. (پێم خۆش ئەبوو بانگێشت بکرامایە، نەك تەنها لەبەر ئەوەی کە هەندێ لە ئەندامانی بازنەکە هاوڕێی شەخسیم بوون، بەڵکو دەبووە رێخۆشکەر بۆ ناسینی ئەندامانی تر). لەژێر کاریگەری کتێبەکەی ڤنگشتاین *Tractatus Logico philosophicus*دا، بازنەکە نەك تەنها بووە دژە-میتافیزیك بەڵکو بووە دژە فەلسەفەش. شلیك، کە رابەری بازنەکەیە ئەمەی لە رێگەی ئەو پێشبینی‌کردنەوە گەڵاڵە کرد کە فەلسەفە "کە هەرگیز باش نادوێت و تەنها وشەی بێ مانا ئەدرکێنێ" لە داهاتوویەکی نزیکدا لەناو ئەچێت،

لەبەر ئەوەی فەیلەسوفەکان بۆیان دەرئەکەوێت کە (جەماوەرەکەیان) کە ماندووی قسەو باسی بۆشن، وازیان لێهێناون.

وایزمان بۆ ماوەی چەند سالێك هاوبۆچوون بوو لەگەڵ فگنشتاین و شیلیکدا. من لەو باوەڕەدام کە ئەتوانم لەو پەرۆشی‌یەی‌دا بۆ فەلسەفە پەرۆشی لە باوەڕهەلگەڕاوێك (لادەرێك) بدۆزمەوە.

من هەمیشە بەرگریم لە فەلسەفەو تەنانەت میتافیزیکیش دەکرد لە بەرامبەر بازنەی ڤیەننادا. سەرەڕای ئەم راستی‌یەش پێویست بوو کە من دان بەوەدا بنێم کە فەیلەسوفەکان کارێکی باشیان ئەنجام نەداوە. لەبەرئەوە من لەو باوەڕەدام کە زۆر کەس، لە نێوانیاندا خۆشم، بە پلەی جیاوازی ئالۆزیو جدیەت گرفتی فەلسەفی بنەڕەتیان هەبووە ئەمە لە کاتێکدا کە ئەم گرفتانە هەموویان چارە نەکراو نەبوون.

لە راستی‌دا بوونی کێشەی جدی و هەنوکەیی وە هەروەها پێویستی گفتوگۆکردن لەسەر ئەم گرفتانە بە شێوەیەکی رەخنەیی بریتی‌یە لە تەنها بیانوویەك بۆ ئەوەی کە پێی ئەووترێت فەلسەفەی پیشەیی یان ئەکادیمی.

فگنشتاین و بازنەی ڤیەننا نکوڵیان کرد لە بوونی گرفتی فەلسەفی جدی.

ئەگەر بە پێی کۆتایی کتێبەکەی فگنشتاین بێت، گرفتە دیارو ئاشکراکانی فەلسەفە (تەنانەت خودی گرفتەکانی کتێبەکەش) گرفتی ناڕاستن و لەو قسەکردنەوە سەر هەڵئەدات بەبێ ئەوەی مانای هەر هەموو وشەکان بدرێت. رەنگە ئەم تیۆرە لە لایەن چارەسەری بێبڕتراند راسلەوە بۆ موفارەقە لۆژیکی‌یەکانی وەك پێشنیارە چەوتەکان کە نە راستن و نە هەڵەشن بەڵکو بێ مانان ئیلهامی وەرگرتبێ. ئەمەش بووە هۆی بردنمان بەرەو تەکنیکی کارتێکەری هەموو جۆرەکانی پێشنیاری کێشە خولقێنەر یان گرفتی وەك (بێمانایی) لە فەلسەفەی مۆدێرندا.

بەلام فگنشتاین لە سەردەمێکی تردا و دواتر وا راهاتبوو کە قسە لەسەر ئەو (مەتەڵ)انە بکات کە بەهۆی خراپ بەکارهێنانی فەلسەفیانەی زمانەوە دروست بوو بوون. من تەنها ئەتوانم ئەوەندە بڵێم کە ئەگەر من گرفتی فەلسەفی جدیم نەبێت و هیوای چارەسەرکردنیانم نەبێت، ئەوا هیچ بیانوویەکم نیە بۆ ئەوەی کە فەیلەسوف بم: بە مەزنەی عەقڵی من هیچ بیانوو هێنانەوەیەك نیە بۆ فەلسەفە.

## -6-

لەم بەشەدا من تێڕوانینی دیاری‌کراوی فەلسەفەو ئەو چالاکی‌یە دیاری کراوانەی کە زۆر جار وەك خاسیەتی فەلسەفە سەیر ئەکرێت ریز ئەکەم کە من بۆ خۆم لێیان ناڕازیم. ئەم بەشە ئەتوانرێت ناونیشانی "چۆن من فەلسەفە نابینم"ی بۆ دابنرێت.

1-من فەلسەفە وەك چارەسەرکەری مەتەڵە زمانەوانی‌یەکان نابینم. هەرچەندە نەهێشتنی خراپ لێك گەیشتن زۆر جار ئەرکێکی سەرەتایی و پێویستە.

2-من وا ناڕوانمە فەلسەفە کە بریتی بێت لە زنجیرە کارێکی هونەری، وەك نیگارێکی سەرسوڕهێنەرو بنەڕەتی جیهان یان وەك شێوازێکی زیرەکانەو نائاسایی‌یانەی وەسف کردنی جیهان بێت. من لەو باوەڕەدام ئەگەر ئێمە بەم شێوەیە سەیری فەلسەفە بکەین ئەوا غەدرێکی گەورەمان لە فەیلەسوفە مەزنەکان کردووە. فەیلەسوفە مەزنەکان سەرقاڵ نەبوون بە هەوڵدانە جەمالی‌یەکانەوە و نەیان ویستوە ببنە ئەندازیاری سیستمێکی زیرەکانە بەڵکو ئەوان بەر لە هەر شتێك وەك زانا مەزنەکان وێڵ بوون بە دوای راستی‌دا بە دوای چارەسەری راستەقینەی گرفتە بنەڕەتی‌یەکاندا. نەخێر، من بە شێوەیەکی

بنەڕەتی مێژووی فەلسەفە وەك بەشێك لە مێژووی گەڕان بە دوای ڕاستیدا سەیر ئەکەم. وە من تێڕوانینی جەمالیانەی پەتی فەلسەفە ڕەت ئەکەمەوە ئەمە سەرباری ئەو ڕاستییەی کە جوانی ڕەگەزێکی گرنگە لە فەلسەفەو زانستیشدا.

من زۆر کەیفم بە ئازایەتی هۆشمەندانە دێت. ئێمە ناتوانین ڕووناکبیری ترسنۆك بین و لە هەمان کاتیشدا وێڵ بین بە دوای ڕاستیشدا. گەڕێك و وێل بە دوای ڕاستیدا ئەبێت بوێرێت کە دانا بێت، ئەبێت بوێرێت کە لە بواری فیکردا شۆڕشگێڕ بێت.

3–من مێژووی دوورو درێژی سیستمی فەلسەفی وەك یەکێك لە تەلارە ڕووناکبیرییەکان نابینم کە تیایدا هەموو ئایدیا گونجاوەکان تاقی کرابنەوە، کە تیایدا ڕاستی وەك ڕەگەزێکی چاوەڕوان نەکراو بێتە بەردەممان. من لەو باوەڕەدام ئێمە ناعەدالەتیەك ئەکەین بەرامبەر فەیلەسوفە مەزنەکانی ڕابردوو گەر گومانێکی بچووکمان هەبێت لەوەی کە هەریەکێك لەوان سیستەمەکەی خۆی وەلا ناوە، کاتێك کە گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم وەلانانە هەنگاوێك نیە بەرەو ڕێگەی ڕاستی (هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە من هەریەك لە فیختەو هیگڵ بە فەیلەسوفی ڕاستەقینە دانانێم: من باوەڕم بە پەرۆشی ئەو دوانە نییە بۆ ڕاستی).

4–من فەلسەفە وەك هەوڵدانێك نابینم بۆ ڕوون کردنەوە یان شیکردنەوە یان ئاشکراکردنی مەفهومەکان یان وشەو زمانەکان.

مەفهومەکان یان وشەکان تەنها ئامرازێکن بۆ گەڵاڵەکردنی بابەتی لێکۆڵینەوەو گریمانەو تیۆرەکان. مەفهومەکان یان وشەکان ناتوانن لە خودی خۆیاندا ڕاست بن. ئەوان تەنها خزمەتی زمانی وەصفی و گفتوگۆخوازی مرۆڤ ئەکەن. پێویستە مەبەست و ئامانجی ئێمە شیکارکردنی ماناکان نەبێت، بەڵکو ئەبێت گەڕان بێت بە دوای ڕاستییە گرنگەکاندا، یان ڕوونتر بڵێین گەڕان بێت بە دوای تیۆرە ڕاستییەکاندا.

5–من فەلسەفە وەك ڕێگەیەك نابینم بۆ زیرەك بوون.

6–من فەلسەفە وەك جۆرێك لە چارەسەرکەری ڕووناکبیری یان وەك چالاکی یارمەتیدەری خەڵك لە دەرەوەی شڵەژانی فەلسەفی نابینم. بەلای منەوە فگنشتاین (لە دواهەمین کتێبیدا) ئەوەی پیشان نەدا کە مێش چۆن لە بوتڵێك دێتە دەرەوە. وەك ئەوەی کە من لە مێشوولەکەدا، کە ناتوانێت خۆی لە بوتڵەکە دەرباز بکات، پۆرترێتێکی سەرسوڕهێنەری خودی فگنشتاین ئەبینمەوە (فگنشتاین بریتی بوو لە حاڵەتێکی فگنشتاینیانە هەروەك چۆن فرۆید حاڵەتێکی فرۆیدیانە بوو).

7–من فەلسەفە وەك دیراسەی چۆنێتی دەربڕینی شتەکان بە شێوەیەکی تەواوترو وردتر نابینم. وردیو تەواوێتی لە خودی خۆیاندا بریتی نین لە بەهای فیکری، وە پێویستە ئێمە هەرگیز هەوڵ نەدەین کە وردترو تەواوتر بین زیاتر لەوەی کە گرفتەکەی بەردەستمان داوامان لێ ئەکات.

8–بەم شێوەیە، من فەلسەفە وەك بناغە یان چوارچێوەیەکی مەفهومگەرایانەی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی کە لەوانەیە نزیکتر یان لە داهاتوویەکی دوورتردا سەرهەڵ بدەن نابینم.

جۆن لۆك بەم شێوەیەی کرد؛ ئەو ویستی وتارێك لەسەر ئاکار بنووسێت، ئەو وای بە پێویست زانی کە چەند سەرەتایەکی مەفهومگەرایانە دابین بکات.

وتارەکەی لۆك پێك هاتووە لەم سەرەتایانە، وە فەلسەفەی بەریتانیش (لەگەڵ چەند حاڵەتێکی کەمی جیاواز وەك هەندێك لە وتارە سیاسییەکانی هیوٚم) لەو کاتەوە بە چەقیوی لەناو ئەو سەرەتایانەدا مایەوە.

**9-هەروەها من فەلسەفە وەك دەربڕینێك بۆ** ڕوحی كات نابینم، ئەمە بۆچوونێكی هیگڵیانەیە كە لە بەردەم ڕەخنەدا خۆی ڕاناگرێت. لە فەلسەفەدا پەیڕەو یان مۆدیل هەیە هەروەك چۆن لە زانستیشدا هەیە، بەڵام (وێڵ) و گەڕۆكی ڕەسەن بەدوای ڕاستیدا دوای پەیڕەو ناكەوێت و متمانەشی پێناكات و تەنانەت دژیشی ئەجەنگێت.

-7-

هەموو ژنێك و هەموو پیاوێك فەیلەسوفن. ئەگەر ئەوان بە ئاگا نەبن لە هەبوونی گرفتە فەلسەفییەكان ئەوا هەرچۆنێك بێت ئەوان لایەنگیرییەكیان تیایە بۆ فەلسەفە. زۆرێك لەوانە بریتین لە تیۆر كە بە چاك ئەبانناسن: ئەوان ئەو تیۆرانەیان لە ژینگە فیكرییەكانیانەوە یان لە ترادیسیۆنەوە هەڵهێنجراوە. لەبەرئەوەی كەمێك لەو تیۆرانە بە شێوەیەكی هۆشمەندانە وەرگیراون، كەواتە ڕای پێشینەن لەو ڕوانگەیەوە كە بەبێ تاقیكردنەوەی ڕەخنەیی وەرگیراون، ئەمە سەرباری ئەو ڕاستییەی كە ڕەنگە ئەو تیۆرانە خاوەنی بایەخی زۆربن لە ڕەفتاری كردارەكی خەڵك و هەموو ژیانیشیاندا.

ئەمە ئیعتیزارێكە بۆ بوونی فەلسەفەی پیشەیی كە پێویستە پیاو ڕەخنەییانە ئەم تیۆرە كاریگەرو زۆر بڵاوەبوانە تاقی بكاتەوە.

تیۆری هاوچەشنی ئەمانە بریتییە لە خاڵێكی دەستپێكردنی تەنگژاوی بۆ هەموو زانست و هەموو فەلسەفەش. پێویستە هەموو فەلسەفە لە گومانەوە دەست پێ بكات وە هەندێ جار ئەبێت لە تێڕوانینێكی خراپ كەوتووەوەی عەقڵیەتی باوی ناڕەخنەییەوە دەست پێ بكات: بۆ ئەوەی بگاتە تێڕوانینێك نزیكتر بێت لە ڕاستییەوە و كاریگەری خراپی كەمتر بێت لەسەر ژیانی مرۆڤ.

-8-

با لێرەدا من هەندێك نموونە لەسەر ڕای پێشینەی بەربڵاوی فەلسەفی بخەمە ڕوو.

تێڕوانینێكی فەلسەفیانەی زۆر كاریگەر هەیە بۆ ژیان ئەویش ئەوەیە كاتێك كە شتێك ڕوو ئەدات لەم جیهانەدا وە خراپ و بەدە (یان ئێمە زۆر ڕقمان لێیەتی) ئەوا ئەبێت كەسێك هەبێت كە لێپرسراو بێت لەم كارە، ئەبێت كەسێك هەبێت كە ئەم كارەی بۆ مەبەستێك ئەنجام دابێت.

ئەم تێڕوانینە زۆر كۆنە. لای هۆمیرۆس ئێرەیی و توڕەیی خوداكان هۆی سەرەكی بوون بۆ زۆرێك لەو شتە خراپانەی كە لە مەیدانی پێش تەروادەو خودی پاش تەروادەشدا ڕوویان داوە؛ وە ئەوە (پۆسیدۆن) بووە كە بەرپرس بوو لە گەشتە مەترسیدارەكانی ئۆدیسا. دواتر لە فیكری مەسیحیدا شەیتان ئەبێتە بەرپرسیار بۆ خراپییەكان. لە ماركسیزمی هەرزەشدا ئەوە گەلەكۆمەی سەرمایەدارە چاوچنۆكەكانە كە ڕێگرە لە بەردەم دروست بوونی سۆشیالیزم و دامەزراندنی بەهەشت لەسەر زەویدا.

ئەو تیۆرەی كە پێی وایە كە جەنگ، هەژاری و بێ كاری ئاكامی هەندێ نیازی خراپ و پلانی شوومن بریتییە لە بەشێك لە عەقڵیەتی باو (Common Sense) بەڵام ناڕەخنەییە. من ئەم عەقڵیەتە باوە ناڕەخنەییەم ناو ناوە تیۆری پیلانگێڕی كۆمەڵگە. (ڕەنگە كەسانی تر بە تیۆرەی گەلەكۆمەی جیهان ناوزەندی بكەن). وە ئەمە بە شێوەیەكی بەربڵاو لە شێوەی گەڕان بە دوای تاوانبار كراودا پارێزگاری لێ كراوە و ململانێی سیاسی زیاتری ـستۆتەوە وە ناڵاندنی تۆقێنەری زیاتری دروست كردووە.

یەكێك لە ڕووەكانی تیۆرەی پیلانگێڕی كۆمەڵگە بریتییە لەوەی كە پیلانگێڕی ڕاستەقینەكان هان ئەدات. بەڵام پشكنینی ڕەخنەییانە ئەوە ئەخاتە

روو کە ئەوانەی پەیڕەوی لە گەلەکۆمەکی ئەکەن هەمیشە بە شێوەیەکی زەحمەت مەبەستەکانیان ئەهێننە دی. لینین کە باوەڕی کردبوو بەم تیۆرەدا، خۆی پەیڕەوی لە گەلەکۆمەکی ئەکرد هەروەها مۆسۆلۆنیی و هیتلەریش. بەڵام ئامانجەکانی لینین لە ڕووسیا نەهاتنە دی هەروەها هیچ یەکێك لە ئامانجەکانی هیتلەر و مۆسۆلینیش نە لە ئەڵمانیاو نە لە ئیتالیا نەهاتنە دی.

هەموو ئەمانە بوونە پیلانگێڕ چونکە ئەوان نارەخنەیییانە باوەڕیان بە تیۆری پیلانگێڕیی کۆمەڵگە هەبوو.

ڕەنگە ئەمە دابەش کردنێکی خاکی بێت بەڵام نابێتە دابەشکردنێکی تەواو بێبایەخی فەلسەفە بۆ ڕاکێشانی سەرنج بۆ هەڵەکانی تیۆرەی پیلانگێڕی کۆمەڵگە.

سەرباری ئەمەش ئەمە دابەشکردنی زیاتری لێ ئەکەوێتەوە وەك دۆزینەوەی گرنگی و بایەخی ئاکامی بێ نیازی ڕەفتارەکانی مرۆڤ بۆ کۆمەڵگە وە بۆ ئەو پێشنیارەی کە ئێمە بە ئامانجی زانستە کۆمەڵایەتییە پێوەرییەکانی دادەنێین بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە ئاکامی بێ نیازی ڕەفتارەکانی ئێمە بەرهەم ئەهێنێت.

با گرفتی جەنگ وەك نموونەیەك وەربگرین، تەنانەت فەیلەسوفێکی ڕەخنەیی خاوەن پایەی وەك بیرتراند راسل لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە ئێمە جەنگ لە ڕێگەی پاڵنەرە سایکۆلۆژییەکان و دوژمنخوازی مرۆڤەوە ڕوون بکەینەوە. من نکوڵی لە بوونی دوژمنخوازی ناکەم بەڵام لام سەیرە کە راسل ئەوەی نەبینییەوە کە زۆربەی جەنگەکان لەم سەردەمەدا ئیلهامی خۆی لە (ترس لە دوژمنخوازییەوە) وەرگرتووە. زیاتر لەوەی لە دوژمنخوازی شەخصییەوە وەرگرتبێت. ئەو جەنگانە یان جەنگی ئایدیۆلۆژی بوون کە لە ئەنجامی ترس لەو هێزەی کە پلانی بۆ دادەڕێژێ دروست بووە یان جەنگی نەویستراو بوون لە لایەن هەموانەوە بەڵام وەك ئەنجامی ئەو ترسە ڕوویداوە کە بە هۆی هەڵوێستی بابەتییەوە دروست بووە. بۆ نموونە ترسی دوولایەنە (متبادل)ی دوژمنکاری کە ئەبێتە هۆی پێشبڕکێی خۆ پڕچەك کردن و دواتر جەنگی لێ ئەکەوێتەوەو ڕەنگە بۆ جەنگێکی خۆپارێزی تەنانەت راسل، کە دوژمنێکی جەنگ و دوژمنکاری بوو، ماوەیەك سەرنجی خەڵکی بۆ لای ئەو ترسە ڕائەکێشا کە ڕووسیا بەم زوانە ئەبێتە خاوەنی بۆمبی هایدرۆجینی (هیچ کەسێك بۆمبی نەئەویست، ئەوە ترس بوو کە هیتلەری قۆرغ کردبوو بووە هۆی لەناوبردنیشی).

یان با نموونەی جیاوازی تر لەمەڕ رای پێشینەی فەلسەفی وەربگرین. ڕایەکی پێشینە هەیە ئەویش ئەوەیە کە بیروبۆچوونەکانی مرۆڤێك هەمیشە لە لایەن بەرژەوەندییە خودییەکانیەوە دیاری ئەکرێت. ئەم ڕێبازە (کە ڕەنگە وەك فۆرمی داڕماوی ڕێبازەکەی هیۆم وەسف بکرێت کە ئەڵێت عەقڵ کۆیلەی هەستەکانە) وەك ڕێسایەك نیە کە بەسەر کەسێکدا بسەپێنرێت (ئەمە لە لایەن هیۆمەوە جێبەجێ کرا، هیۆمێك کە فێری خاکی بوون و گومانگەرایی و ڕێزگرتنی تواناکانی عەقڵی دەکردین کەچی خۆی داخڵی ئەم دۆخە بوو). بەڵام ئەمە وەك ڕێسایەك وایە کە تەنها بەسەر کەسانی تردا جێبەجێ بووە کە بیروڕاکانیان لە هی ئێمە جیاوازن. ئەمەش وامان لێئەکات کە بە ئارامییەوە گوێ لەو بیروڕایانە بگرین کە پێچەوانەی بیروڕاکانی خۆمانن. چونکە ئێمە ئەتوانین ئەو بیروڕایانە بەهۆی بەرژەوەندییەکانی کەسانی ترەوە ڕوون بکەینەوە بەڵام ئەمەش گفتوگۆی عەقڵانی مەحاڵ ئەکات و ئەبێتە هۆی بەرەو خراپ بردنی پەیجۆری سروشتیمان لەمەڕ

ئارەزووكردنمان بۆ دۆزینەوەی راستی شتەكان. لە جیاتی پرسیاری گرنگی "راستی چییە دەربارەی ئەم مەسەلەیە؟" پرسیارێكی تر دائەنێت كە كەم بایەخ ترە "ئارەزووی خودی تۆ چییە؟ پاڵنەرە شاراوەكانت چین؟" ئەمە رێگریمان ئەكات لەوەی كە لە خەڵكانی ترەوە فێر ببین كە بیروڕاكانیان جیاوازن لە بیروڕاكانی خۆمان، وە ئەمەش ئەبێتە هۆی دروست بوونی كەلێن لە یەكێتی مرۆڤایەتی‌دا، یەكێتی‌یەك كە لە عەقڵانیەتی باوی ئێمەوە سەرچاوەی گرتووە.

رای پێشینەی فەلسەفی هاوشێوە، كە حاڵی حازر تا رادەیەكی زۆر كاریگەری هەیە بریتیە لەو گریمانەیەی كە گفتوگۆی عەقڵانی تەنها لە نێوان ئەو كەسانەدا بە گونجاو دادەنێت كە لەسەر بنەڕەتەكان كۆكن. ئەم رێبازە زیانبەخشە ئەو مانایە ئەگەیەنێت كە مناقشەی عەقڵانی یان رەخنەیی دەربارەی بنەڕەتەكان كارێكی مەحاڵە وە ئەشبێتە هۆی ئاكامی نەخوازراو وەك ئاكامی ئەو رێبازانەی پێشتر باسكران. ئەم رێبازانە لە لایەن خەڵكانێكی زۆرەوە پەیڕەو ئەكرێت بەڵام سەر بە مەیدانێكی فەلسەفەن كە جێگەی بایەخی زۆرێك لە فەیلەسوفە پیشەگەرەكان بووە: كە ئەو مەیدانەش بریتی‌یە لە تیۆری مەعریفە.

—9—

بە تێڕوانینی من، گرفتەكانی تیۆری مەعریفە بریتی‌یە لە سەنتەریترین بابەت لە فەلسەفەدا جا فەلسەفەی عەقڵیەتی میللی باو بێت یان فەلسەفەی ئەكادیمی بێت. تەنانەت ئەو گرفتانە یەكلایی كەرەوەی تیۆری ئاكاریشن (هەروەك جاك مۆنۆد لەمەوبەر بیری خستینەوە). با ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەكی سادە وەربگرین، گرفتی سەرەكی لێرەدا وەك ناوچەكانی *region* تری فەلسەفە، بریتی‌یە لە ململانێ لە نێوان "گەشبینی ئەبستمۆلۆژی" و "رەشبینی ئەبستمولۆژی"دا. ئایا ئەتوانین مەعریفەمان هەبێت؟ ئایا ئەتوانین چەند بزانین؟ ئەمە لە كاتێكایە كە كەسی رەشبینی ئەبستمۆلۆژی باوەڕی بەو ئەگەرە هەیە كە مرۆڤ توانستی مەعریفی تێدایە، بەڵام كەسی رەشبینی ئەبستمۆلۆژی باوەڕی وایە كە مەعریفەی پەتی و سەرەكی لە پشت هێزو توانای مرۆڤەوەیە.

من یەكێكم لەوانەی كەیفم بە عەقڵیەتی باو دێت، بەڵام هەر هەمووشی ناڵێم. من پێم وایە كە عەقڵیەتی باو بریتی‌یە لە تەنها خاڵی دەستپێكردنی گونجاوی ئێمە. بەڵام پێویست ناكات كە هەوڵ بدەین تەلارێكی گومانی لەسەر دروست بكەین، بەڵكو ئەبێت تا رادەیەك رەخنەی لێ بگرین و گەشەی پێ بدەین. بەم شێوەیە من ریالیستێكی عەقڵیەتی باوم، واتە باوەڕم بە ریالیستیەتی مەسەلەكە هەیە (مەسەلەیەك كە لەو باوەڕەدام كە گونجاوترین مانایە كە وشەی "واقع *real*" ئاماژەی بۆ بكات). بۆیە هەر لەبەر ئەم هۆیەش من خۆم ناونەنێم ماتەریالیست ئەمەش لەبەر ئەو هۆیە نا كە ئەم زاراوەیە مەبەستی ئەو رێبازە بێت كە

أ—مادده وەك رەگەزێكی بنەڕەتی و لەبن نەهاتوو وەردەگرێت.

ب—نكوڵی لە راستێتی هێزە نامادی‌یەكان ئەكات كە بێگومان هێزی عەقڵ و هۆشیاری هەر شتێكی تری نامادی ئەگرێتەوە.

من پەیڕەوی لە عەقڵیەتی باو ئەكەم لەوەدا كە تیایدا هەردوو مادده (جیهان 1) وە عەقڵ (جیهان 2) پێكەوە بوونیان هەیە وە من وای بۆ ئەچم كە شتی تریشی تیایە بە تایبەت بەرهەمەكانی عەقڵی مرۆڤ كە گریمانە تیۆری و زانستی‌یەكانیشی لە خۆگرتووە (جیهانی 3). بە دەربڕینێكی تر من پلورالیستێكی عەقڵیەتی باوم وە من زۆر ئامادەم بۆ ئەوەی كە ئەم

پێگەیەم هەبێت و لە لایەن پێگەیەکی ترەوە ڕەخنەم لیٚ بگیرێت و جێگەم بگیرێتەوە. بەلاّم هەموو ئەو دەمەتەقێیانەی کە دژی ئەون و لای من زانراون، بە بۆچوونی من بۆشن. (بەم بۆنەیەشەوە من لێرەدا پلورالیزم وەك ئەو پلورالیزمە سەیر ئەکەم کە بۆ زانستی ئاکار پێویستە).

هەموو ئەو جیدالانەی کە لە دژی ریالیزمی پلورالیستی پەیڕەوکراون، لە قبولّ کردنی ناڕەخنەیی تیۆری مەعریفەی عەقلّیەتی باوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە من بە لاوازترین بەشی عەقلّیەتی باوی دائەنێم.

تیۆری مەعریفەی عەقلّیەتی باو بە شێوەیەکی وا بەرز گەشبینە کە مەعریفە بە مەعریفەیەکی دیاری کراو هاوسەنگ ئەکات؛ وە لەو باوەڕەشدایە کە هەموو شتێکی گریمانەیی لە ڕاستیدا بریتی نییە لە "مەعریفە"، من ئەم جدالە وەك تەنها جدالێکی زارەکی لاتەریك ئەکەم. من بە ئامادەباشییەوە دان ئەنێم بەوەدا کە زاراوەی "مەعریفە" لە هەموو ئەو زمانانەی کە من ئاشنام پێیان هەلگری زیاد لە مانایەکی دلّنیایین. بەلاّم زانست لە گریمانە پێك دێت. وە بەرنامەی عەقلّیەتی باو بۆ دەستپێکردن لەوەوەی کە دەرئەکەوێت کە ببێتە مەعریفەیەکی زیاتر دلّنیاو بنەڕەتی لە بەردەستدایە بۆ ئەوەی کە لەسەر ئەم بناغەو دامەزراندنانەوە تەلارێك لە گومان دروست بکرێت کە لە بەردەم ڕەخنەدا خۆی ڕاناگرێت.

بەم شێوەیە ئەمەش ڕیٚ خۆش ئەکات بۆ سەرهەلّدانی دوو تێڕوانینی جیاواز لە تێڕوانینی عەقلّیەتی باو بۆ ڕاستی یان واقیع کە لە پێچەوانەییەکی ڕاستەوخۆدا ڕووبەڕووی یەك ئەبنەوە.

1-نا ماتەریالیزم (بارکلی، هیۆم، ماخ).

2-ماتەریالیزمی ڕەفتاری (وەیستن، سکینەر).

گروپی یەکەم نکوڵی لە ڕاستێتی ماددە ئەکات چونکە تەنها سەرچاوەیەکی ڕاست و دلّنیای مەعریفەی ئێمە پێك هاتووە لە ئەزموونی هەستەوەری خۆمان وە ئەمانەش هەتا هەتایە بە نامادددەیی ئەمێننەوە.

گروپی دووەم نکوڵی لە بوونی عەقلّ ئەکات (وە لێرەشەوە لە سەربەستی مرۆڤ). چونکە لە ڕاستیدا هەموو ئەوەی کە ئێمە ئەتوانین لە ڕەفتاری مرۆڤدا تێبینی بکەین کە لە زۆر شێوازدا وەك ڕەفتاری ئاژەلّ وایە (جگە لەوەی کە بەشداری ئەکات لە پێك هێنانی کێلگەیەکی فراوان و گرنگدا کە بریتییە لە ڕەفتاری زمانەوانی).

هەریەك لەم دوو تیۆرە لە تیۆرەی مەعریفەی ناراستی عەقلّیەتی باوەوە سەرچاوەیان گرتووە کە ئەبێتە هۆی کەوتنەوەی ڕەخنەیەکی تراسیسیۆنی و ناراستی تیۆری عەقلّیەتی باو بۆ واقیع. هیچ یەکێك لەم دوو تیۆرە لە ڕووی ئاکارییەوە بیٚ لایەن نین بەلکو کاریگەری خراپیان هەیە: ئەگەر من بمەوێت منالّێکی گریاو ئاسودە بکەم، ئەوا من ناخوازم کە هەندێ هەستی بێزارکەری خۆم یان تۆ بوەستێنم، هەروەها ناخوازم کە ڕەفتاری منالّەکە بگۆڕم، یان هاتنە خوارەوەی دلّۆپی فرمێسك لەسەر ڕوومەتەکانیەوە بوەستێنم. نەخێر، پالّنەرەکانی من جیاوازن -نادیارن، دانەتاشراون بەلاّم مرۆڤانەن.

نامادددەگەرایی (کە قەرزاری ئەسلّەکەی خۆیەتی بۆ سووربوونی دیکارت- بێگومان دیکارت ناماتەریالیست بوو- لەسەر ئەوەی کە پێویستە ئێمە لە سەرچاوە ناگوماناویەکانی وەك هەبوونی مەعریفەی خۆمانەوە دەست پیٚ بکەین. ئیتر ئەم نامادددەگەراییە لەسەر دەستی ئارنست ماخ لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گەیشتە بەرزترین لوتکەی خۆی، بەلاّم ئێستا بڕێکی زۆر لە کاریگەری خۆی لە دەست داوەو چیتر ئەو باوەی نەماوە. حالّی حازر

ڕەفتارگەرایی -نکوڵی کردن لە بوونی عەقڵ- زۆر بڕەوی هەیە. هەرچەندە ڕەفتارگەرایی تێبینی کردن بەرز دەنرخێنێت، کەچی نەك هەر بە پێچەوانەی هەموو ئەزموون و خیبرەی مرۆڤەوە بەدەردەکەوێت بەڵکو هەوڵیش دەدات کە لە تیۆرەکانی خۆیەوە تیۆرێکی ئاکاریی ترسێنەر دابتاشێت کە بریتییە لە تیۆری (پابەندبوون). ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هیچ تیۆرێکی ئاکاری ناتوانرێت لە سروشتی مرۆڤەوە دابتاشرێت (جاك مۆنۆد بە شێوەیەکی دروست جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردۆتەوە، هەروەها بڕوانە کتێبەکەی خۆم: کۆمەڵگەی کراوەو دوژمنەکانی).

ئەبێت ئەو بە ئاوات بخوازرێت کە ئەم مۆدیلە کە لە قبوڵ کردنی نارەخنەیی تیۆری مەعریفەی عەقڵیەتی باوەوە سەرچاوەی گرتووەو من هەوڵم دا بیناسێنم، ڕۆژێك دادێت کە کاریگەری خۆی لەدەست ئەدات.

—10—

بە بۆچوونی من هەرگیز نەبوەو ناشبێت فەلسەفە لە زانست جیابکرێتەوە. وە ئەگەر لە ڕووی مێژوویشەوە سەیری بکەین ئەوا هەموو زانستی ڕۆژئاوا بریتییە لە زادەی تێڕامانی فەلسەفیانەی گریکەکان لە کەون و ڕێکخستنی جیهان. باپیرە گەورەی هەموو زاناو فەیلەسوفەکان بریتییە لە هۆمیرۆس و هیزیۆدو ئەوانەی پێش سوکرات. ئەرکی بنەڕەتی بەلای ئەوانەوە بریتییە لە لێکدانەوەی سترەکتوری کەون و شوێنی ئێمە لەم کەونەدا، ئەمە سەرباری گرفتی مەعریفەی ئێمە دەربارەی کەون (گرفتێك کە بە بۆچوونی من بە چارەنووسسازی ئەمێنێتەوە لە ڕەوتی فەلسەفەدا).

وە ئەوە لێکدانەوەی ڕەخنەییە بۆ زانستەکان و دۆزینەوەی زانستەکان و شێوازی زانستەکان کە وەك خاسیەتێکی لێکدانەوەی فەلسەفی ئەمێنێتەوە تەنانەت پاش ئەوەی کە زانستەکانیشی لێ دابڕێنرا. پرەنسیپە ماتماتیکییەکانی نیوتن بۆ فەلسەفەی سروشتی، بە بۆچوونی من، ئاماژەیە بە گەورەترین ڕووداو، گەورەترین شۆڕشی فیکری لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئەو شۆڕشە ئاماژەیە بە خەونێك کە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ وە ئاماژەیە بۆ پێگەیشتنی زانست و دابڕانی لە فەلسەفە.

بەڵام خودی نیوتن، وەك هەموو زانا مەزنەکان، بە فەیلەسوفی مایەوە، وە بە تۆزەرو بە گومان لە تیۆرەکانی خۆی مایەوە. بەم شێوەیە ئەو لە نامەیەکدا *25-2-1963* بۆ بێنتلی، دەربارەی تیۆرەکەی خۆی بەم شێوەیەی نووسیوە (نووسینە لارەکە هی منە):

ئەو هێزی کێش کردنە پێویستە خۆڕسك و بنەڕەتی بێت بۆ ماددە، *لەبەر ئەوە تەنێك کارئەکاتە سەر تەنێکی تر لە مەودایەکەوە..* بەلای منەوە هێندە بێ عەقڵیەکی گەورەیە کە لەو باوەڕەدام هەر کەسێك کە لە مەسائلە فەلسەفییەکاندا توانای بەشداربوونی هەبێت هەرگیز ناتوانێت داخڵی ئەمە بێت.

ئەوە تیۆرەکەی خۆی بوو دەربارەی کردار لە مەودایەکەوە کە ئەوی بەلای گومانگەرایی و سۆفیگەریدا ڕاکێشا، نیوتن ئەوەی سەلماند کە ئەگەر هەموو هەرێمە دوورەکانی بۆشایی بتوانن دەستبەجێ کار لە یەکتری بکەن، ئەوا ئەم کارە ئەبێت بە پێی ئامادەبوونێکی بەردەوا[م] بێت لە هەمان کاتی یەکەمدا وە لە هەمان بوونی هەموو هەرێمەکاندا- بۆ ئامادەبوونی بەردەوامی خودا. ئا بەم شێوەیە هەوڵدان بۆ چارەسارکرد[ن]ی ئەم گرفتەی چالاکی لە مەودایەکەوە (یان کردار لە [م]ەود[ا]کەوە -و-) وای لە نیوتن کرد کە تیۆرە س[ۆف]یگەریانەکەی خۆی دابنێت کە بەپێی ئەو تیۆرەیە بۆشایی (فەزا) بریتییە لە دەماغی خودا. وە لە[م] تیۆرەدا نیوتن

زانستی بەرز نرخاندو فەلسەفەی رەخنەیی و خەملاندنی لەگەڵ ئاینی خەملاندنی (تخمینی) پێکەوە گرێ دا، ئێمە ئەزانین کە ئەنشتاین بە هەمان شێوە کارتێکراو بوو.

—11—

من دانی پیائەنێم کە لە فەلسەفەدا هەندێ گرفتی ئاڵۆزو لەگەڵ ئەوەشدا زۆر گرنگ هەیە کە خاوەنی جێگەی سروشتی خۆیانن کە لە راستیدا تەنها جێگایەکە لە فەلسەفەی ئەکادیمیدا، بۆ نموونە گرفتەکانی ماتماتیکی لۆژیکی یان گشتی تر بڵێین فەلسەفەی ماتماتیکی. من بە شێوەیەکی زۆر گەورە کارم تێکراوە لە لایەن ئەو گەشەکردنە سەرسوڕهێنەرەی کە لەم بوارانەدا روویان داوە لەم سەدەیەماندا.

بەڵام تا ئەو رادەیەی کە فەلسەفەی گشتی لەبەرچاو بگیرێت، من دوودڵم بەهۆی کاریگەری ئەوەی کە بارکلی بەکاری هێناوەو ناوی لێ ناوە "فەیلەسوفی شتە بچووکەکان". ئەبێت لەوەش دڵنیا بین کە رەخنە بریتییە لە بزوێنەری فەلسەفە. وە هێشتا پێویستە کە خۆمان لە دابەش کردنە بچووکەکان دوربخەینەوە. رەخنەیەکی ورد بۆ خاڵە وردەکان (بچوکەکان) بە بێ تێگەیشتن لە گرفتە گەورەکانی کۆسمۆلۆژیا، مەعریفەی مرۆڤ، گرفتی ئاکار یان فەلسەفەی سیاسی، هەروەها بەبێ هەوڵدانێکی جدی و لێبڕاوانە بۆ چارەسەرکردنیان بەلای منەوە کارێکی کوشندەیە. ئەم مەسەلەیە زۆر جار وەك ئەوە دەرئەکەوێت کە هەر پاسجێکی چاپ کراو کە رەنگە بە هەندێ زەحمەتەوە خراپ تێگەیشتوو یان خراپ لێکدراوە بێت بەس بێت بۆ بەهانەی نووسینی لاپەڕەیەکی رەخنەی فەلسەفی تر. سکۆلاستیسیزم[4]، بە خراپترین مانای ئەم زاراوەیە، پڕیەتی لە هەموو ئەو ئایدیا مەزنانەی کە لە لافاوی وشەکاندا نقوم بوون.

لە هەمان کاتدا خۆ بەزل زانینێکی دیاری کراوداو دواتر دەگمەنی لە ئەدەبی فەلسەفیدا، وا دەرئەکەوێت کە لە لایەن سەرنووسەری زۆرێك لە رۆژنامەکانەوە وەك سەلماندنێك بۆ ئازایەتی فیکرو رەسەنایەتی قبوڵ کرابێت.

من لەوە باوەڕەدام کە ئەرکی هەموو رۆشنبیرێکە کە بە ئاگا بێت لەو پێگە شەرەفمەندانەیەی کە تیایەتی. رۆشنبیر ئەرکێکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئەوەندەی لە توانایدایە بە روونی و سادەیی بنووسێت هەروەها بە شێوەیەکی شارستانیانە بنووسێت و ناشبێت هیچ یەکێك لەو گرفتە مەزنانەی کە ئابلۆقەی مرۆڤایەتی ئەدەن وە ئەو گرفتانەی فیکری نوێ کە ئارامی و ئازایەتی ئەخوازێت، لە بیر بکات و ئەبێ بەو روحیەتە خاکییەی سوکرات کاربکات کە ئەڵێ مرۆڤ زۆر کەم ئەزانێت. لە بەرامبەر فەیلەسوفی شتە بچوکەکان و گرفتە بچوکەکانیدا، لەو باوەڕەدام کە ئەرکی سەرەکی فەلسەفە بریتییە لەوەی کە بە شێوەیەکی رەخنەیی دەربارەی کەون و شوێنی ئێمە لە کەونداو هێزو توانستی ئێمە بۆ زانین و توانای ئێمە بۆ چاکەو خراپە بخەملێنێت.

—12—

من لەوانەیە بە کەمێك لە فەلسەفەی ئائەکادیمی کۆتایی بەم باسە بهێنم.

یەکێك لەو گەشتیارە ئاسمانیانەی کە بەشداربوو لە یەکەم چوونە سەرمانگدا، بە تێبینییەکی سادەو دانایانەی کاتی گەڕانەوەیان بۆ زەوی لەوانی تر جیاکرایەوە کە وتبووی: "من لە ژیانمدا هەندێك هەسارەم بینی، بەڵام بۆ هەتایە زەوی بە من ببەخشە". من لەو باوەڕەدام کە ئەم وتەیە نەك تەنها

دانایییە بەڵکو دانایییەکی فەلسەفییە. ئێمە نازانین کە بۆچی ئێمە زیندووین لەسەر ئەم ئەستێرە بچووکە سەرسوڕهێنەرە. یان بۆچی ئەبێت شتێکی وەکو ژیان هەبێت کە هەسارەکەمان وەها جوان بکات. بەڵام ئێمە لێرەین و هەموو بیانوویەکمان هەیە کە لە زەوی رابمێنین و هەستی مەزنمان هەبێت بەرامبەری تا ئەو رادەیەی کە نزیك بێت لەوەی کە ببێتە موعجیزەیەك. چونکە هەموو ئەوەی کە زانست ئەتوانێت پێمان بڵێت کە کەون تەقریبەن خاڵییە لە ماددە وە لە هەر شوێنێك ماددە هەبێت ئەوا تەقریبەن لە حاڵەتی شڵەژان و ناجێگیریدایە. لەوانەیە زۆر هەسارەی تر هەبن کە ژیانیان لەسەر بێت، بەڵام هێشتا ئەگەر ئێمە کوێرانە شوێنێك لەم کەونەدا هەڵبژێرین ئەوا دواتر شیمانەی دۆزینەوەی تەنێك کە ژیانی لەسەر بێت یان ژیانی تیابێت یەکسان ئەبێت بە سفر یان نزیك ئەبێت لە سفرەوە. کەواتە ژیان بەهەر شێوەیەك بێت بەهاکەی وەك بەهای شتێکی دەگمەن وایە، ژیان بە نرخە. وە ئێمەش بەو ئاراستەیەدا براوین کە ئەم راستییە لەبیر بکەین و بێ نرخانە مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکەین، ئەمەش لەوانەیە بەهۆی بێ فیکری یان بەهۆی ئەو زەوییە جوانەی خۆمانەوە بێت کە کەمێك قەرەباڵغ کراوە.

هەموو کەسێك فەیلەسوفە، چونکە بە شێوەیەك یان زیاتر هەر کەسەو رێچکەیەك ئەگرێتە بەر بەرەو ژیان و مردن. وە کەسانێکیش هەن وا بیر ئەکەنەوە کە ژیان بێ نرخە چونکە هەر کۆتایی دێت. ئەوانە شکست ئەهێنن لە بەرامبەر ئەو بۆچوونە پێچەوانەیەی کە ئەڵێ: ئەگەر ژیان کۆتایی نەبوایە، ئەوا ژیان هیچ بەهایەکی نەدەبوو؛ وە ئەوە مەترسی هەمیشە ئامادەی لە دەستدانی ژیانە کە بەهاو نرخی ژیانمان بۆ ئەگەڕێنێتەوە.

### تێبینییەکانی وەرگێڕ:

*1-ئەو حاڵەتەیە کە کەسێك تێڕوانینێکی زیادەڕەوانەی هەیە دەربارەی نرخ و بایەخ و توانای خۆی.*

*2-ئینکویسیشن **Inquisition**: رێکخراوێك بوو کە لە لایەن کەنیسەی رۆمانی کاسولیکەوە دەستنیشان کرابوو بۆ سەرکوت کردنی ئەو کەسانەی کە دژی باوەڕو بۆچوونەکانی کەنیسە ئەوەستانەوە.*

*3-دیتێرمینیزم **Determinism**: فەلسەفەیەکە کە پێی وایە کەسێك ئازاد نییە لە هەڵبژاردنی جۆری ئەو کەسەی کە ئەیەوێت خۆی تیا ببینێتەوە یان بەو شێوەیەی کە ئەیەوێت رەفتار بکات چونکە شتەکان لە لایەن زەمینە، ژینگە.. هتد بڕیار دەدرێت. بەعەرەبی پێی ئەڵێن (الجبرية)*

*4-سکۆلاستیسیزم **Scholastisism**: سیستەمێکی فەلسەفییە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە زانکۆکاندا پەیڕەو کراوە. ئەم سیستەمە لەسەر پرەنسیپە ئایینییەکان وەستاوە.*

# ئیسلام لەمێژوودا*

■ محەمەد ئەرکۆن

● و. لە .عەرەبییەوە: ئارام جەمال سابیر

﴿ وعدالله الذين امنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم بعد خوفهم أمناً يعبدونني لايشركون بي شيئاً ومن كفر بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون ﴾

"القران، سورة النور، اية 55"

سەرەتا ئەم ناونیشانە (ئیسلام لەمێژوودا) ئەو نمایشە سەرەتیە زۆر سادەو ساکارەمان دێنێتەوە یاد کەژمارەیەکی زۆر لەنووسەرە موسوڵمانو ڕۆژهەڵاتناسەکان هەردەم دووبارەی دەکەنەوە. واتە ئەوان شوێن ڕێچکەی زەمەنی ڕووداوەکان دەکەونو لەدابەزینی وەحییەوە بۆ محەممەد لەمەککە ساڵی (610-612ز) تا پێشهاتەکانی ئەو پەشێویو ڕووداوە توندوتیژئامێزانەی کەجیهانی ئیسلامی هاوچەرخ بەخۆیەوە دەیبینێ. بەمجۆرە دەکەونە وەسفکردنی چواردە سەدەی مێژوو تیایدا تەنها بایەخ لەسەر کەسایەتی ئایینیو ڕۆشنبیریو سیاسی گەورەکانو هەندێ لەساتەوەختە یەکلاکەرەوەکانی ڕەوتی قەدەرییانەی بەکۆمەڵی ئۆمەتی (ئیسلام) چڕدەکەنەوە. هەروەها پلەبەپلە دەربارەی سەرەتاکانی ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامی (610-632ز)و خەلافەتی مەدینە (632-661ز)و، هەردوو سولالەی گەورەی ئەمەویو عەباسی (661-750ز) (750-1258ز) قسەوباس دەکەن، پاشان لەڕووی زەمەنییەوە بەردەوامدەبن تا دەگەنە سەر کردەی دابەشبوونو پەرشوبڵاوبوونەوەی سیاسیو دامرکاندنەوەی فەرهەنگیانەی ئیمپراتۆرەکەیان، (بەمانایەکی تر) مەملەکەتە کلاسیکیەکەی نێوان هەردوو سەدەی سیازدەهەمو نۆزدەهەم. ئەمە سەرەڕای ئەو ڕابوونە ڕێژەییەی کەعوسمانیەکان لەنێوان سەدەکانی پانزەو حەڤدەدا دابینیانکرد. دوای ئەوە دەگەینە قۆناغی کۆلۆنیالیزم (1800-1950ز)و لەکۆتاییشدا دەگەینە جەنگەکانی ڕزگاربوون کە لەم دواییانەدا بەرپابوونو هێشتا بەردەوامیشن.

دڵنیام لەوەی کەئەم وەسفە وەستاوو جامبووەی ڕووداوەکان لەیەك کاتدا سیاسەتمەدارو لێکۆڵەرەوەی زانستیش بێمیوا دەکات. چونکە هەردووکیان حەز بەوە دەکەن زانیارگەلێکی نوێو ڕاڤەگەلێکی زانستیانەی وردیان لەبارەی شتەکانەوە چنگ بکەوێت. لەڕاستیدا بەئاکامگەیشتنی دوو ئامانجی لەمجۆرە پێکەوە کارێکی زەحمەتە. چونکە ئەوەی ئێمە زۆرجار لەبارەی ئیسلامەوە دەیبینین یان ئەوەتا چەند توێژینەوەیەکی ئەکادیمییانەی بەرفرەو باوەڕپێکراوی دوور لەدامێنانو کرانەوەی تیۆرییە، یان چەند تیۆریزەیەکی بەپەلەو سەرپێیانەی گشییەو زادەی ڕاڤەگەلێکی کاڵوکرچە لەبارەی ئیسلامەوە[1]. بەو پێیەی بە هۆشیارییەکی زۆرەوە ئاگاداری ئەم دوو کەلێنەم، هەوڵی بەئەنجامگەیاندنی دوو کردەی لێکدراو دەدەم، واتە لێکۆڵینەوەکە بەرەو تێڕامان لە پێگەی ئیسلام لەمێژوودا و دیاریکردنی ئەو شوێنەوارانەی کەمێژوو بەسەر ئیسلامەوە جێیهێشتووە ئاراستەدەکەم. لەهەمان کاتدا دەخوازم تێڕوانیی خۆبەگەورەزانینو نەرسیسی موسوڵمانەکان ببەزێنم کەکۆی مێژوو دەخاتە ژێر ڕکێفی وەحیو دەستێوەردانی یەزدان لە مێژوودا: واتە مێژوو ملکەچی ئەو یاسا ئایینیو شەریعەتە دەکات کەهەر لەخودی قورئان خۆیەوە هەڵچنراوەو سەرچاوەی گرتووە. ئەمەیە مانای ئەو ئایەتەی کەلەسەرەتای ئەم توێژینەوەیەمدا دامناوە. هەروەها لەلایەکی ترەوە دەخوازم تێڕوانینی پەرتو دەرەکی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەش ببەزێنم کەئەوانیش بەچەشنی موسوڵمانەکان جارێك نغرۆی خۆبەزلزانینو نەرسیسەت بوونو جارێکی تریش ئیسلام تەنها لەچەند ڕووداوو بەسەرهاتێکی فەرهەنگیو ژیاریدا کورتدەکەنەوە.

بەم شێوەیە لەبری ئەوەی لەدەسپێکی سەرەتا زەمەنییەکانی ئیسلامەوە دەست پێبکەینو شوێنو ڕەوتی ڕووداوە بژارکراوەکان بکەوین هەتا ڕۆژی ئەمڕۆمان، سەرەتا بایەخ دەدەم بەو بابەتانەی کەئامادەییەکی بەردەوامیان لەگوتاری ئیسلامی هاوچەرخدا هەیەو زۆر دووبارە دەبنەوە، لەڕێگایەوە دەبینین کەچۆن ئەو بابەتانە بەشێوەیەکی پێویستو بەپێی شێوازێکی دیاریکراوی مەعریفەی ئەفسانەیی دەمانبات بەرەو ئەو قۆناغانەی کەزۆرترین دەلالەتمان دەداتێ لەمەڕ تێهەڵکێشبوونی ئیسلامو مێژوو بەیەکتری. پاشان پێنج بابەتی مەزن کەیەك بەدوای یەکدا دەیانپشکنین: گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ، قۆناغی کرانەوە یان دامەزراندن، دیاردەی ئیسلامگەریی، ئەزموونی مرۆڤدۆستی (هیومانیزم)، ئایینو کۆمەڵگە لەنێوان سەدەی پێنجەمو پازدەی کۆچیدا (واتە لەنێوان سەدەی یازدەو بیستەمی زایینیدا).

## گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ

مێژووی سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەو تەنینەوەی ئەوەی پێی دەڵێم گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ تەنها دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی *1970*. بەمردنی جەمال عەبدولناسر ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی بەخێرایی جێگەی ئایدۆلۆژیای ناسیونالیستی عەرەبی گرتەوە وەك بابەتێکی بزوێنەر بۆ هەموو ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی کەزۆر ئەکتیڤو چالاك بوون. ئایدیۆلۆژیای ناسیونالیستی عەرەبی ئەگەرچی لەگەڵ ناسریەتدا پەرەیسەندو سەرکەوتنی سیاسیانەی کاریگەری بەدەستهێنا بەڵام تەمەنی کورت خایەن بوو زۆر بەزوویی لەناوچوو.

قۆناغی جۆشسەندنی هۆشیاری ناسیۆنالیستی عەرەبی هاوکات بوو لەگەڵ هەریەك لەقۆناغی ڕزگاربوونی سیاسیانەی مەغریبی گەورە (مەغریبی بچووكو تونس لەساڵی *1956*و جەزائیر لەساڵی *1962*دا)و خۆماڵیکردنی کەناڵی سویس (*1956*)و

راگەیاندنی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لەنێوان سووریاو میسردا (*1958*)و دروستکردنی بەنداوی ئەسوان عالی (*1964*). شەڕی حوزەیرانی سالّی (*1967*) بووە مایەی داڕمانێکی سەختی هەموو ئەو هیواو ئومێدانەی کە گوتاری شۆڕشی عەرەبی پانزە سالّ بوو خەوی پێدەدەبینیو خستبوویەڕوو. ئەو شکستە ھەتا بڵێی تاڵو تووش بوو بەتایبەتی لەوەدا کەڕژێمەکان وەهمی نزیکبوونەوەی سەرکەوتنیان بەگوێی میللەتدا دابوو. ئەو شکستە لەیەك کاتدا ئاستی ئەفسانەبوونی گوتاری شۆڕشی عەرەبیو رادەی فشارو کاریگەری رەوشە سیاسیو ئابورییەکەی دەرخست. جەزائیری سەردەمی بۆمدین لەگەڵ لیبیادا کەوتە کێبەرکێوە لەسەر ئەوەی ببێتە جێگرەوەی بزاوتی ناسری. بەوجۆرە جەزائیر تاسالّی (*1975*) سەرکەوتنی لەبەخشینی راستگۆیی بەشۆڕشی سۆشیالیستی عەرەبیو ئیسلامی بەدەستهێنا، بەلاّم هاوکات زەمینەشی رەخساند بۆ گەشەکردنو بەهێزبوونی ئیسلامی ئسوڵی، ئەویش لەپێناو گەڕاندنەوەی بەها ئیسلامیەکان بۆ گەلی جەزائیر[2]. هەرچی بەعسە بەردەوامبوو لەسەر مۆرکی عەرەبیانەی گەلو جۆشدانی هەستو سۆزیان، بەلاّم ئەویش دووبارە خۆی لەبەردەم فشاری روولەزیادی بزاڤە ئیسلامییەکانو دروشمو داخوازییەکانیاندا بینیەوە.

لەپشت جیهانی عەرەبییەوە، ئەوە دەبینین کەبڵاوبوونەوەی گوتاری ئیسلامی هاوشانە لەگەڵ فراوانبوونو گوشاری قەوارەی دیموگرافیو سیاسیو پێداویستیە ئابورییە قەبەکان لە هەر ولاّتێکدا[3]. بەملیۆنان موسوڵمان لەهەریەك لەئەندەنوسیاو هیندو بەنگلادیشو پاکستانو تورکیادا ئیسلام وەك پەناگەو چاوگێکی خۆیان دەبیننەوە. بەلاّم ئەوەی گومانی نەهێشتووە؛ سەرکەوتنی خومەینی لەئێراندا بووە مایەی بڵاوبوونەوەی بابەتە ئایینییەکانو بنجکوتانیان بەجۆرێك وایلێکردن جێگە بەباڵە عەلمانیەکانی ناو شۆڕشی عەرەبیو سوشیالیستی چۆڵ بکەن.

لێرەدا ناگەڕێمەوە سەر هۆکارە نزیكو دوورەکانی ئەو پەرەسەندنە مێژووییە گرنگە (یان ئەو رووداوە مێژووییە گرنگە)[4]. بەڵکو تەنها قسە لەسەر سیاسەتیان فارسییە عەلمانیەکەی شای ئێران دەکەم، لەگەڵ ئەو هاوپشتییە روونو ئاشکرایەی کەئەم سیاسەتە هەیبوو لەگەڵ ستراتیژیاتی هەیمەنەی رۆژئاواییدا کەبوونە هۆی لێکترازانێکی تەواوی نێوان دەوڵەتو بۆرژوازیەتی بازرگانی لەلایەكو میللەتو چینەکانی ناوەڕاست لەلایەکی ترەوە.

ئەو تەوەرو گریمانەو بابەتانە چین کەگوتاری ئیسلامی هاوچەرخ پێکدێنن؟ پێش ئەوەی بەوردی دیارییان بکەین پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کەئەو گوتارە لەناو هەموو زمانە ئیسلامیەکاندا ئامادەیەو بوونی هەیە. هەر لەفیلیپینەوە بیگرە تا دەگاتە مەغریب، هەر لەکرێکارە کۆچکردووەکانی ئەورووپاوە تا موسوڵمانە رەشپێستەکانی ئەمریکا، لەهاولاّتیانی سۆڤێتو یۆگۆسلاڤیاوە تادەگاتە گەلانی ئەفریقیای رەش پێست، هەرهەموویان هەمان هیواو ئاواتیان هەیە لەگەڵ هەمان ناڕەوایەتی جۆراوجۆرو هەمان یەقینو داخوازی. ئەم گوتارە کە لەڕووی رووبەرو پانتاییەوە فراوانە، بەهەمان شێوە لەڕووی زەمەنیشەوە فراوانو دووروودرێژە. دەتوانین هێدی هێدی بگەڕێینەوە دواوە بەرەو ساتەوەختی خومەینیو ئیخوانی موسلمینو ریفۆرمیستە سەلەفیەکانی سەدەی نۆزدەو پاشان بەرەو بزاوتی وەهابیو دواتر بیریارە مەزنە ریفۆرمخوازەکانی وەك ئیبن تەیمیە (سالّی *728*ك-*1328*ز مردووە)و غەزالی (*505*ك-*1111*ز)و شافیعی (*204*ك-*820*ز)و

جەعفەری سادقی (148ك–765ز) لەگەڵ حەسەنولبەسری (110ك–728ز).

زیاتر رووی توێژینەوەکەمان دەکەینە سەر ئەوەی کە گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ[5] گوتارێکی کۆییە (جماعي). ئەوەش لەوەوە هاتووە کە کۆمەڵگە بەسەرجەم توێژ چالاکەکانیەوە لەڕێی ئەم گوتارەوە گوزارشت لەخۆی دەکات‌و خۆی تێدا دەبینێتەوەو هەر لەڕێی ئەویشەوە (واتە ئەو گوتارەوە) خۆی بەرهەم دێنێتەوە.

راستە پیاوانێکی ئایینی زۆر هەن چاکتر لەخەڵکانی دی ئەوەدەزانن کەچۆن هیواو خولیای لاوانی ئێستا ببەستنەوە بەو دارشتەو ئامۆژگاریی‌و بنەمایانەی کە لەکەلەپوردا بنجیان داکوتیوە، بەڵام تەوەرەکانی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ بەگریمانەو بابەتەکانیەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ لەلایەن هەموانەوە بەکار دەهێنرێن.

ئەم تەوەرانە هەریەك لە هەستیاریی کۆیی‌و شێوازەکانی وێناو پەیبردن‌و زمان‌و ئەدگارەکان ئاراستە دەکات. لەبەرئەوە، دەتوانین گشت ئەو تەوەرو گریمانانە دیاری بکەین بێ‌ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ هیچ نووسەرو نووسراوێکی دیاریکراو، چونکە رۆژانە لەرۆژنامەو گۆڤارو رادیۆو کۆنگرەو موحازەرەو ئامۆژگاریی‌و وتارو وانەکانی دواناوەندیی‌و زانکۆکاندا دەیانبینین‌و بەرگوێمان دەکەون... ئەوەی شایانی وتنە تەنانەت ئەو رووناکبیرانەشی کە پێویستە لەم گوتارە ناوەڕۆك ئایدیۆلۆژییە دووربکەونەوەو وریای بن، کەچی بەهەموو قەناعەتیانەوە پشتگیری لەچوارچێوەو ئاقارەکانی دەکەن. زۆرن ئەو تێزانەی دکتۆرا کە بەپێی گریمانە بەربڵاوەکانی گوتاری قەومی‌و گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ دارێژراون‌و نووسراون. جالەبەرئەوە رەوشێکی لەوجۆرە باشتر هانمان دەدات بۆ دروستکردنی مەودایەکی رەخنەیی بەرامبەر ئەو گوتارە. لەبەرئەوە پێمانوایە گواستنەوەی ئەو گوتارە بۆ زمانە ئەوروپییەکان (رۆژئاواییەکان)[6] بەهەمان ئەو دارشتن‌و دەربڕینانەی کەموسوڵمانەکان بەکاری دێنن بەس نییە بۆئەوەی چاوگە مێژوویی‌و کاریگەرییە دەروونی– زمانەوانیەکەی‌و پێگە ئەبستمۆلۆژییەکەی پیشان بدرێت‌و دەربخرێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دەستدەکەین بەشیتەڵکردنی میکانیزمە شاردراوەکانی[7].

## تەوەرەکانی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ

مەبەستمان لەوشەی (تەوەرەکان– محاور) ئەو کۆمەڵە بۆچوونە هەمیشەیی‌و دووبارە کراوانەیە کە موسوڵمانان بۆ فیکرو ئیرادەی مێژوویان دایدەنێن بەمەبەستی چالاککردنەوەو پیادەکردنی رێنومایییەکانی ئیسلام. کۆی ئەو تەوەرو گریمانانەی هەڵیاندەهێنجین بونیادی تێگەیشتنێکی باو لای هەریەك لەکەسانی خاوەن رۆشنبیرییەکی بەرزو کەسانی ئیمانداری سادەو ساویلکە پێکدێنێت. ئەم شتانە لەنێو هەمووماندا هاوبەشن. زیاتر سەرنجمان دەخەینە سەر ئەم تەوەرانە:

1– خوا یەکەو بەرزو باڵایەو زیندووەو دادپەروەرە... چەندین دەسپێشخەری ئاڕاستەی مرۆڤ کردووەو نێردراوی خۆی لەسەر ئەم زەوییە لێ هەڵبژاردوون.

2– هەموو جارێك هەموو دەسپێشخەرییەکانی (=وەحی) بەهەمان شێوازی گەیاندن ئەنجامداوە.. خوا پێغەمبەرێك یان نێرەرێك هەڵدەبژێرێت تاوەکو لەوێوە ئیرادەو ئارەزوو فەرمانەکانی بۆ مرۆڤ دەربخات. ئیدی لەوکاتەوە مرۆڤەکان دابەش دەبن بەسەر دوویەشی جیاوازدا: بەشی ئەو باوەڕدارانەی کەئیمان‌و باوەڕیان پێگەیشتووە یان چۆتە دڵیانەوە/ بەشی ئەو کافرانەی کە لەناو رەتکردنەوەو گومڕاییاندا نغرۆبوون.

3- لەمەوە زەمەنی سەرزەمین دابەش دەبێت بۆ (پێش) وەحی/ (دوای) وەحی. تەقویمەکانی جوولەکەو مەسیحی‌و ئیسلامی لەمەوە دروستدەبن. تەنانەت شوێنیش دابەشدەبێت بۆ ناوچەیەك کە یاسای خواو شەریعەتەکەی تێدا پیادەکراوە، لەگەڵ ئەو ناوچەیەی کە بۆی ملکەچ نابن (أرض العصیان) یان دار الاسلام/ دار الحرب.

4- قورئان دواهەمین وەحی‌و کامڵترینیانی لەخۆگرتووە. دوای ئەو هیچ وەحییەکی تر نایەت تاکاتی قیامەت‌و حەق‌و حیسابی ئەو دونیا. هەموو ئایەتێکی قورئانی تەوەرێکی ئاڕاستەکەرە لەپێناو بیرکردنەوەو کارکردندا.

5- ژیانی محەممەد‌و شاری مەدینە- ئەو دەوڵەتەی لەنێوان سالانی (622-633ز) لە (مەدینە- یثرب) دروستکرد، نموونەیەکی بالایەو پێویستە لەهەردوو ئاستی ژیانی تاکەکەسی‌و بەکۆمەڵدا لاسایی بکرێتەوە. هاوەڵانی محەممەد نەوەیەکی جیامەڵکەوتووی سەربەرز پێکدێنن‌و دەبێت چاویان لێبکرێت، چونکە بەدڵسۆزی‌و ئەمانەتەوە وەحییە قورئانی‌و ڕێنومایییەکانی پێغەمبەریان وەرگرتووە.

6- هەر کام لەئایین‌و دەوڵەت‌و دونیا سێ تۆپکی یەکانگیر پێکدێنن‌و (ناکرێت) مرۆڤ لێکیان بترازێنێت. بەلام ئەوە ئایینە کە سیاسەت‌و ژیانی دونیایی بەمانا بەهێزەکەی ئەم وشەیەو بەپێی ئەم هاوکێشە تیۆلۆجییە (لاهوتی) پێکدێنێت‌و (دادەڕێژێت): وەحی= حەقیقەتی ڕەهاو هەر ئەم حەقیقەتەشە ئەو مێژووە زەمینییە ئاڕاستە دەکات‌و دەیگەیەنێتە مێژووی ڕزگاریی‌و بردنەوەی ئەو دونیا[8].

7- لەبەرئەوەی هەموو حەقیقەت لەوەحی‌و ئەزموونی مەدینەدایە[9]، کەواتە دەبێت ئەو سیستمە کۆمەلایەتی‌و مێژوویەی لەئێستادا پەسەندو شەرعییە بگونجێت لەگەڵ ئەو سیستمەی کە ئوممەی موسوڵمانان لەسەرەتادلو لەزەمنێکی پیرۆزدا ناسییان‌و دەکەوێتە سەروو هەموو زەمەنەکانی ترەوە. ئەمەیە پێناسەی هەڵوێستی ریفۆرمیستی (یان هەواداریبە ریفۆرمیستیەکە) کەمەر لەسەدەی یەکەمی کۆچییەوە (لایەنگرەکانی) پێگۆشکراوەو لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن ڕەوتی سەلەفییەوە بەگوڕوتینێکی بەهێزەوە سەریهەڵدایەوە. ئەمڕۆ ئەم تێڕوانینە ئەفسانەییە بۆ مێژوو لەهەموو کاتێکی تر زیاتر دەستی بەسەر گوتاری ئیسلامی هاوچەرخدا گرتووە. دواتر دەبینین کردە مێژووییە ڕۆژانەییەکانی سەر ئەرزی واقیع هەتا دێت زیاتر لەم تێڕوانینە راستدەکاتەوە.

هەموو ئەو تەوەرانەی (یان بەڵگەنەویستانەی) کە لەژماردنیان بووینەوە باوەڕو یەقینی ئیسلامی پێکدێنن ئەم باوەڕەش پێویستی بەم گریمانانەی خوارەوە دەبێت لەهەموو دەرکەوتنەکانیدا:

## گریمانەکانی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ

مەبەستمان لەم گریمانانە ئەو بنەماو پرەنسیپانەن کەبەردەوامن لەبەرهەمهێنانی سەرجەم مەعریفەی ئیسلامیدا، کە کەوتوونەتە دەرەوەی هەموو جۆرە ڕەخنەیەکی ئەبستمۆلۆژی (مەعریفی)یەوە. ئەم مەعریفەیە (واتە مەعریفەی ئیسلامی) پێی وایە کە هەمەکی مێژوویی لەو هاوکێشەیەوە پەیدا دەبێت کەپێشتر باسمانکرد، واتە: وەحی= حەقیقەتی گشتگیر. ئەم حەقیقەتە مێژووی زەمینی‌و دونیایی ئاراستە دەکات‌و دەبێتە مایەی بردنەوەو ڕزگاربوون لەو دنیا. هەروەها پێشیوایە کەهەموو وەحی لەو قورئانەدایە کە لەسەرەتاوە بریتی بوو لە کۆمەڵێك دەستەواژەی زارەکی (شفهي)وپاشان بەپەڕاوکراو بووە پەرتووك (واتە نووسراوەتەوە). کەواتە خوێندنەوەی

(-ڕاڤەکردن) ئەودەقە (واتە قورئان)پێویستە تاوەکو مەعریفەیەکی ڕاستو باوەڕپێکراوی لێدەربهێنرێت، بەتایبەتی لەپێناو بەرهەمهێنانی ئەو یاسا ئایینیەی کە سرووتەکانی پەرستنو مامەڵەکاریی جڵەو دەکات[10]. فیکری ئیسلامی کلاسیکی زانستێکی تایبەتی بۆ پرسیارکردن لەبارەی ئەو هەلومەرجە زمانەوانیو مێژووییە دامەزراندووە کە ڕاڤەیەکی ڕاستو دروست بۆ دەقە پیرۆزەکان (قورئان+ فەرموودە) دەکات. مەبەستمان لەزانستی ئسوڵی فیقهیو شەریعەیە. ئەگەرچی ئەم زانستە بەکردەوە لەدوای سەدەی شەشەمی کۆچییەوە (سەدەی دوانزەهەمی زایینی) ڕاوەستاوەو فەرامۆشکراوە (هەرچەندە ئەم حاڵەتە لای شیعەکان کەمترە) بەڵام پشتگیریی لەم گریمانانەی خوارەوە دەکاتو برەویان پێدەدات لەبری ئەوەی ڕەخنەیان بکات.

1- ڕاستی مێژوویی قورئان[11] (وەك کتێبێکی نووسراو) لەگەڵ کۆکردنەوەی لەسەردەمی خەلافەتی عوسمانندا (23-35ك/644-656ز) بەتەواوی سەلمێنرا، لەبەرئەوە هەر جۆرە بەدگومانییەك بەرامبەر ئەو بارودۆخەی ئەمەی تیادا ئەنجامدراوە بە زەندەقەیەکی گەورە دادەنرێتو دەبێتە مایەی سزادانو تۆڵەسەندنەوەیەکی تووشو سەخت.

2- ڕێنومایییەکانی محەممەد بەشێوەیەکی باوەڕپێکراو گواستراونەتەوە ئەویش بەهۆی یادەوەری سەحابەکانو ئەمانەتی زانستییانەوە کە گومان هەڵناگرن، هەروەها بەهۆی تابعەکانەوە تائەو کاتەی ڕێنوماییو دەقەکان لەڕێگەی نووسینەوەوە چەسپان. لەو نێوەدا لەنێو سوننەدا سەحیحول بوخاری (ساڵی 256ك/870ز مردووە) یان موسلیم (261ك/875ز) لەنێو شیعەشدا کلینی (322ك/940ز مردووە)و ئیبن بابەوەییە (381ك/991ز) دەرکەوتن.

3- یاسای ئایینی بەتەواوەتی لەلایەن سەروەری پیرۆزەوە (خواوەند) دانراوەو بەهیچ شێوەیەك نابێ قسە لەسەر دەقە کۆکراوەکانی هەردوو ئەو کەلەپورە بکرێ کەپێشتر باسمانکرد (کەلەپوری سوننی+ کەلەپوری شیعی). ئەم یاسایە باوەڕپێکراوەو چەسپاوە، جا چ لەلایەن چەند دەقێکی ڕەوانو براوەوە بێت، یان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی دەنگی زۆرینەی موسوڵمانانەوە یان لەڕێگەی قیاسەوە[12] بێت.

4- ئەو ئیمامە موجتەهیدانەی لێپرسراون بەرامبەر بەگەڵاڵەکردنی شەریعەت، شارەزاییان لەهەموو زانستە تەکنیکییەکانی ناو ڕێزمانی عەرەبیو موفرەداتەکانو فەرهەنگ (معجم)و زمانناسیو ڕەوانبێژیو ئسلوبو زانستی واتاو مەنتقو مێژوودا هەیە، ئەمانەش لەو زانستانەن کەدەبێت بزانرێنو دەسەڵاتیان بەسەریدا بشکێت تاوەکو تاقە مانایەکی ڕاستو دروست بۆ هەموو دەقێکی پیرۆز دیاریبکەن. بەمجۆرە پووختەگەلێکی تیۆلۆجیو فیقهی- یاسایی یان بەدەستهێناوەو ڕاڤەی شەریعەتە ئیلاهییەکەی پێ ڕاڤە دەکەن بۆخزمەتی کۆمەڵگەی مرۆیی. بەمەش پیادەکردنی ئەو پرەنسیپەیان بۆ هەموو سەردەمەکان فەراهەمو مسۆگەرکردووە کەدەڵێت: (ألا حكم إلا لله). لەم حاڵەتەدا ئەرکی سەرشانی سەرۆکی دەوڵەت، جا چ خەلیفە بێت یان سوڵتان یان ئەمیر یان سەرۆکێك بێت، تەنها ئەوەیە بەوردی خاڵ بەخاڵی هەموو کەرەسەو بابەتەکانی شەریعەت پراکتیزە بکات.

5- ئەو زانستە تەکنیکییەی تایبەتە بە ڕاڤە کلاسیکییەکان هەرگیز ئەو دابڕانە ئەبستمولۆژییە نابینێت کەهەموو کەرەسەو فاکتەرو ئەنجامەکانی (ئەو زانستە) تووڕ هەڵدەدات[13]. بەمجۆرە عەقڵی ئیسلامی خۆی لەمێژووگەریی (التأريخية) یاخی دەکات ( واتە زەمەن دەگۆڕێت بەڵام عەقڵەکە هەروەك خۆی دەمێنێتەوە).

شێوەی ئامادەگی ئیسلام لەمێژوودا بەندە بەهێشتنەوەی خودی ئەم گریمانانەوە، ئەمە سەرەڕای ئەو بەدرۆخستنەوەیەی کە لەلایەن واقیعو ڕەخنەی زانستیانەی نوێوە دووچاری هاتوون. دواتر دەبینین کەچۆن ئەو بابەتە بەریلاوانەی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ سەرلەنوێ ئەو گریمانانە دەژێننەوەو هێزیان پێدەبەخشنەوە.

## بابەتەکانی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ

مەبەستمان لەوشەی *بابەتەکان* هەموو ئەو داخوازیو دروشمو ناڕەزایەتیو هیواو باوەڕیانەیە کە لەسەدەی نۆزدەوە هۆشیاری ئیسلامی پێجۆشدەدەرێت. بالێرەدا گرنگترینو چەسپاوترینو بەردەوامترینیان بژمێرین:

1- یەکبوونی ئیسلام لەتوانایدا هەیە ببێتە بنکەیەك بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی چالاكو سیستمێك بۆ ئەو بەهایانەی کەدەتوانێت بەرەنگاری هەژموونی سیاسیو ئابوریو ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا ببێتەوە.

2- نابێت ئەو کۆنترۆڵەی ڕۆژئاوا هەیەتی بەسەر کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا وا لێکبدرێتەوە کەئەمە بۆ لاوازی ئیسلام دەگەڕێتەوە لەڕووە بیروباوەڕییەکەیەوە، یان بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام بگەڕێنرێتەوە بەرامبەر بەپێشکەوتنو عەقڵی نوێو زانست وەك ئەوەی ئەرنست رینان ئیدعای دەکا. بەپێچەوانەوە، ئیسلام ئایینێکی کراوەیە لەبەردەم هەموو دۆزینەوەکانی ژیارو شارستانێتی نوێدا[14]. بەلام بەو پێیەی موسوڵمانەکان ڕوویان لەڕێنومایییە پاكو بەپیتەکانی ئیسلامی یەکەمین وەرگێڕاوە. کەواتە چارەسەرێکی مێژوویی بۆ ئەو داوەشانو کەوتنە، ژیاندنەوەی ئیسلامە لەشێوە شکۆییەکەی یەکەمیدا.

3- لەدادپەروەری برایەتیودیموکراتیەتو مافەکانی مرۆڤو ڕزگارکردنی ئافرەتو گیانی لێبووردنو بەکارهێنانێکی دادپەروەرانەی خاوەندارێتیو بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری.... بەهەموو داهێنانەکانی تری شۆڕشی مۆدێرنەوە هەرهەموویان لەسەردەمی ئیسلامی یەکەمەوە (= سەردەمی دامەزراندن) هەنو (شتێکی تازە نین). ئیسلام داوای هەموو ئەمانەی کردووەو دەقاندوونی. ئەوە ئیسلامە مامۆستای ڕۆژئاواو جیهانە.

4- ئەو ئایدیۆلۆژیا ماددییەی کەڕۆژئاوا خەریکی بڵاوکردنەوەیەتی هەموو بەها ڕۆحییەکانی ئیسلام دادەڕمێنێ، کەواتە دەبێت لەیەك کاتدا دژایەتی ئەویشو هەموو ئەوانەش بکرێت کەدوای کەوتوون وەك ڕۆژهەڵاتناسەکانو ئەو توێژەرەوە موسڵمانانەی کە هەڵگری بیرو هزری ڕۆژئاوایین.

5-ئەو زانستەی لەڕۆژئاوادا هەیە ناتوانێت خوێندنەوەیەکی بابەتیانەی هەبێت بۆ مێژووی ئیسلامو ڕێنومایییەکانی ئیسلام. لەبەرئەوە دەبێت پابەندییەکی تەواو هەبێت بەمیتۆدیەتی ئسوڵەکانەوە (ئسوڵی فیقهیو ئسوڵی ئایین). تەنانەت دەبێت بەگومان بین لەو فەلسەفە یۆنانییە کۆنەشی کەموسوڵمان لەقۆناغی کلاسیکیدا پشتیان پێبەستووەو بەباشیان زانیووە.

6- جیاکردنەوەی ئایین لەدەوڵەت بیرۆکەیەکی ڕوخێنەرەو داهێنانێکی ڕۆژئاواییە. بەلام ئیسلام هەوڵی هێشتنەوەو پاراستنی ئەو پلەبەندیو هەرەمییە دەدات کە لەنێوان سەروەری باڵای یاسادانەر (کەقسەی خوایە بە تەفسیرە ڕێگەپێدراوەکانیەوە)و هەموو شێوەو فۆرمەکانی دەسەلاتی سیاسیدا هەیە.

7- هەموو داهێنانە گەورەکانی زانستی نوێ پێشتر لەقورئاندا باسکراونو هەن. زانا موسوڵمانەکانیش لەپێش هەموو ئەورووپییەکانو

زانستەکانیانەوەن بەتایبەتی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا.

8- پرۆسەی بیناکردنەوەی نیشتمانی لەئێستای دوای سەربەخۆییدا بەبێ ئیسلامو بەدژایەتیکردنی ئیسلام سەرناگرێ.

بەتەنها خوێندنەوەیەکی ڕووکەشیانەی سادەی ئەم پرەنسیپانەی سەرەوە ئەوەمان لاڕووندەبێتەوە کە گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ تاچ ئاستێك تێکەڵی لەنێوان هەریەك بە تایبەتمەندییەکانی ئایدیۆلۆژیای نوێو هەندێك توخمی پێکهێنەری ئەفسانەدا دروستکردووە. دەبێت چی لەو یەقینە زۆرو زەبەندە بکرێت کەلاوانی خرۆشاوو بەگوڕوتین لەهەموو لایەکەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەستی هانای بۆ درێژدەکەن؟ ئایا دەبێت لەو حەقیقەتە سۆسیۆلۆژیەدا بوەستین کە زادەی داڕشتنێکی وەسفیانەی ئەبستراکتی نێمەیە بۆ ئەو پرەنسیپانەی کەموسوڵمانە هاوچەرخەکان زۆر بەئاسانی خۆیانی تێدا دەبیننەوە؟ یاخود پێویستە هەستین بە لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەو شیتەڵکردنی ئەو سیستمی وێنایانەی کەتایبەتن بە گوتاری ئیسلامییەوە تاوەکو بتوانین پێگە مەعریفیەکەیو ئاستەکانی بەرهەمهێنانیو دەسکەوتەکانیو توانای خۆگونجاندنی لەگەڵ واقیعو ڕادەی جۆشدانی هۆشیارییو ئاستی پێکهێنانی خەیاڵە کۆمەڵایەتییەکەی تاووتوێ بکەین؟من پێموایە یەکێك لە ئەرکەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی نوێ کردەی تێگەیشتنو خستنەڕووی ئەو بەکارهێنانە جۆراوجۆرەیە کەهەموو کۆمەڵگەیەك لەمیانەی باگراوندە سیمانتیکی- مەعنەوییو ڕەمزییەوە ئەنجامیدەدا. ئێستا کاتی ئەوەیە وا لەکۆمەڵگە عەرەبیو ئیسلامیەکان بکەین سوود لەو مۆدێلە تازەیەی تێگەیشتنی نوێ وەربگرن کە فیکری هاوچەرخ بۆی ڕەخساندووین.

هیچ کات هەوڵی ئەوەمان نەداوە بەناوی زانستی نوێوە ئەو زانستەی کە دڵنیایە لە گشت ڕێساو پرەنسیپو میتۆدو ئەنجامەکانی خۆی، سووکایەتی بە کۆنو ڕابوردوو ئایینو بیروباوەڕو کەلەپور بکەین، چونکە دژیوونی سەختو یەکلاکەرەوەی نێوان کەلەپورو مۆدێرنێتی جگە لەچرکەیەکی مێژوویی دیاریکراو کەچرکەی ئەقڵانیەتی زانستگەرییەو ڕێگەچارەو تێزە بەرتەسکەکانی خۆی سەپاند هیچی تر نەبوو[15]. ئێستا ئەو قۆناغەمان تێپەڕاندووە. کۆمەڵگەکان لەسەر چەند ئاستێك قسە دەکەنو پێویستە هەر گوتارێك لەسەر ئاستە مەعریفییە تایبەتیەکەی خۆی وەربگرین، لەڕێگەی ئەو وتەزایانەی کە یارمەتییانداوە لەپێکهاتنو گەڵاڵەبوونیدا. بەمجۆرە دەبینین هەتا ئێستا گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی جیاکاریی بکات لەنێوان ئەفسانەو مێژوودا. ئەم گوتارە، تێکەڵیی لەنێوان ئەم دوو جۆرە لەمەعریفە دەکاتو لەمیانەوە دەچێت بۆ ئەوی تریان، بەبێ ئەوەی بێزار بێت یان پرسیارێکی ئەبستمۆلۆژیی لا دروست ببێت یان هەست بەهیچ چەشنە گیروگرفتێك بکات. لەواقیعدا، هیچ ڕەوای هەق نییە بگوترێت ئەم گوتارە مێژوو ناناسێ. بەڵام هێشتا هەر زۆر دوورە لە مێژووی سەدەی نۆزدەهەمی ئەورووپی کە کار تیایدا گەیشتە ڕادەی بەپەراوێزکردنی فاکتەرە ئایینیو ڕۆحییە باڵاکانو تەنانەت بەیەکجاریی لەگۆڕەپانی کۆمەڵگەشدا کرایە دەرێ، بەو پێیەی یەکێکە لەسیماکانی کۆمەڵگەی سەرەتایی. بەڵام هەرچی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخە بەپێچەوانەی ئەمەوە دەبینین هەموو نموونەو مۆدێلەکانی مێژووی دونیاییو زەمینییە ئاخنیویەتیە نێو ئەو ماوە کورتەی وەحییەوە(ماوەی ئەزمونی دامەزراندن)،

بەمەش خۆی لە چەمکێکی سەرەکی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی بێبەشکردووە کە تایبەتە بەمەریەك لە مەعریفەی ئەفسانەیی‌و مەعریفەی ئەقڵانی. مەبەستم لەچەمکی مێژووگەریی (التأریخیة) یان ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و رۆشنبیرییەیە کەئەفسانەو بەپیرۆزکردن‌و باڵاخوازیی‌و ئەقڵ‌و... هتدی تیا بەکاردێت.

ئەوەی ئەم گوتارە {گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ} دەیەوێت زیندووی بکاتەوەو بیژێنێتەوە دەوڵەتە مەدینەیەکەی سەردەمی پێغەمبەر نییە، بەڵکو ئەو نزخە ئایینییە ئایدیالیانەیە کە ئەو دەوڵەتە بەرهەمیهێناوە. بەم شێوەیە نائاگایانە چەندین کاری وەك نکۆڵیکردن‌و بەلاڕێدابردنی واقیع پەیڕەو دەکات. ئەمەش تایبەتمەندێتی گوتاری ئەفسانەیی‌و ئایدیۆلۆژی‌و، بەمجۆرەیە. گوتاری ئەفسانەیی هەڵدەستێت بەگۆڕینی ئەو کارە ماتریالیە هەستپێکراوانەی کە محەممەد ئەنجامیداون بۆ جۆرێك لەوێناکردنی ئەفسانەییانەی ساتەوەختێکی ناوازەی بەهرەبەخش، ئەویش لەڕێگەی تەرمیزکردنی[16] ئەو فەزا کۆمەڵایەتی‌و مێژووییەی کە تایبەتن بەکۆمەڵگەی حیجازەوە. ئەم جۆرە گوتارە دەیەوێت رازیمان بکات بەوەی کە ئێمە بەتەواوی هەموو هەلومەرجە ئایدیالییەکانی ئەو سەردەمە دەناسین یان هەر هیچ نەبێت زانینی ئەو هەلومەرجانە لەڕووی مێژووییەوە کارێکی شیاون، بەڵام ئەو شتە زۆر لەوە گرانترە کە لەئێستادا بەدیبێت. هەروەها ئەم گوتارە هەموو ئەو ئاڵوگۆڕە مێژووییانەش پشتگوێ دەخات کە هەر لەسەرەتای ساڵی (632ز)ەوە روویانداوەو لەئەزموونی مەدینە دووریخستوینەتەوە، ئەو ئەزموونە بەجۆرێك وێنا دەکرێت کە زۆر دەگمەن‌و دانسقەیەو شتێکی بان - مێژووییەو دەلوێت لەئێستادا دوبارە بکرێتەوە!...

ئەگەر شتێکی گران بێت قۆناغی دامەزراندن لەفەزایەکی کۆمەڵایەتی‌و مێژوویی دیاریکراودا گەمارۆ بدرێت‌و نەتوانرێت بەتەواوی بناسرێت، ئەوا دەکرێت وەك کردەیەکی ئەفراندنی بەکۆمەڵی چەند نەوەیەکی خاوەن ئیمان سەیری بکرێت کە لانی کەم تا سەدەی دەیەم چەندین داخوازی‌و ئاواتیان خستۆتە گەڕ لەپێناو کاملێی مرۆیی‌و سیستەمە سیاسییە ئایدیالییەکەو دادپەروەری موتڵەق‌و برایەتیدا. هەموو ئەمانەش لەڕێگەی داسەپاندنی (اسقاط) سەرجەم بەها ئایدیالییەکانەوەیە بەسەر وێنە رەمزییەکەی محەممەدو فەزای ئەو دەلالات‌و واتایانەی کە تایبەتن بە وتەی خواوە. ئەو بەڵگەنامە راڤەیی‌و ریوایەتیانەی کە ئومەتی موسوڵمان ئەوە دوای ئەوە گواستونیەتیەوە بۆتە هۆی قەبەکردنێکی بێ ئەندازەی ناوەڕۆکە مەعنەوی‌و سیمانتیەکانی کارەکانی محەممەدو پەیامەکەی‌و هاوڕێکانی بەلای سونییەوەو، ئیمامەکانی بەلای شیعەوە.بەمجۆرە دوو چەشنە کەلتوری زیندوو لەئیسلامدا دروستبووە (کەلتوری سوننی+ کەلتوری شیعی). بەڵام هەرچی کەلتورە دەرەکییەکەیە بەدرێژایی مێژوو ناڵاندوویەتی بەدەست نەبوونی بنکەیەکی کۆمەڵایەتی‌و تەنگەبەریی ئەو بنکەیە خۆیەوە. ئەم دوو کەلتورە هەردووکیان بەهانەو بانگەشەیەکی زۆر دەکەن بۆ گەڕانەوە بۆ بنج‌و بنەماکان (الأصول) و بەشتێکی پێویستیشی دەزانن. کەواتە ئەو شتەی کە لەم بانگهێشتەدا دەیخوێنینەوەو تێیدەگەین ئەو پرۆسە مێژووییەیە کە لەهەوڵی پێکهێنانی ئەوەدایە پێی دەگوترێت کەلتوری ئایینی. ئەم کەلتورەش زیاتر ئیرادەی شوناس‌و بوونی ئەو گەلەیە کە بانگەوازی پەیامە ئیلاهییەکەی پێگەیشتووە لەوەی کردەیەکی سیاسی‌و ئابوری‌و فەرهەنگی دیاریکراوبێت[17]. کاتێك بەقووڵی سەرنج لەژیانی رۆژانەی ئەو گروپە جۆراوجۆرانە دەدەین کە ئومەتی ئیسلامیان

پێکهێناوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەمانە هەموویان لە (هەستێکی پراکتیکی یان هەستێکی عەفەویانەی راستەوخۆ)[18]دا نقومبوون کە زۆر دوورە لەو پەیامە ئایدیالییە ئایینییەی کە هەمیشە پەیوەستبوونی خۆیانی بۆ دوپاتدەکەنەوە لەڕوانگەی رزگاربوونی ئەودونیاییەوە. لێرەدا پەیوەندییەکی ترسناکو پڕ کەندو لەند لەلایەن گوتاری ئیسلامی هاوچەرخەوە بەدەردەکەوێت لەنێوان ئەو پەیامەی کە بۆ سەردەمی دامەزراندنەکەی دەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەو سەرمایە رەمزییەی کە تایبەتە بەهەموو توێژو کۆمەڵەیەکی ئەتنی- جوگرافیاییەوە کە ئەویش پابەندە بەئاڵوویری ئابوریو هاوسەنگییە کۆمەلایەتییەکانو ئەو کارو کردەوانەی پڕن لە توندو تیژییو سوکایەتیپێکردن.

بۆ ئەوەی خوێنەر لەدوالیزمە دژەکانو ئەو بەرامبەرانە تێبگات کە لێرەدا هەوڵدەدەم بیانخەمە روو نموونەیەکی تاڕادەیەک درێژی بۆ دێنمەوە بەخاتری ئەوەی شتەکان چاکتر روونببنەوە. لەسەرتاسەری مەغریبی گەورەدلو هەتا ساڵەکانی پەنجاو شەستەکانیش[19] بەتایبەتیش لەزۆنگاوی باشووردا دامەزراوێکی کۆمەلایەتی ئابوری بەدیدەکرا پێی دەوترا (پێنج یەك 5/1، الخمّاسە). ئەم دامەزراوە - نەریتە جۆرێکە لەبەگەڕخستنی کشتوکاڵیی بۆ ئەو خاوەن زەوییەی کە جوتیار بەرانبەر بە کرێ ملکەچدەبێ. هەردوولایان لەسەر ئەوە رێکدەکەون کە پێنج یەکی ئەوەی بەرهەمهاتووە لەخورما بۆ جوتیار بێت. ئەو کەسەی کە ئەم پێنج یەکە وەردەگرێت وەنەبێت تەنها بەکاری کشتوکاڵییەوە وازی لێبهێنرێت، بەڵکو دەبێت کاری خزمەتکارییش بکات لای گەورەکەی تا لەبەرامبەردا هەندێ دیاری بداتێو پارێزگاری بکات.

ئەم رەوشە پڕ لە کۆیلەییو چەوساندنەوەیە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێکەوتنەمان بۆ راڤە دەکات کە هەندێك جار کەسی خاوەن پێنج یەکەکە لەڕێگەی راکردنەوە ئەنجامیدەدا. لەو ئامرازە سەختانەی خاوەن زەوییەکە دەیگرێتەبەر بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتی راکردنە روونەدات ئەو ئامرازەیە کە گوتاری کۆمەلایەتی باو پێی دەڵێت "الحنّانة": واتە بەخشیشێکی پڕ لە سۆزو بەزەیی. لەڕاستیدا ئەم ناوە زیاد لە کینایەو مانایەك لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. ئەم ناوە پەردەپۆشی هەموو کارە پڕ لە توندوتیژییو زۆردارییەکە دەکات بەدەمامکی ئەو کارە پڕ لە خێرو چاکانەی کە لەڕێگەی بەها رەمزییە باوەکانی ئەو کۆمەڵەیەوە خۆی سەپاندووەو جێگەی رێزن. پوختەی بیرۆکەی "الحنّانة" لەوەدایە کە هەر پێنج یەکەکە بەیەکجار نەدرێتە ئەو کەسە. بەڵکو خاوەنەکەی هەمیشە بەشێك لەو پێنج بەشە لای خۆی گلبداتەوە بۆ ئەوەی رانەکاتو ئەو کەسەشی دواتر جێگەی کەسە راکردووەکە دەگرێتەوە دیارییەکی بێ نەزاکەتی بداتێ. ئەو بەشەی کە بەم شێوەیە بەکاردێت پێی دەوترێت "الحنّانة". ئەگەر لەدیدگایەکی شیکارییانەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانو چەوساندنەوەوە سەیر بکەین دەبینین کە "الحنّانة" بریتییە لەزەوتکردنو بەتاڵانبردنێکی دوو لایەنە (بەتاڵانبردنی هەریەك لەکرێکارەکە خۆیو ئەوەشی دێتە جێگەی). بەڵام ئەوەی بەلای شێوازی بەرهەمهێنانی خێزانیی باوی لای کۆمەڵە بیابانئشینەکانەوە گرنگە خستنەگەڕی بێ پسانو یەکبینەی زەوییە چونکە ئەمە تاکە ئامرازێکی دەسەلاتدارانەو تەنانەت بۆ بەردەوامبوونی دەسەلاتیان بەسەر کۆمەڵگادا دەبێت ئەو مانا کۆمەلایەتیانەش بسەپێنرێ بەسەر کۆمەڵگەدا کە شەرعییەتێکی ئەبەدییو هەتاهەتایی دەدەنە سیستمێکی پڕ لەچەوساندنەوەو نابەرابەریی.

ئەم سیستمە بەهەموو ئەو یاسا ئەخلاقیو ئایینیانەشی کەبەردەوامی پێدەدەنو دەیهێڵنەوە

دەکەونە ناو ئەو زاراوەیەی کە بیبیر بۆردیۆ پێی دەڵێ "هەستی پراکتیکی". ئەم وشەیە سەرلەبەری پەیوەندییە راستەقینەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆرە بازرگانییەکان دەگرێتەوە، کەبەهۆی بەکارهێنانی زۆریان لەلایەن "سەرمایە رەمزییەکەی" کۆمەڵەوە[20] هەمیشە وەك چەند کردەیەکی ئەخلاقییانەی بەرزو بڵند وێنا دەکرێن. دیارە ئەمانە زۆر لەپێش دەرکەوتنی ئایینی ئیسلامەوە هەن، بەڵام سەرباری بڵاوبوونەوەی یاسا ئیسلامییەکەش (الشریعة) ئەمانە هەتا رۆژی ئەمرۆمان هەر بەردەوامن لەنێو ئەو کەرتە کۆمەڵایەتییانەی لەژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی ناوەندیدان (واتە لەژێر رکێفی خەلافەت یان سەڵتەنەت یان میرنشین یان دەوڵەتی نوێدان). کەواتە پێویستە سۆسیۆلۆجیایەك بۆ دەسەڵاتی ناوەندی دابهێنێن لەپێناو دیاریکردنی رادەی بڵاوبوونەوەی یاسا ئایینییەکە بەبەراورد لەگەڵ فراوانیی ئەو ناوچانەی کە "هەستی پراکتیکی" رێساو یاسای خۆی تێدا سەپاندووە.

هەموو ئەو فەزا سیاسی و کۆمەڵایەتی – ئابوورییەی کە تەنانەت لای "هەندێك لە رۆژهەڵاتناس"انیش پێی دەوترێ ئیسلامی، دوو ئاستی زۆر جیاوازو تێکچرژاوی لەڕووی رێکخستن و گوزارشتەوە هەیە کە تایبەتن بەهەموو توێژێکی کۆمەڵایەتییەوە. هەرچی ئاستی یەکەمە یان ژێرخانە رۆشنبیرییە زۆر کۆنەکەیە خاوەن بنچێکی "ژینگەیی"یەو بەهۆی بەکارهێنانی بەردەوامی یاسایەکی رەمزیی دیاریکراوەوە گۆڕدراوە. ئەوی تریشیان ئاستێکی دەرکەوتووترە چونکە لەڕووی مێژووییەوە تازەترە، ئەمەیان ئەوەیە کە دەوڵەتی ئیسلامی ناوەندیی هەر لەسەردەمی دامەزراندنەوە سەپاندی بەسەر سیستەمی یەکەمدا. ئەمەش بەو مانایە دێت کە لەهەموو جێگەیەکی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا دوو جۆر کەلتوری جیاواز لەڕووی پێگە ئەنسرۆپۆلۆجییەکانیانەوە دەبینرێت[21]. لەلایەکەوە ئەو کەلتورە بەراییەی کە ئیسلام زۆر بەتوندی سوکایەتی پێکردو ناوینا "الجاهلیة": کەبەپێی وشەکە واتە زەمەنی جەهل و نەزانی. لەڕاستیدا ئەم کەلتورە بریتیە لە "فیکری وەحشی"(بەمانا شتراوسییەکەی)و رۆشنبیرییەکی مۆفیانەو مومارەسەیەکی مۆفیانەی کۆمەڵگەی عەرەبی، بەتایبەتیش ئەو کۆمەڵگە خەڵوەتنشینییەی کە هیچ کام لەنووسین و دەسەڵاتی ناوەندیی و یاسای هاوبەش و زمانێکی یەکگرتووی نەناسیوە. بەڵام ئەو کەلتورە ئیسلامییەی کە قورئان ئاوەڵای کردووەو دەوڵەتی مەدینەی محەممەد ئاوایکردووە پشت بەنووسین دەبەستێت بەهەردو مانای وشەکە:- یەکەم/ نووسین بەمانای کتێبە پیرۆزەکان و، دووەم/ نووسین بەمانای چەسپاندن و جێگیرکردنی ئاخاوتنی زارەکی و شەفەویی لەڕووی شێوەی نووسین و پیتەکانەوە، ئەو چەسپاندنەی کە دەبێتە مایەی پێکهێنانی ئەرشیف و سەرکەوتنی (ئەقڵی نوسینەوە- العقل الخطي الکتابي)[22]. ئەویش دیسانەوە هەر پشت بەو یاسا کەردونییە دەبەستێت کە لە قورئاندا کۆکراوەتەوە لەگەڵ زمانی عەرەبی رەسمی و ئەو فەرهەنگە شارییەی کە نوخبەی پابەندو گرێدراو بە ستراتیژەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت دەرەقەتی دێت و بەرهەمی دێنێت. لێرەوە لەوە تێدەگەین کە چۆن هەردوو کەلتورەکە { واتە کەلتوری سوننی و شیعی} لەهەموو جێگەیەك و هەتا ئێستاش لەحاڵەتی پێشبڕکێی یەکتردان.

چوونەناویەك و دژایەتیکردنی ئەم دوو کەلتورە بۆ یەکتری ئەو دوو شتەن کە لەلایەکەوە دیالەکتیکی کۆمەڵایەتی – مێژوویی ئەو کۆمەڵگەیانە دیاریدەکەن کە دیاردەی قورئانیان بەرکەوتووەو لەلایەکی تریشەوە ئەم کۆمەڵگەیانەش دەبەن بەرێوەو حوکمی بەسەردا دەکەن. گوتاری ئیسلامی هاوچەرخیش

لەهەوڵی ئەوەدایە مێژووی هەنوکەیی ئەو کۆمەڵگەیە لەناو سەردەمی دامەزراندندا بڕوێنێت لەپێناو ئەوەی دابڕانێکی مێژوویی دوو جەمسەرە بچەسپێنیت لەگەڵ پێکهێنانی ناوچەیەکی فەلسەفی لەوەی کە بیری لێناکرێتەوە (یان بیرکردنەوە لەبارەیەوە قەدەغەیە). ئەم کەلتورە بانگەشە بۆ دابڕانێکی کۆتا لەگەڵ ئەو کەلتورگەلە بەرابیەدا دەکات کە دەیەوێت خۆی لەسەر شێوەی ناسنامەیەکی ڕۆشنبیری راستەقینە بژێنێتەوە. هەروەها ئەم گوتارە بانگەشەی دابڕان دەکات لەگەڵ ژیاری ئیمپریالیزمو مادیبیەتی ڕۆژئاوادا. لەڕاستیدا ئەم کردەوە نامەنتیقیو ناواقیعیبیەتە مێژوویی‌و سۆسیۆلۆژیی‌و ڕۆشنبیرییەی لەم ڕەفزکردنەوە دوو جەمسەرییەدا هەیە شتێکی زۆر ئاشکرایەو پێویستی بەسەلماندن نییە. ئەمە نیشانەی بەرفراوانی ئەو پانتاییەیە کە بیری لێناکرێتەوەو گریمانەکانی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ لەزەروورەتی خۆیەوە چەسپاندوونی. بەمجۆرە سەردەمی دامەزراندن وەك ئەوە دەردەکەوێت کە لەدەرەوەی هەلومەرجی ئاڵوگۆڕە مادیی‌و شێوەکانی چەوساندنەوەو ئەو گوزارشتەوە بێت کە لەهەموو قۆناغە مێژووییە دیاریکراوەکاندا ئەو میکانیزمە راستەقینانە دیاریدەکەن کە دەبنە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی مرۆیی. ئەم سەردەمە خۆی وەك سەردەمێکی ئایدیالی دەردەخات وەك ئەوەی لەسەروو مێژووەوە بێت. ئێمە پێمانوایە ئەو سەردەمەی کە لەدوای مردنی پێغەمبەرەوە خۆی وەك سەردەمی دامەزراندن دەرخست ئەستەمە لەو شیکارییە مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئەنترۆپۆلۆژیی‌و فەلسەفییە قوتاری بێت بەو سیفەتەی کە ساتەوەختێکی مێژوویی دیاریکراوی کۆمەڵگەی حیجازە. لەڕاستیدا سەردەمی دامەزراندن کاریگەرییەکی گەورەی کۆمەڵایەتی‌و ئایدیۆلۆژی بەسەرەوەیە بەجۆرێك کە ئەگەر ڕێ لەتوێژینەوە زانستییەکەی بگیردرێت ئەوا بەردەوامبوونی دەبێتە هۆی بەئەبەدیکردن‌و بەشکۆکردنی. زانستەکانی مرۆڤناسی‌و کۆمەڵناسی ئاستێو دیدگەلێکی فراوان‌و دەوڵەمەندیان لەبەردەم هەریەك لەفیکری (هۆڤی یان بەهۆڤیبوو)و هۆشمەندی ئەفسانەیی‌و گوتاری ئاینییدا کردۆتەوە.

ئەم دیدگایانە لەزانستی پۆزەتیڤیزمی سەدەی نۆزدە ناچن سوکایەتی بەخونچەی دەلالەت‌و ماناکان بکەن بەڵکو لەبری ئەوە هەڵدەستن بەکردنەوەی دەرفەت‌و بوار دەڕەخسێنێت بۆ یەکخستنی کایەی مەعریفەو چاوخشاندنەوە بەو فاکتەرانەی بوونەتە هۆی بەرهەمهێنانی ئەو مەعریفە کۆنەی لەسیستەمە تیۆلۆژیی‌و فەلسەفییە کلاسیکی‌و وتەزاو جمرجۆڵەکانی کەوتوونەتەوە. بەم شێوەیە ئەوە بەدیدەکەین کە پێدەچێت خوێندنەوەی سەرلەنوێی قورئان شوێن‌و جێگەی ئەو زمانە ئاینییەمان بۆ دیارییکات کە بۆ هیچ شتێکی تر کورتناکرێتەوەو بگرە دەتوانێت توانای خۆی لەچوارچێوەی زانستی نوێشدا تاقیبکاتەوەو بیسەلمێنێت. جا لەو کاتەدا دەکرێت پرسیارگەلێکی نوێی وا پێشنیار بکەین کە بتوانن ڕۆڵی فرمانە ئەفسانەییەکە بگێڕن بۆ دیاردەکان‌و مێژوو نەك دژایەتیکردنێکی زۆرەملێیانەی ئەو ڕووە ئەفسانەییە لەڕێگەی عەقلانیەتە کراوەکەوە، بۆ نموونە لەو دەمەدا دەتوانین ئەم پرسیارە بکەین:– بۆچی ئەو زمانە ئایینییەی لەهەریەك لەقورئان‌و ئنجیل‌و تەوراتدا هەیە تەنها ئیمکانی بوونی لەکۆمەڵگەیەکدا هەیەو لەیەکێکی تردا نییەتی، یان لەڕەوشێکی مێژووییدا هەیە نەك ئەوانی تردا؟ ئەو هەلومەرجە هەستپێکراوو بەڵگەدارانە چین بۆ بوونی زمانێکی لەمجۆرە؟ ڕۆڵە کاریگەرەکانی لەکۆمەڵگە تازە پێگەیشتووەکاندا چین[23]؟

بەمجۆرە فیکری عەرەبی - ئیسلامی هەنوکەیی کایەی توێژینەوەیەکی نوێی لەمجۆرە دەکاتەوە، ئەویش بەپڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەستپێدەکات کە لەو عەقڵیەتە زانستییەی دابڕیوە کە هەموو ژیاری نوێی گرتۆتەوە.

## دیاردەی ئیسلامگەریی

وەك چۆن پێشتر هەندێکیان هەوڵیاندا جیاوازی بکەنە نێوان دیاردەی تەوراتی‌و ئینجیلی لەلایەك‌و دیاردەی جوولەکەو مەسیح لەلایەکی ترەوە، ئێمەش لێرەدا هەوڵدەدەین جیاوازی بکەین لەنێوان دیاردەی قورئانی‌و دیاردەی ئیسلامگەرییەوە[24]. ئەگەر ئەم مەسەلەی جیاکردنەوەیە پێشتر لەسەر دەستی زانایانی لاهوتی ئەنجامدرابێت کە تەنها بایەخیان بەپاراستنی بنەماکانی ئیمان داوە، ئەوا ئێمە لەڕێگەی چەند ئیعتبارێکی بابەتییەوە بەڵگەی تایبەت بەم کارەمان دێنینەوە. بەڵام ئەمە بەهیچ جۆرێکیش ناکاتە ئەوەی کە قورئان لەهەموو مەرجە مێژوویی‌و سۆسیۆلۆجییەکانی دوور بخەینەوە بۆ خاتری ئەوەی پێیەکی زیاتر لەسەر لایەنە باڵاییەکەی دابگرین. ئێمە وای بۆ دەچین کە دیاردەی قورئانی جیایە لە دیادەی ئیسلامگەریی ئەویش بەهۆی ئەو هۆکارە زمانەوانی‌و سیمیائی‌و مێژووییانەی کە دەستیان هەیە لەسەرهەڵدانیدا.

لەڕووی زمانەوانییەوە: زۆر بەئاسانی ئەوە دەبینین کە گوتاری قورئانی جیاوازە لەهەموو گوتارێکی تری زمانی عەرەبی. لێرەدا کە باس لەجیاوازی دەکەین مەبەستمان لەو باڵادەستییە نییە کە تیۆرەی ئیعجاز[25] پێی لەسەر داگرتووە، بەڵکو زیاتر مەبەستمان لەو دەرهاویشتە فۆرماڵی‌و ڕێزمانی‌و مەعنەوی‌و ڕەوانبێژی‌و ئسلوبی‌و ئیقاعییەیە کە تایبەتن بەقورئان‌و دەکرێت لەڕووی عەمەلییەوە دەسنیشان بکرێن‌و کەشفبکرێن. لەڕاستیدا مەجاز ڕۆڵێکی بەرچاوو یەکلاکەرەوە دەگێڕێت لەپێکهێنانی سەرتاپا گوتاری قورئاندا. مەجاز دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ گۆڕینی ئاراستەی ئەو ڕووداوە ئەنترۆلۆژییە ڕۆتینیانە بەرەو مەلکشان‌و بەرزکردنەوەیان لەپێناو بەئەفسانەکردن‌و سیمۆلیزەکردنی کەشی ئەو هۆشیارییە ئایینییە نوێیەی کە مەبەستە دابمەزرێنرێت‌و بسەپێنرێت (= خولقاندنی سەرمایە ڕەمزییەکەی ئیسلام).

لەڕووی سیمائییەوە: گوتاری قورئانی بەگشتی پێکهاتووە لەمێلکارییەکی دیاریکراو لەگەیاندن (واتە تۆڕێکە لەپەیوەندی بەردەوام‌و گەیاندنی دیاریکراو).
لەم مێلکارییەدا وەزیفە باڵاکان لەلایەن بکەر خۆیەوە پیادە دەکرێن: واتە لەلایەن خواوەندەوە. خواوەند بەبەردەوامی ئەوانە دەکات بەدوو بەشەوە کە پێغەمبەری بۆ ناردوون؛ باوەڕدارو کافر، ئەم کردەی گەیاندنەش لەڕێگەی ناوەندێکەوە ئەنجامدەدرێت کە لەیەك کاتدا خاوەن پێگەیەکی دیارو سەلبیشە(واتە تەنها وەردەگری) کە ئەویش: محەممەدە. ئەم کەسە گەیەنەرێکی وەحییەو هیچی تر.

لەڕووی مێژووییەوە: تێبینی دەکەین ئایەتە قورئانییەکان بۆ ماوەی بیست ساڵ هاوشانی کردە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیرییەکانی پێغەمبەر بوون. لەو کاتە کە پێغەمبەر تیایدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو هەستپێکراو خەریکی بەجێگەیاندنی کارو ئامانجەکانی پرۆژەکەی بوو لەو کاتەدا قورئان بەرگی بەپیرۆزکردنی دەکردە بەری ئەو کارو بەسەرهاتانە لەڕێگەی بەستنەوەیان بەموتڵەقی باڵاو ئیرادەی غەیبانی یەزدانەوە. بەمجۆرە هەرچی مێژوو و ناوی شوێن‌و ناوداران‌و ڕووداوە تاکەکانە لەئایەتەکاندا سڕدراونەتەوە بۆ ئەوەی سیفەتی مێژووییان لێدامالرێت‌و داوا لە "هۆش" کراوە، کە پێی دەگوترێت دڵ یان کرۆك یان عەقڵ‌و هەست، کە

هەموو شتێکی ئەم جیهانە بەزۆر ببەستێتەوە بە ئەفرێنەری مەزنەوە[26] . قورئان هۆشیارییەکی تایبەت بەجیهانو مێژوو دەلالەتەوە دەخولقێنێت، هەر لەبەر ئەمەشە دەبینین دواترو بەدرێژایی سەدەکان تێگەیشتنو گوزارشتەکانی باوەڕداران بەرامبەر بەجیهان مەرجدار دەبێت.

بەلام ئەوەی تایبەتە بەدیاردەی ئیسلامگەرییەوە مەسەلەیەکی جیاوازە. دوابەدوای مردنی پێغەمبەر گوتاری قورئانی لەڕۆڵی خۆی کەوتو ئەو هێزە ڕێکخەرو دروستکەرە نەمایەوە تا هۆشیارییەك لەدۆخێکی هەڵقولاندا لەنێو ڕووداوەکانەوە لەلایەن کۆمەڵی "باوەڕداران"ەوە بچەسپێنێت. وردە وردە ئەم گوتارە دەبێتە شوێنێك (یان فەزایەك)ی جێگیرو نەگۆڕ بۆ ئەوەی شتی تێفڕێبدرێت(إسقاط) یان دەبێتە چاوگو مەرجەعێكو پشتی پێدەبەسترێت. تەنانەت ئەم گوتارە وایلێهاتووە بۆ دیاریکردنی هەموو پێوەرە سیمانتیو ئەخلاقیو سیاسیو سرووتیو قەزائییەکانیش پێوەی پەیوەست دەبنو بۆی دەگەڕێنەوە، ئەو پێوەرانەی لەئێستا بەدواوە دەبێت ئاڕاستەی فیکرو مومارەسەی هەموو موسوڵمانێك دیاریبکات. بەڵام دواترو لەسەردەمێکی جیاواز ترو لەیەك کاتدا هەموو ئەو جۆرە وێناو چەمكو فیکرانەی تێفڕێدراوە کە لەناوەندە کۆسمۆپۆلیتیەکانی سەنتەرە شارییە نوێکاندا (دیمەشق، بەغدا، بەسرە، هتد...)دەرکەوتوون. من پێموایە مەسەلەی گواستنەوە لەدیاردەی قورئانییەوە بۆ دیاردەی ئیسلامگەریی لەسەر دوو ئاستی جیاوازو پێکەوە بەستراو ڕوودەدات:-

1- لەسەر ئاستی دەوڵەتو دامەزراوەکان یان کردەی تواندنەوەو دەمجکردنی ئایدیۆلۆژیانەی کۆمەڵەو کۆمەڵگەکان ( دەمجی ئەمانە لەناو بۆتەی ئوممەی ئیسلام یان ئیمپراتۆریەتی ئیسلامدا).

2- لەسەر ئاستی دەسکەوتە عەقایدیو رۆشنبیرییەکانو ئاستە سایکۆلۆژییە تاکەکەسیو کۆییەکان. لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئیسلام فاکتەرێکە بۆ گۆڕینو ئاڵوگۆڕ، بەلام ئەو وەك خۆی لەڕێگەی چەند فاکتەرو شتگەلێکی دەرەوەی خۆیەوە دێتە گۆڕین. چەندێکیش لەسەرچاوە سەرەتاییەکەی خۆی دووركەوتبێتەوە ئەوەندە سۆزی گەڕانەوە بۆ بێگەردییە لەدەستچووەکەی زیدەتر بووەو لەگەڵیدا ساتەوەختە مێژووییە سەرەتاییەکەش بەهەمان ئەندازە گۆڕاوە بۆ ساتەوەختێکی ئەفسانەیی سیخناخ بەهەموو ئەو بەها راستەقینەو ئامرازە ئەکتیڤانە بۆ رزگاربوونی لەو دونیا[27]. دیارە دەوڵەتو دامەزراوە رەسمییەکان بەشێوەیەکی زیاتر ناسراون چونکە هەر زۆر زوو سەرنجی مێژووناسە موسوڵمانەکانی بەلای خۆیدا راکێشاوەو بۆتە بابەتێکی سەرەکی بۆ خوێندنەوەی بلاوکراوە سالانەییەکانو مێژووی ڕووداوەکان لای رۆژهەلاتناسەکان. لەم چەشنە نووسینانەدا باس لەحوکمو فەرمانڕەوایی ئەو سولالەو فەرمانڕەوا یەکبەدوای‌یەکانە کراوە کە "ئیسلام"یان کردۆتە بەهانەو پەردەپۆشێك (واتە بەرگێکی شەرعی کردۆتە بەر دەسەلاتەکە). بەم شێوەیە بیرۆکەی هاوکاریو پەیوەندی نێوان دەسەلاتی سیاسیو ئایین بلاوبۆوە. مێژوونووسانیش تەنها لەڕوانگەی ئەم دوو ترۆپکەوە سەیری مێژوویان کردووەو نووسیویانەتەوەو بەمەش دیدگا رەسمییەکەیان بەهێز کردووەو هەموو ئەو پانتاییانەی کە نەچوونەتە ژێر رکێفی دەسەلاتە رەسمییەکەوە لەهەر کۆمەڵگەیەکدا بێت فڕێیان داوەتە ناو بازنەی لەبیرچوونەوەو فەرامۆشیانکردووە. لەبەرئەوە ئەمڕۆ ئەوە بەپێویست دەزانین کە ئەو مێژووانەی پەیوەندییان بەدیاردەی ئیسلامگەرییەوە هەیە سەرلەنوێ بنووسرێنەوە ئەویش لەمیانەی دروستکردنی

هاوئاهەنگیو پەیوەندی لەنێوان ئەو میتۆدە مێژووییەی کە بایەخ بە لێتوێژینەوەی گۆڕانو ئاڵوگۆڕ بەپێی زەمەن دەدات لەگەڵ ئەو میتۆدە ئەنترۆپۆلۆژییەی گرنگی بە لێتوێژینەوەی بونیاد[28] دەدات لەساتەوەختێکی جێگیرو دیاریکراودا.

ئەوەندەی پەیوەندی بەمەغریبی گەورەوە هەیە، سەیردەکەین ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی لەمەغریبو تونسدا جۆرێك لەبەردەوامی بەخۆوە دیبێت، ئەوا مەسەلەکە لەجەزائیر بەجۆرێکی ترە. دەتوانین بڵێین کە ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە لەهەموو شوێنو جێگەکاندا هەر بەشلۆقی ماوەتەوەو بەردەوام جێگەی هەڕەشە بووە لەلایەن ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی کە ناچنە ژێر رکێفی دەسەڵاتە رەسمییەکەوە، لەکاتێکدا ئەم هێزانە هەتاوەکو سەدەی نۆزدەهەمیش بەشێکی گەورەیان لەجەستە هەمەکییەکەی کۆمەڵگە پێکهێناوە. هەروەها دەوڵەت هەرگیز لەسەرپرۆژەی دەمجکردنو تواندنەوەی سەرلەبەری دانیشتووان پاشگەز نەبۆتەوەو ئەمەشی لەرێگەی ئەم سێ هێزەی خوارەوە ئەنجامداوە- نووسین وەك جیاکردنەوەیەکی لەکەلتوورە شەفەوییەکەی کۆمەڵگە خێلەکییە کەرتبووەکان، لەگەڵ ئەو فەرهەنگە شارییەی کە پیاوانی ئایینی بۆ جیاکردنەوە لەفەرهەنگی میللی بەرهەمیانهێنا، لەگەڵ ئەو ئەرسەتۆکسە ئایینییەی کە زاناکان لەدژی بیروباوەڕی هەرتەقی دروستیان کرد. بەڵام هەتا هاتنی سەردەمی سەربەخۆییش سەرجەم رایەڵەو پەیوەندییە خێڵەکیو فەرهەنگیو نەریتە ناوچەییەکانو ئەو بیروباوەڕانەی لەپێش ئیسلامەوە هەبوون بەرهەڵستی ئەو هێزە رەسمیانەیان دەکرد کە دەیانویست قووتیان بدەنو بیانتوێننەوەو دەمجیان بکەن بەخۆیانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە بەشدارییان کردووە لەپێکهێنانی ئەوەی کە بەگشتی پێی دەڵێن شارستانییەتی ئیسلامی[29].

خۆ وەنەبێت ئاستو (لایەنە) عەقائیدیو فەرهەنگیو سایکۆلۆژییەکانیش کەشف نەکرابن بەڵام بەهۆی گریمانەکانی مێژووی رەسمیو فیکری رەسمییەوەیە. زیاتر وابا و بووە بایەخ بەو کەسایەتییە بەناوبانگو نووسراوە مەزنانە بدرێت کە وەڵامیان بەپێداویستییەکانی نوخبەی سیاسیو ئابووریی داوەتەوە، لەکاتێکدا ئەمانە زۆرجارو لەناو هەموو کتێبەکاندا خۆیان دووبارە دەکەنەوە. بەم شێوەیە دەبینین مێژوویەکی شکۆدارو ئایدیالیو تایبەتمەند خولقاو رۆجیە گارودی لەدوای گۆستاف لوبۆنەوە نموونەیەکی پێشکەش بەم مێژووە کردو سەرکەوتنی بەدەستهێناو ئەمەش لەلایەن جەماوەری موسوڵمانەوە مانای خۆی هەیە.

هەریەك لە ڕووە ئایدیۆلۆژییەکەی ئەم سەرکەوتنەو ئەو فشارەی دەیخاتە سەرمان ناچارمان دەکات بەوەی کە ئەمڕۆ لەهەموو کاتەکانی رابوردوو زیاتر جیاوازی بکەین لەنێوان ئەو حەقیقەتەی کە فیکری زانستی کردوویەتیە ئامانجی خۆی لەگەڵ ئەو حەقیقەتە سایکولۆژی- کۆمەڵایەتییەی کە بزاڤە جەماوەرییەکان بەزۆری زۆردارەکی دەیسەپێنن[30]. هەموو کۆمەڵگەیەك دەست لەرابوردووی خۆی پاندەکاتەوەو خوازیاری یارمەتییە لێی بۆ ئەو ململانێیە ئایدیۆلۆژییانەی کە لەدەمی ئێستادا هەیەتیو تیایدا دەژی. ئەو مەترسیەشی کە هەڕەشە لەکۆمەڵگە عەرەبیو ئیسلامییە هاوچەرخەکان دەکات خۆی لەوەدا شاردۆتەوە کەبوارێکی زۆر کەم دەدرێتە ئەو رەخنە فەلسەفیو زانستییەی کە پێی لەسەر ئەو هێزو کارو میکانیزمە جۆربەجۆرانە داگرتووە کە قەدەرە مێژووییەکەی ئاڕاستەی دەکات[31]. پێداگریی زۆر لەسەر بوونی عەقڵانیەتێکی خاوەن گەوهەری ئیلاهی بەشێوەیەکی بەردەوام مێژووی ئیسلام ئاڕاستەو دەوڵەمەند دەکاتو لەپاڵیدا ئەو خەیاڵە دەستەجەمعییە فراوان دەکات کە وێنا

ئایدیالیە دوویارەبووەکان بەجۆرێك چەشەی دەکەن کە لەگوتارە خرۆشێنەرو جۆشدەرەکان دەربازی نابێت. مەبەستم لەمە ئامۆژگاری مزگەوتەکان‌و کۆنگرە گشتییەکان‌و وتارەکانی ناو رۆژنامەو گۆڤارو گوتارە رەسمی‌و نووسینە دووپووەکانی نووسەرە رۆژئاواییەکانە کە چەند مەبەستێکی جۆراوجۆریان هەیە...

مەسەلەی خەیاڵ یان خەیاڵدان هێشتا ئەو شوێنەی نەدۆزیوەتەوە کەشایەنیەتی بۆ وەسفکردن‌و توێژینەوەی مێژووی فیکری ئیسلامی. ئەو بەکارهێنانە زۆر تایبەتەی ئەم وشەیە (واتە خەیاڵدان) کە هنری کۆرپان بەسەر فیکری ئێرانیدا پیادەی کردو بووە خەسڵەتێك‌و تیایدا سەرنجی خستە سەر رەهەندێکی سەرەکی لەهەموو فەرمەنگو کۆمەڵگەیەکدا[32]. لێرەدا ناخوازین بگەڕێینەوە بۆ ئیشکالیەتێکی فەلسەفیانەی قەبە کە هێشتا لەبەردەم مشتومڕدا کراوەیە. تەنها ئەوەندە دەڵێین کە ئەو خەیاڵەی لێرەدا مەبەستمانە دەچێتە ناو پێکهاتە کۆمەلایەتییە مێژوورییەکەوە بەگشتی[33].

خەیاڵ نە لەجیهانە خەیالییەکەی ( فەلسەفەی رۆژهەلاتی)دا قەتیس دەکرێت‌و نە بەو "خەیاڵدان"ەش کە عەقڵی کلاسیکی چالاك لەکایەی مەسیحیەت‌و ئیسلامی سوننیدا دووریخستەوە[34]. هەردوو لە جۆرج دۆبی‌و کاستریادس رۆڵی خەیاڵ، "یان خەیاڵدان"یان دەرخست لەدامەزراندنی سیستەم‌و دیدگایەکی دیاریکراودا کە وەك چیمەنتۆیەکی کۆنکرێتی دەبێتە هۆی پێکەوە بەستنی گروپێك یان میللەتێك یان گەلێك، یەکەمیان (واتە جۆرج دۆبی) تایبەتە بەچاخەکانی ناوەڕاست‌و دووەمیان (کاستریادس) دەربارەی کۆمەڵگە مۆدێرنەکانە. خەیاڵ هەموو ئەو وێناو دەلالەتانەی پێدەگات کە مێشك سەرگەرمدەکەن، لەکاتێکدا ئەمانە شتگەلێکی هەستپێکراوو واقیعیش نین‌و شێوازێکی عەقڵیانەی رێکخراویشیان نییە، ئەوەندە هەیە خەیاڵ زۆر لە واقیع واقیعیانەتر دەردەکەوێت چونکە بزوێنەری گشت هەڵسوکەوتەکانی تاك‌و کۆمەڵە[35].

فیکری تیۆلۆجی‌و فەلسەفی کلاسیکی لەمەسیحیەتدا، هەروەك لەئیسلامدا، کایەیەکی دیاریکراوی بۆ هەموو ئەو شتانە هێنابووە گۆڕێ کە دەشێت بیریان لێبکرێتەوە تاوەکو بتوانن رۆڵی خۆیان بەپێی ئەم دووالیزمە سادەو دژیەیەکانە بگێڕن: خێر/ شەڕ، راست/ هەڵە، عەقلانی/ ناعەقلانی، جوان/ ناشرین، باوەڕدار/ بێباوەڕ، ئەرسەدۆکس/ بیدعە، هتد... بەمجۆرە چەند وتەزایەکی جەوهەرگەریانە پێکهات‌و خەڵکی بۆ ماوەیەکی درێژ وایاندەزانی کە ئەم وتەزایانە دوادەسکەوتی عەقلانیەتن، لەکاتێکدا ئەمانە زۆر بەتوندی پەیوەستن بەخەیاڵەوە. هەربۆیە پێویستە چاو بەهەموو زانستە ئایینییەکانی ناو ئیسلامدا بخشێنرێتەوە لەچوارچێوەی ئەم ئاقارە بۆ ئەوەی کاتی سەرهەڵدان‌و شوێنیان نیشانبدەین. ئەمەش ئەو پرۆژەیەیە کە من تێیچووم ئەو کاتەی قسەم لەسەر "رەخنەی عەقڵی ئیسلامی" کرد[36].

با لەنموونە فرە دەوڵەمەندەکەی ژیاننامەی پێغەمبەر رابمێنین‌و وردبینەوە. یەکێك لەو ژیاننامە کۆنانەی بەدەستمان گەیشتووە ئەوەی ئیبن ئیسحاقە (*150* ك / *767*ز مردووە) کە لەلایەن ئیبن هیشامەوە (*218*ك / *833*ز مردووە) نووسراوەتەوەو راستکراوەتەوە. پرۆسەی دروستکردنی وێنە رەمزیی‌و بەپیرۆزکراوە ئایدیالییەکەی محەممەد بەدرێژایی زیاتر لەسەدەیەك‌و لەنێو ناوەندی باوەڕداران‌و لەژێر کاریگەریی چەند فاکتەرێك‌و بەگوێرەی میتۆدە رۆشنبیرییە دارەکییەکان بەردەوامبوو. ئەم گواستنەوەیە بۆ کەلتورێکی نووسراوە لەسەر دەستی ئیبن ئیسحاق هەموو

شوێنەوارەکانی کەلتورە شەفەوییەکەی لەو ژیاننامەیەدا نەسڕیوەتەوەو پێوەی دیارە. بەڵام دەبێت ئەوەش بگوترێت کە ئەم گواستنەوەیە قۆناغێکی نوێیە لەپەیوەندی موسوڵمانەکان بەسەردەمی دامەزراندنەوە. دواتر دەبینین ئیبن هیشام پەیڕەوی جۆرێك لە "ضبط التأريخي" کردووە بۆ حیکایەتو ریوایەتەکان کە ئەوانەی پێش خۆیان گوێیان پێنەداوە. بەڵام سەرجەم چیرۆكو شایەتیەکان لەژێر رکێفی میکانیزمەکانی بەرهەمهێنانی ئەو مانایەدان کە تایبەتن بە گێڕانەوەوە زیاتر لەوەی پابەندبن بە ڕێساکانی نووسینی مێژووەوە زیادەڕەوی لەخەیاڵی میللیدا لەڕووی دەلالەتو حەقیقەتەوە هیچ جیاواز نییە لەو رەگەزانەی کە لەدیدگای نوێمانەوە بۆ مەعریفە پێیان دەڵێین "مێژووگەریی". هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خەڵکی ئەو سەردەمە - تەنانەت زۆر لە تەقلیدییەکانی هاوچەرخیشمان - پەییان بەجیاوازی نێوان ئەفسانەو مێژوو نەبردووە. مێژوونووسی پۆزەتیڤیست (= رۆژهەڵاتناس) لەسەدەی نۆزدەهەمدا ژیاننامەی پێغەمبەری خوێندۆتەوە دوای ئەوەی هەرچی ویستووە بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژو لەچوارچێوەی حوکمە زۆردارەکیەکەی لایبردووە لەژێر بیانووی ئەوەی ئەو پێی دەڵێت "خورافات". بەمجۆرە ژیاننامەیەکی "زانستی" لەبارەی پێغەمبەرەوە نووسیوە، واتە ژیاننامەیەکی دوور لەگومانو پاکژ لەهەموو ئاوەژووکردنەوەیەکی واقیعو بەدەر لەهەموو جۆرە بەرزکردنەوەو هەڵکشانێك..

بەڵام ئەم بەبەرزڕاگرتنو بەپیرۆزکردنە هەتا ئەمڕۆش لەکوانووی خەیاڵی دەستەجەمعیانەی ئیسلامیدا دەژیو بەردەوامە. بەڵام لەڕاستیدا ئەم بەشە "خورافی"یە لەژیاننامەی پێغەمبەر زۆر بەکەڵكو پڕ بایەخە ئەگەر بمانەوێت توێژینەوە لەمەڕ سەرهەڵدانە مێژوویی و سایکۆلۆژیەکەی هۆشیاری ئیسلامی بکەین. لەجیاتی ئەوەی خۆمان سەرقاڵی ئەو دژایەتییە ئەزۆکەی نێوان مێژووی پۆزەتیڤیزمیو ئیختزالی لەلایەكو کۆمەڵە عەقائیدێکی میللیو هاتوهاوارو موبالەغە بکەین لەلایەکی ترەوە کە لەهەموو راستییەکی خۆی بەتاڵکراوەتەوە، ئەوا دەکرێت لەمڕۆدا کایەی مەعریفی یەکبخەین لەڕێگەی سەرلەنوێ خوێندنەوەی ژیاننامەی محەممەد یان عەلی یان مەهدی یان پیاوچاکانو وەلیەکانەوە، ئەویش لەچوارچێوەی ئەم سێ ئاڕاستەیەدا:

1- سەرچاوەی دەروونیو کۆمەلایەتیو فەرهەنگیی خەیاڵی ئیسلامی باو. پاشان ئەرکەکانی ئەو خەیاڵەو ئاستی بەرهەمهێنانی[37]. مەبەستم لە "بەرهەمهێنان" ئەو هێزە جۆشدەرو بزوێنەرەی وێنا گۆییەکانە لەناو بزاڤە مێژووییە مەزنەکانی وەك شۆڕشی عەباسی یان بزاڤی ئیخوان موسلمینی ئەمڕۆ یان "شۆڕشی ئیسلامی" لەئێران...

2- هونەری گێڕانەوە یان شێوازی گێڕانەوە کەوەك پێگەیەك "یان ئامرازێك" وەرگیراوە بۆ بەرهەمهێنانی هەموو دەلالەتێك کەخەیاڵ بەشێوەیەکی تایبەتی بەهێزدەکات( مەبەستم لەسیمیائیەتی گێڕانەوەو دەرهێنانی شانۆیی حیکایەتو چنینی ڕووداوە واقیعییەکانە بەمەبەستی پێکهێنانی دیدگایەکی دیاریکراو یاخود بۆ بەهێزکردنی هەندێك باوەڕو، بەرزو پیرۆزکردنی چەند بەهایەکی دیاریکراو یاخود گۆڕینی ڕووخساری رابوردوو لەپێناو ئەوەی بەسیستمێکی تازەی باوەڕەکانو مومارەساتە مێژووییەکانەوە گرێی بدەین. ژیاننامەی پێغەمبەر دوای قورئان ئەمەی بەرامبەر بەجاهیلیەت کرد).

3- ئەو هەلومەرجە مێژوویی و فەرهەنگییەی دەستیان هەیە لە ئاڵوگۆڕپێکردنی خەیاڵێکی دەستەجەمعی دیاریکراوو گۆڕینی. لەمەدا مەبەستم لەپرۆسەی پەرینەوەیە لەقۆناغی "خورافە" یان

"ئەفسانە" یان رێورەسمو سرووتەوە بۆ قۆناغی مێژوو لەگەڵ مانای ئەو پەرینەوەیەو شەرعیەتەکەی. مەبەستم لەپەرینەوەیە لەو قۆناغەی کە خورافە وەك مێژووی راستەقینە وابوو بۆ ئەو مێژووە راستەقینەیەی کە هەبووەو زانراوەو وەك ئایدیۆلۆژیایەك دەرکەوتووە. هەوڵدەدەین لەم خاڵەی دواییەوە ئاماژە بۆ رەوشی ئێستای کۆمەڵگە ئیسلامییەکانو فیکری ئیسلامی بکەین[38].

### ئەزموونی مرۆڤدۆستی "هیومانیزم"

دوو هۆکار واملێدەکەن قسە لەسەر ئەزموونی هیومانیزم بکەم تاوەکو چاکتر ئیسلام لەناو مێژوودا دابنرێت. هۆکاری یەکەمیان ئەوەیە ئەم ئەزموونە لەلایەن خودی فیکری عەرەبی ئیسلامی خۆیەوە لەبیرکراوەو فەرامۆشکراوە، لەو کاتەوەی کە کاردانەوەیەکی سونی لەسەدەی پێنجەمی زایینییەوە روویدا ( مەبەست لەو پەرچەکردارەیە لەدژی موعتەزیلەو فەیلەسووفەکانو هەموو تەوژمە فەلسەفییەکانی سەردەمی متەوەکیلو قادر روویدا). ئەم ئەزموونە نەك هەر بەتەنها لەبیرکراوە بەڵکو لەدوو لاشەوە نکۆڵیلێکراوەو رەتکراوەتەوە، یەکێك لەوانە لەلایەن ئەو رۆژهەڵاتناسانەی کەلەگەڵ ئەوەدا نین بەرگێکی هیومانی لەو جۆرەی رۆژئاوا بکرێتە بەر ئیسلام کەلەهەردوو سەدەی شازدەو حەفدەدا بەخۆیەوە دی بەڵکو وایدادەنێن کەئەم ئەزموونە تەنها تایبەتە بەرۆژئاواو بەس ( جگە لەهیومانیزمی رۆژئاوا هیچ جۆرە تەوژمێکی هیومانی تر نییە).ئەوی تریشیان لەلایەن باڵی ئوسوڵگەریی ئیسلامی هاوچەرخەوە رەفزکراوەتەوە بەو دەلیلەی ئەم باڵە دەیەوێت قورسایی بخاتە سەر بنەما ئیلاهییە روتەکەی پەیامی ئیسلامەوە. هەرچی هۆکاری دووەمیشیانە سەرچاوەگرتووی مەسەلەیەکی فەلسەفییە. ئەو سەرکەوتنە تەکنەلۆژییەی رۆژئاوا گوتاری هیومانیو تەوژمی هیومانیزمی کردە شتێکی پەراوێزییو مایەپووچ. مرۆڤیش وەك خواوەند مردو[39] هیچ پێگەیەك لەگۆرەپانەکەدا نەمایەوە جگە لەئیرادەگەلی هێزە دەستەجەمعییەکانو ستراتیژەکانی کۆنترۆڵکردن نەبێت ئەویش لەرێگەی پێشخستنی تەکنیكو ئاستی بەرهەمهێنانی ئابوورییەوە.لەبەرئەوە سەرلەنوێ تێرامانەوە بە ئەزموونی هیومانیدا بۆ فیکری هاوچەرخ مەسەلەیەکی پێویستە تاوەکو بتوانین خۆمان لەهەردوو ئەو رەفزە رابپسکێنینو قوتار بکەین.

لەسالانی نێوان (236- 442ك/ 850- 1050ز)دا ناوچەکانی عێراق - ئێران لەرۆژهەڵاتو ناوچەی ئەندەلووس لەرۆژئاوا فەرهەنگو ژیارێکی نوێو کراوەو داهێنەرانەی بەجوانترین مانای وشە بەخۆوە دی. لەو دەمەدا هەموو لقەکانی مەعریفە پەرەیانسەندو چەند بیریارێکی کارامەی هەست بەرز کرانەوە بەسەر چەندین کەلەپوری فیکری جۆراوجۆری هیندیو ئێرانیو سریانیو یەهودیو مەسیحیو نەبتیو یۆنانیدا. زمانی عەرەبی لەوکاتەدا وەك ئامرازێکی هاوبەش بەکار دەهات. ئیسلام کە لەگەڵ یەهودیەتو مەسیحیەتدا کەوتبووە پێشبڕکێوە بەرەوی بەو چوارچێوە میتافیزیکیو دیدگا رۆحییە دەدا کەسنووری هەموو فەزا عەقڵییەکەی سەدەکانی ناوەڕاستیان داگیر کرد بوو. میتافیزیکیای تەوراتی کەقورئان بەشێوەیەکی نوێەن دایڕشتەوە پەرەیەکی فەلسەفیانەی گەورەی بەخۆوە دی ئەویش بەهۆی وەرگێڕانی چەند برگەیەك لەکتێبی "تساعیات"ی ئەفلۆتین بۆ عەرەبی لەژێر ناوی (أثولوجیا ارسطوطالیس). هەرچەندە لەڕاستیدا پەیوەندیشی بەئەرستۆوە نییە. بەم شێوەیە پەیوەندییەکی بەرفراوان لەنێوان رێنومایییە قورئانییەکانو فەلسەفەی ئەفلاتۆنی- ئەفلۆتینیو

ئەرستۆییدا پێکهات کەتائێستاش بەشێوەیەکی باش نەخوێندراونەتەوە. ئەو وەرگێڕانانەی (لەسەرەتای سەدەی سیازدەهەمەوە) راستەوخۆ لەزمانی یۆنانییەوە یاخود لەسریانییەوە کرانە عەرەبیو بەشێوەیەکی چاکو بەرچاو بڵاوبوونەوەو چەندین کتێبی سەنگینو رێکوپێکی بەشێوەی نووسینو راستەوخۆ بەزمانی عەرەبی لێبەرهەمهات. لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە باسی هەموو ئەو کەڵەناوانە بکەین کەبەشدارییان لەپێشخستنی بزاڤی هیومانیزمی عەرەبیدا کردووە، بەڵکو تەنها ناوی (جاحظ) (255ك/ 868ز مردووە) دەهێنین، کەلەیەك کاتدا بەهرەی داهێنانی ئەدەبیو بوێرییەکی عەقڵی لەکەسێتی خۆیدا کۆکردۆتەوەو پرۆسەی رەخنەی خستۆتە خزمەت ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێین بەتالکردنەوەی کەلتوری عەرەبی ئیسلامی لەئەفسون[40]، دوای ئەو بەسەدەیەك ئەلتەوحیدی (414ك/ 1023ز مردووە) هەمان پرۆژەی ژیاندەوەو قووڵیکردەوەو بەهەمان ئەندازەش دەسەڵاتی شکا بەسەر زمانی عەرەبیو عەقلانیەتە فەلسەفیو رووداوە سیاسیو رۆحانیەتیە ئیسلامیەکاندا. بەتەنیا ئەو تابلۆ زیندووانە بەسن کە لەرێیانەوە ژینگەی زاناو رۆشنبیرو پیاوە ئایینیو سیاسییەکانی سەردەمی حوکمڕانی بووەیهییەکانیان لەناوچەکانی ئێران- عێراقدا تیا وێنە کراوە وەك بەڵگەیەك لەبارەی دەرکەوتنی تەوژمێکی هیومانی عەرەبی. ئەلتەوحیدی یەکێکە لەو نووسەرو بیریارە دەگمەنو دانسقانەی کە بەناوی مرۆڤو لەپێناو مرۆڤدا راپەڕیونو یاخیبوون. ئەم رستە نوێیەی بەمانا هاوچەرخیەکەی وشەکە گوتووە "ان الأنسان أشكل عليه الأنسان". بەشێوەیەکی گشتی ئەو نەوەیەی کە بەنەوەی مەسکویەو ئەلتەوحیدی ( 340-400ك/ 951-1009ز) ناوی دێنم لوتکەی پێشکەوتنو بەرزیی فیکرێکی تاڕادەیەك کراوەو ئازادەو چەندین لێپرسراوی سیاسی مەزنی وەك (إبن العميد الأب والإبن والصاحب بن عباد وعضد الدولة) هانداو لەسەری رۆیشتن... گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن بووەیهییەکانەوە لەساڵی (334ك/ 946ز) بووە هۆی داماڵینی بەرگی شەرعیەت لەبەری خەلافەتی عەباسیو دامەزراندنی سیستمی دەرەناوەند (اللامركزيە)و بەدەستهێنانی جۆرێك لەعەلمانیەت لەژیانی سیاسیدا. ئەوەی هاوشانی هەموو ئەمانە رۆیشتە پێشەوە (عەقڵی ئەمن) بوو بەو سیفەتەی ئەم عەقڵە تاکە بەهرەیە کەبتوانێت مەعریفەیەکی راستو دروست بەرهەمبهێنێتو شەڕو ململانێ تایەفەگەرییەکان تێبپەڕێنێتو مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ئاشتکاتەوە(= حیکمەت)و لەناو گەردووندا دایبنێت (سەیری زانستەکانی گەردووناسیو فەلەكو جوگرافیاو مێژوو رووەکو ئاژەڵناسی بکە).

بەڵام زانستی مێژوو (نووسینی مێژوو) کەلێنێکی گرنگو پڕ بایەخە لەمەعریفەی عەرەبی- ئیسلامی، بەهاتنی مەسکویە (421ك/ 1030ز مردووە) قۆناغێکی شیکارییانەی گرنگی بڕیوەو دواتر ئیبن خەلدون (809ك/ 1406ز مردووە) هەستاوە بە بوژاندنەوەیو فراوانیکردووە. مەسکویە لەدژی ئەو شتانە دەجەنگا کەخۆی پێیدەگوت مێژووی ئافرەتە کەنەفتەکانو ئەفسانە هەڵخەڵەتێنەرەکان، پاشان جەختی لەسەر باڵادەستی رەخنەی سیاسیو شیکاریی ئابوری دەکردەوە. لەپاڵ ئەمانەدا هەوڵی ئازادکردنی هەردوو زانستی ئاکارناسیو سیاسەتی دەدا لەچنگ ئامۆژگارییەکانی گوتاری ئایینی پیاوسالار ئەویش لەپێناو سەپاندنی ئیشکالیەتە فەلسەفییەکەدا. ئیبن سینا (428ك/ 1037ز) کە هاوچەرخی ئەو بوو بەڵام لەو بچووکتر بوو پەرەی بەمجۆرە ئاراستانە دا ئەویش لەرێگەی گەڵاڵەکردنو هەڵچنینی پەیکەرێکی فەلسەفیانەی گەورەوە کەتیایدا خەیاڵی بەپیتی ئێرانیو فیکری وردو پڕ

سەلیقەی یۆنانی بەیەککەیشتن لەگەڵ ئەو دراوانەی لەسەرنج‌و تێبینی ڕۆژانەوە بەدەستهاتوون. هەروەها پێویستە جارێکی تریش ئاماژە بەپوختەگەلی تیۆلۆجیای موعتەزیلیانەی عەبدولجەبار (415ك/ 1025ن) و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەو مەعریفەو ڕەفتارەکانی ئیخوانولسەفاو، تیۆرگەلییە زمانەوانییە بەپیتەکانی ئیبن جونەی(393ك/ 1002ن)و ئیبن فارس (395ك/ 1004ن) و سیرافی (368ك/ 995ن)و خوارزمی (391ك/ 1000ن) و ئەو جوگرافیامرۆییە بدەین کە ئەندریە میکیل وەك گەنجینەیەك کەشفی کردووە[41].

لەکاتێکدا من ئەم ناوو نووسراوو داهێنانە مەزنانەی ئەو عەقڵە دێنمەوە یاد کەتێدەکۆشێت لەدژی ئەو کۆیلەیەتیەی دووچاری مرۆڤایەتی هاتووە، لەهەمانکاتدا دەمەوێت ئەوەش دەربخەم کەچۆن کەلتورێکی فەرهەنگی ماڵی خۆی وێران دەکات بەهۆی کۆمەڵێك پرۆسەی قرتاندن‌و لابردنەوە کەدژ بەخۆیەتی. بۆچی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان لەدوای سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە وردە وردە هەموو ئەو تەوژمە هیومانیانەی خەفەو لەبیر کردو کوشتنی کە پێشتر هاتبوونە ئاراوە؟ بۆچی لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا سەردەرهێنانێکی قەبەی ئیسلامێکی داخراوو دۆگماو دەمارگیرو ئەفسانەئامێز دەبینین؟ ئەمە ئەو پرسیارە گەورەو گرانەیە کەپسپۆڕو ئایدیۆلۆجیستە هەلپەرستەکان، ئەوانەی دنیایان قانگداوە بەچەنەبازییەکانیان لەبارەی "ئیسلام"ەوە، گوێی پێنادەن.

جا بۆ ئەوەی ڕوونتر ئەو وێنەیە ببینین، پێویستە پەیوەندییەکانی نێوان ئایین‌و کۆمەڵگە لەدوای سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە/ یازدەی زایینیەوە تەیبکەین‌و بیانپشکنین.

## ئایین‌و کۆمەڵگە

بێگومان پەیوەندییەکانی نێوان ئایین‌و کۆمەڵگە تەنها تایبەت نییە بە ئیسلامەوە، بەڵکو هەموو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان پێویستییان بەسیستمێك لەباوەڕو بەهاو زانین هەیە بۆ بەهانەهێنانەوە بۆ "سیستمەکەیان"و مسۆگەرکردنی شەرعیەت‌و پاراستنی. ئەوە ئایین بوو هەتاوەکو دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیا عەلمانییە نوێکان ئەم بەهانە هێنانەوەیەی بۆ سیستمەکە مسۆگەر دەکردو ئەم کارەش هەردەبوو ئەو بیکردایە. تائێستا توانیومانە ئەوە دەربخەین کە چۆن دیاردەی قورئانی‌و دیاردەی ئیسلامی ڕۆڵی خۆیان بینیوە وەك مۆدێلێك بۆ کاری مێژوویی‌و چاوگێك بۆ بزافە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان‌و زانایانی ئایینی. گشت قوتابخانە جۆراوجۆرەکان لەدوای سەدەی پێنجەمەوە بەردەوامبوون لەسەر بانگەشەی پابەندبوونیان بەو مۆدێلەوە(مۆدێلی ئیسلامی) بەڵام بەپشتبەستنیان بەدەقە "ڕێکوڕاست‌و ئەرسەدۆکسییەکان" دوای ئەوەی چەندین کاری بژێری‌و لابردن‌و هەڵوەشاندنەوەیان لەسەر ئەم دەقانە ئەنجامدا. یەکەمینیان قوتابخانە تیۆلۆجی‌و یاساییەکانی هەریەك لەسوننی‌و شیعی‌و خاریجی‌و مالیکی‌و حەنەفی‌و شافیعی‌و حەنبەلییە، کەزادەی ئەو شەڕو زۆرانبازییە سیاسی‌و باوەڕییەیە کە لەقۆناغی کلاسیکیەتدا ڕوویانداوە. ئەوە بوو دواتر سەر کۆشە نیگا ئایینیانەشیان چووە سەر کە جێگەی دەسەڵاتە ناوەندییە ڕووخاوەکانی گرتەوە. هەر قوتابخانەو هەر گۆشەنیگایەك لەڕێگەی بەرهەمهێنا ەوەی وتەو ڕێنومایییەکانی سە[illegible]رکردەی دامەزرێنەرەوە(=پێغەمبەر) بەشێوەیە[illegible] ڕووکەشی‌و سەرپێییانە پەرەی بەکەلتورە تایبەتەکەی خۆیدا. ئەمەش لەمیانەی ئامۆژگارییەکانی قوتابخانەی

سکولاستیکی ئیتباعیو ڕێوڕەسمە سەختو گرانەکانەوە ئەنجامدرا. هەر ئەمەش بووە هۆی سەرکەوتنی میتۆدیەتی سکولاستیکیو دروستبوونی موزایەدەیەك لەلاساییو چاولێکەریی[42] لەنێوان سەرانی گۆشەنیگا دژەکاندا، لەلایەن ئەوانەی لەپێناو پانوپۆڕکردنی ڕووبەری کۆنترۆڵی سیاسیاندا پەنادەبەنە بەر خولقاندنی وێنەیەکی بێگەردو ڕوونی ئەرسەدۆکسیەت، واتە وێنەیەکی تا بکرێت نزیکتر لەپەیامی قورئانیو ئەزموونی شاری مەدینە[43].

پێویستە وریابین لەلکاندنی ئەو شتە کتوپڕانە بەجەوهەری ئیسلامەوە بەو سیفەتەی ئاینێكو سیستمێکی عەقائیدییە. هەموو ئەم شتانە ئەو کەسانە دەیکەن کە هەمیشە بەشێوەیەکی پڕ لەتەمبەڵیو تەوەزەلی ئەم وتەیە دووبارە دەکەنەوە "دەرگای ئیجتهاد لەئیسلامدا داخراوە" لەلایەن سەروەرێکی ئاینی بالاوە کە نایناسینو نازانین کێیە. لەکاتێکدا ئاین تەنها فاکتەرێکە لەو فاکتەرە ئەکتیڤو کاریگەرانەی سەر ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگە مرۆییەکان. کەواتە پێویستە دابەشبوونی ئەو مێژانە لەبەرچاو بگرین کە لەدەسپێکی سەدەی پێنجەمەوە لەسەر گۆڕەپانەکە هەنو چارەنووسی دنیای ئیسلامیان ئاڕاستەو پێشەوایەتی کردووە. دیمان چۆن حەزو ئارەزووی دەوڵەتی خەلافەت بۆ یەکێتیو یەکبوون لەگەڵ هاتنی بووەیهییەکان بۆ سەر تەختی دەسەڵات نەماو کوژایەوە. هەرچی تورکە سەلجوقیەکانیشە تێکۆشان لەپێناو ئەرسەدۆکسیەتێکی سوننی مەزهەبدا بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ جۆرە پلەوپایەیەك بۆ خەلافەت بگێڕنەوە. هەرچی مەغۆلیشە دامەزراوەی خەلافەتیان بەیەکجاری هەڵوەشاندەوەو لەساڵی (*656*ك/ *1258*ز)دا سنوورێکیان بۆ داناو ئەو هاوسەنگییە شارنشینیە شلۆقەشیان تێکدا کە فەرهەنگی کلاسیکی پشتی پێبەستبوو. ڕۆژئاواش لەو کاتەدا لەهەوڵی دەسبەسەراگرتنی بازرگانی دەریاییدا بوو، پرۆسەی گەڕانەوەی ئیسپانیا لەلایەن مەسیحیەتەوە دەستیپێکرد، هەموو ئەمانە زەمینەیان بۆ داگیرکردنی کۆلۆنیالیزمیانە ڕەخساندو جیهانی ئیسلامی بەتەواوەتی دابڕیو بێهێزو زەلیلی کرد. هەر لەجەنگی یەکەمی خاچپەرستانەوە تاشەڕی نێوان عەرەب- ئیسرائیل، چەند پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بەدیدەکرێت لەنێوان ئەو هەڵکشانە بەرپێنەگیراوەی ڕۆژئاواو پاشەکشەی کۆمەڵگە ئیسلامییەکانو دواکەوتنیان. شتێکی ویژدانی نییە ئەگەر کاریگەری فاکتەرە ناوەکییەکان بەهەند وەرنەگرین لەم وەرچەرخانەدا، ئیبن خەلدون یەکێك بووە لەو بیریارە عەرەبە دەگمەنانەی چۆتە پاڵ ئەمجۆرە ئاقارانە لەڕەخنەگرتن. زۆر نووسراوی ڕەخنەیی هەمەجۆر لەدوای شکستی (*1967*)ەوە دەرچوون، بەڵام هیچیان گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە. ئەگەر چاوێك بگێڕین بەشێوەیەکی گشتی دەبینین هەتاوەکو جۆشو خرۆشی نەتەوەیی زیادی کردبێت ئەوەندە شیکردنەوەی ڕەخنەیی یاساغو قەدەغە بووە. ئەمە سەرباری ئەوەی لەئێستادا چەندین بابەتی گرنگو ئامادە هەنو چاوەڕوانی توێژینەوەو ڕەخنەن. بۆ نموونە ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بەسەردەمەکانی ڕابوردووەوە لەوانە وەك: مەسەلەی بوونی برێکی زۆروزەبەندی کۆیلە لەناو سوپا ئیسلامییەکانداو تەنانەت لەناو خودی پاسەوانانی خەلیفەشدا. یاخود بوونی بونیادێکی خزمخوازیو ئەو ڕەنگدانەوە سلبییەی لەسەر کۆمەڵگە هەیەتی وەك دەمارگیرییە کەلەشەقەکانو شتی تری لەمجۆرە. یان شوێنو پێگەی هەریەك لەئافرەتو منداڵ لەنێو کۆمەڵگەداو سیستمی پەروەردەو مەسەلەی ئاین وەك سیستمێك بۆ دیسپلینێکی کۆمەڵایەتی. ڕژێمی دەرەبەگایەتیو وەقفو ئەو دەسەڵاتە پیرۆزەی کە نابێت دەستی تێوەربدرێت یان پێشبڕکێ

خێڵەکییەکان‌و ئەو دژایەتییە زیندووەی نێوان شارو لادێنشین‌و کۆچەرییەکان. لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا، تا ئەو جێگەیەی پەیوەندی بەسەردەمی نوێوە هەیە وەك تەنگوچەڵەمەی مۆدێلەکانی گەشەی هاوردوو لەرۆژئاواوە، یان بابەتەکانی وەك ئایدیۆلۆژیا لاساییکەرەوە خەرەکییەکان‌و ئەو سیستەمەی ( یان ئەو دەوڵەتانەی) کە پەیوەندی‌و رایەڵەکانیان بەگەل‌و میللەتەوە نەماوەو لەناوچووە. یان ئەو گەلەی لەتاقی خۆدروستکردندایە ( دیارە بەمانا نوێیەکەی ) یان زیادبوونێکی لەئەندازەبەدەری ژمارەی دانیشتوان‌و ئابورییەکی وابەستە، هتد...

پێموایە دەکرێت لەڕوانگەی ئەم پێدراوە بەرچاوو هەمیشە فەرامۆشکراوانەوە وەزیفە راستەقینەکان بۆ ئیسلامی دوێنێ‌و ئەمڕۆ هەڵبسەنگێنرێتەوە. ئێمە لێرەدا هەوڵ بۆ هەلگێرانەوەیەکی سەرلەبەری ئەو میتۆدە دەدەین کە دەخوازێت هەموو دەرهاویشتەکانی بوونە کۆمەلایەتی‌و مێژووییەکە لەسۆنگەی ئایینەوە "راڤە" بکات. من نالێم دەبێت فاکتەری ئایینی لەهەموو کەرتەکانی کۆمەڵگەداو لەسەرجەم رەوشەکاندا بکەوێتە ژێر رکێفی فاکتەرە ئابوری‌و سیاسی‌و دیمۆگرافییەکانەوە بۆ ئەوەی هەموو پەرەسەندن‌و گۆڕانکاریی‌و رووداوەکانی بخوێنینەوە. هەمووومان ئەوە باش دەزانین کە چۆن مارکسیستەکان بەهۆی ئەو رۆڵە مەزنەی دیاردەی ئیسلامییەوە لەماوەی دە ساڵی رابوردوودا ناچار بوون چاو بەبیروباوەڕەکەیاندا بخشێننەوە. بەلام هێشتا شیکاریی سۆسیۆلۆجیانەی گەمەی فاکتەرە هەمەچەشن‌و ئالۆزەکان شتێکی مەبدەئی‌و راستەو پێویستە پێی هەستین پێش ئەوەی جۆری فاکتەرە سەرەکییەکەی ناو هەر کەرتێکی دیاریکراو یان وەرچەرخانێکی زەمەنی دیاریکراو دیاریبکەین[44].

شێوەی ئامادەیی‌و گرنگی ئیسلام هەمیشە بەگوێرەی گروپە ئەتنی‌و فەرهەنگییەکان‌و بەپێی ناوچەکان‌و رەوشە مێژووییەکە گۆڕاوە. ئەم ئامادەگییەش پشت دەبەستێت بەڕادەی دووری‌و نزیکی لەپایتەخت‌و دەسەلاتی ناوەندەوە یان بەبڵاوبوونەوەی تەنها ناوەندێك بۆ فێربوون یان بەهۆی بەناوبانگی مامۆستایەکی رۆحییەوە یاخود پشت بەڕادەو ئاستی بڵاوبوونەوەی ئەو نووسینە عەرەبییە دەبەستێت کە یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ ئەوەی لەفیکری کلاسیکی تێبگات یان بەڕادەی بەرەنگاربوونەوەو خۆڕاگریی دامەزراوەکان‌و رادەی ئامادەگی ئەو دابونەریت‌و فەرهەنگە ناوچەییانەی لەپێش ئیسلامەوە هەن یاخود رۆڵی مۆدێرنەو نوێگەریی‌و کاریگەرییەکانی لەدوای سەدەی نۆزدەهەمەوە یان فاکتەری دیمۆگرافیاو شێوازی حوکمڕانی‌و تەمنییە لەدوای ساڵی (*1950*)وە.

پێویستە لەناو ئەو هەڵچوون‌و حەماسەتە ئایینییە گەورانەی کە ئەوەی نوێی دوای ساڵی (*1950*) بەجۆشدێنن، ئەوفاکتەرانە جیابکەینەوە، هەرچەندە ئەمە کارێکی هەروا ئاسان نییە، ئەوانیش بریتین لە:

*1*) ئەو رەهەندە تەواو رۆحییەی بەندە بە قۆناغە پلەبەندییەکانی زوهدو ئەو پەیڕەوە ناوخۆییەی کە سۆفییەکان دەیلێنەوە.

2) ئەو رەهەندە کۆمەلایەتییەی گوزارشتە لەپێداویستییەك بۆ هاوکاری‌و دڵنیایی لەدوای داڕمانی سیستمی پارێزگاریکردنەوە، بەتایبەتی دوای لەناوچوونی یاسا بەناوبانگو بەهێزەکەی "ئابڕو" و "شەرەف".

*3*) ئەو رەهەندە سیاسییە خەباتگێڕەی لەهەوڵی گرتنە دەستی دەسەلاتدایە.

*4*) ئەو رەهەندە ئایدیۆلۆژییەی کە خاوەن سروشتێکی فراوانخوازی‌و پەلکێشانێکی بەگوڕو تینە ئەویش لەبەرئەوەی رووددەکاتە ئەو میللەتانەی کە لەزێدو ریشەی خۆیان هەلکێشراون زۆربەی جار

نەخوێندەوارن یان بێبەشن لەهەموو چەشنە دیدگایەکی مێژوویی بەڵام سەرباری ئەمەش لەهەوڵی جەختکردنەوەدان لەسەر ناسنامەی خۆیان لەچوارچێوەی کەش و هەوایەکی سیاسی و ئابوری بارگەکراو بەرۆژئاوا.

کەواتە ئێمە قەبارەی ئەو کارو فرمان و بەهاو فاکتەرانە دەپێوین کە لەلایەن هەندێك کەسەوە بە بەردەوامی تێکەڵ بەیەکتری دەکرێن و تەنها بەوەندەوە دەوەستن ناوی ئیسلام بهێنن و وا دەزانن بەیەکجار هەموو شتێکیان چارەسەرکردووە! دیومانە کە چۆن گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ خۆزگە بەو تێکەڵکردنە دەخوازێت و بەشێوەیەکی دۆگمایییانە ئەو وتەیە دەڵێتەوە کە ئیسلام ئایین و دەوڵەت و دنیایەو لەیەکتری جیاناکرێنەوە. ئەم دروشمە لەلای خەباتگێڕە خۆبەحیزبیزانەکان زۆر باوی هەیە، بەڵام هیچ کاتێك شیکارییەکی تیۆلۆجیانەی نوێی بۆ نەکراوە. فیکری ئیسلامی زیاتر لەگۆشە ئەخلاقی و یاساییەکەوە بایەخی بەم بابەتە داوە نەك لەڕووە تیۆلۆجیەکەیەوە[46]. نزیکبوونەوە تیۆلۆجیەکەی ئەم گرفتە لەمڕۆدا ڕوبەڕووی چەند بەرهەڵستییەکی جیددی بۆتەوە لەلایەن مێژوونووس و کۆمەڵناس و فەیلەسووفەکانەوە. پێمباشە لێرەدا هەندێك لەڕێگەکان ببڕین بەهیوای ئەوەی لەبەککاتدا هەم چاکسازی لەو دیدگایەدا بکەین کە ملکەچی ڕۆژئاوایەو، هەم ئەو ڕەفزکردنەوەیەی موسوڵمانانیش تێپەڕێنین و بچین بەرەو کردنەوەی دەرگاو دەروازەیەك بەڕووی ناوچەیەکی نوێی فیکردا.

جیاکردنەوەی کەنیسە لەدەوڵەت بەو شەڕانەشەوە کە لەنێوان عەلمانیەکان و پیاوانی ئایینیدا ڕوویاندا بەپلەی یەکەم گوزارشتە لەشەڕی نێوان دوو چەمك بۆ مەعریفەو ئەو کردە مێژووییەی کە لەگەڵیدا دێتەوەو دەگونجێت. لەم گۆشەنیگایەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو موسوڵمانانەی کردنەوەی ئەم دایەلۆگە ڕەتدەکەنەوە بەبیانووی ئەوەی گوایە ئەمە شتێکی تایبەتە بەڕۆژئاوا، ئەوا دەتوانم بڵێم کە ئەمانە بەمە گوزارشت لەبێدەسەلاتی خۆیان دەکەن لەبەردەم توێژینەوەی مێژووی خودی خۆیان و بیرکردنەوە لێی بەمانا پڕاوپڕەکەی ئەم وشەیە(بیرکردنەوەیە). ڕاستە کە ئەو ململانێ سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی بوونە هۆی جیاکردنەوەی ترۆپکی ئایین لەترۆپکی سیاسەت، خەسڵەتێکی تایبەتییان بەخشیوە بەکۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان. هەروەها پێویستە جیاوازییەکی باشیش بکرێت لەنێوان گرەوە فەلسەفیەکەی ئەم مەسەلەیە (مەبەستم لەو ڕێگەیانەیە کە دەگیرێنەبەر بۆ تێگەیشتن لەواقیع و شێوازەکانی و ئاستەکانی لەپاشان دەرخستنی ڕووە مێژووییەکەی هەموو کردەیەکی مەعریفی) لەگەڵ ئەو چارەسەرییە کردەوەییانەی کە سەرکەوتنی بۆرژوازییەتی سەرمایەداری و پیشەسازی بەسەر کڵێسادا سەپاندی. سەرکەوتنی بەها عەلمانییەکان و هەڵوێستی عەلمانیەت لەئەورووپادا تاڕادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکشانی بەرەوژووری بەردەوامی بۆرژوازیەت و هەژموونە ئابوری و سیاسییەکەی، بەڵام ئەمە لەئیسلامدا بەپێچەوانەوە ڕوویدا، چونکە ئەو بۆرژوازیەتە بازرگانییەی پاڵپشتی تەوژمە هیومانییەکەی کردووە، لەهەردوو سەدەی سیازدەو چواردەهەمدا تەنها بوونێکی زۆر سەرەتایی و کاتی هەبووە[46]. ئەو ڕێسا سەربازییەی لەوەختی بووەیهییەکانەوە هەموو بنەماڵە حوکمڕانە جۆراوجۆرەکان پشتیان پێدەبەست لەڕووی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەوە بیانی بوو. هەمیشە پەنابراوەتە بەر ئەو زانا ئایینیانەی کە بەهانەو پاساویان بۆ دەسەڵاتە دونیاییەکان هێناوەتەوە لەپێناو بەخشینی شەرعیەتێکی ئیسلامی بەو دەسەڵاتەی کە ڕەنگە لەڕێگەی زەبرو

داپڵۆسینیشەوە هاتبێتە سەر حوکم. لێرەدا نموونە لەسەر ڕۆڵی غەزالی دەهێنینەوە لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا، دواتریش باس لەئیبن تەیمیە دەکەین. هەڕەشە دەرەکیی و ناوخۆییەکان ڕۆڵێکی زیاتریان بەخشییە ئایین بۆ جۆشدان و بەرەنگاربوونەوە. ئەگەر "جیهاد" وەك نموونەیەك بێنینەوە لەهەریەك لەسەردەمەکانی شەڕی خاچپەرستان و ئیسپانیاو کۆلۆنیالیزمی نوێدا... بەمجۆرە ئایین بۆتە چنراوێك بۆ ناسنامە کۆییەکەو فەزایەك ( شوێنێك) بۆ ئەوەی هەموو هیواو ئاواتە تەبشیریی و ئەودنیاییەکانی فڕێبدرێتە ناو و ببێتە سیستمێك بۆ ئەو عەقیدەو زانیاریانەی کە لەگەڵ هەموو ئاستەکانی ڕۆشنبیریدا دەگونجێت. ئیسلام توانی لەڕێگەی ئەم کارو فرمانە جۆربەجۆرانەوە لەسەر شێوازی خۆی هەموو حەساسیاتی کۆیی بەدرێژایی ماوە سکولاستیکییە ئیتباعییەکە تۆمار بکات. شێوەکانی پەیبردن و وێناو چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی ئەو شتانەی کە لەم ماوەیەدا لەلایەن تیۆلۆجیای شەعبییەوە بڵاوکراونەتەوە لەمڕۆدا بوونەتە گەلێك کۆسپی گەورەی ئەبستمۆلۆژی کە تێپەڕاندنیان زۆر گرانە.

کەواتە ئێستا لەوە تێدەگەین کە نە ڕەوای حەقەو نە هیچ پاساوێکیش ئەوە قبوڵ دەکات لێپرسراویەتی جیابوونەوەی ئایین لەدەوڵەت بخەینە ئەستۆی قورئان، هەروەك چۆن ناتوانین جیاکاریی نێوان ئەم دووانە (واتە ئایین و دەوڵەت) لەڕۆژئاوادا بگەڕێنینەوە بۆ مەسیح. کارو کردەوە مێژووییەکانی مرۆڤ لەکۆمەڵگەداو ئەو ڕێبازو ڕێگەیەی بەدرێژایی مێژوو گیراوەتەبەر بۆ وەرگێڕانی پەیامە یەکەمینییەکان لێرەو لەوێ چەند چەمك و دامەزراوەیەکی جیاوازیان سەپاندووە. ئەو ڕۆڵەشی کە بۆرژوازیەتی ڕۆژئاوایی گێڕاویەتی شتێکی کاتی و ڕاگوزەرە. مێژوو ئەو دەرفەتەی نەداوەتێ کە وەك چینێکی نموونەیی وا دەربکەوێت کە پێویست بکات لەهەموو کات و شوێنێکدا لاسایی بکرێتەوە تاوەکو هەمان ئەو ئەزموونە دووبارە بکرێتەوە، تەنانەت وەك جەمسەرێکیش نییە بۆ حەقیقەتێکی بەرزکراوە کە دژایەتی حەقیقەتە ئایینییەکە بکات.

ئەو کێبڕکێیەی ساڵی (*1917*) لەنێوان بۆرژوازیەتی براوەو پرۆلیتاری شۆڕشگێڕدا ڕوویدا لەئێستادا مۆرکێکی کاتی و هەنووکەییمان لەگەورەترین فتوحاتەکانی مێژووی مرۆڤایەتی پیشاندەدات ( فتوحاتی بۆرژوازیەت). بەڵام ئایینە یەکتاپەرستەکان پێیانوایە دەتوانن لەم سەروبەندەدا، کەسەروبەندی قەیرانی ئایدیۆلۆژیا "نوێ"کانە دەسپێشخەرییەکەی خۆیان لەمێژوودا چنگ بکەوێتەوە بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی ریشەییانە چاو بەو سەرچاوەو پرەنسیپانەدا بخشێننەوە کە دەستیان هەیە لەدروستکردنیداو سروش و ئیلهامی بەڕاقەکاران بەخشیوەو بیروباوەڕەکانی دیاریکردوون. کاتێك بیریارانی موعتەزیلە داکۆکییان لەچەمکی خوڵقاندنی قورئان کرد لەهەستکردنیانەوە بوو بەپێویستی گرێدانی وتەو قسەی خوا بەڕەوتی مێژووەوە. ئەگەر فیکری ئیسلامی لەمڕۆدا ئەم بیرۆکەیە بگەڕێنێتەوە ئەو کاتە ئەوەندە ئامرازی بەدەستەوە دەبێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زۆر ڕاستگۆیانەو داهێنەرانەتر بەرەنگاری ئەو تەنگوچەڵەمانە بێتەوە کە لەهەموو لایەکەوە بەرۆکیان بەفیکری هاوچەرخ گرتووە.

** ** **

*داوای لێبوردن دەکەم لەوەی بەشێوەیەکی خێرا ئاماژەم بەهەندێ لەو ناوو نوسراوو چەمك و ڕووداوانە داوە کە پێویستیان بەڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی بەم مەسەلانە نامۆن.*

*هەروەها داواکارم لەخوێنەر کە زانیارییەکانی فراوان بکات و چەندین سەرچاوە بەسەر بکاتەوە بۆ*

ئەوەی دواتر بتوانێت ئەو پرۆسەی بیرکردنەوەیەی بگەڕێنێتەوە کە پێویستە هەمانبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کەشوهەوای ئەو شەڕە ئایدیۆلۆژییەی کە هێزە کوێرەکان لەچوار دیوارەکەیدا بەندمان دەکەن. ئەگەر کۆمەڵگە ئیسلامیو عەرەبییەکانی ئێستا بیانەوێت بگەنە ئەو ئاستە لەحەقیقەتو مەزنێتییەی ئەخلاقو ئەو جۆرە بوونەی کە قورئان بانگەشەی بۆ دەکات ئەوا پێویستی بەوەیە بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە بەخۆیدا بچێتەوە تاوەکو خۆی بگەیەنێتە ئەو ئاستە.

**سەرچاوە :**

***محمد اركون - وتارى الأسلام في التاريخ - لەکتێبی الفكر الإسلامي/ قراءة علمية - مركز الإنماء القومي و المركز الثقافي العربي - ترجمة: هاشم صالح - الطبعة الثانية 1996.***

*# هەموو ئەو نووسینانەی لەنێوان دوو کەوانەی لەمجۆرەدایە ( ) هی وەرگێڕی کوردی خۆیەتی.*

## پەراوێزو سەرچاوەکان

** ڕوونکردنەوەیەکی نووسەر: ئەم توێژینەوەیە لەبنەڕەتدا وەك وانەیەك لەشاری سالزبۆرگ لە 3 ی ئابی 1983دا پێشکەشکراوە لەمیانەی ئەو ئەڵقە توێژینەوە نێودەوڵەتییەی بۆ دیبلۆماسییەکان سازدرابوو لەژێر سەرپەرشتی وەزارەتی دەرەوەی نەمساویدا. من وەك خۆم ئەم ناونیشانەم هەڵنەبژاردووە ئەوەندەی ڕێکخەرانی ئەم بەیەککەیشتنە پێشنیاریان بۆ کردمو منیش پەسەندمکرد. دواتر خوێنەر لەئاماژەی تێدەگات کەبریتییە لەبیرکردنەوە بەئاراستەیەکی مێژوویی لەچوارچێوەی فیکری ئیسلامیدا. من دەمەوێت مۆرکی مێژوویی و گرفتامێز لەسەر ئەو شوێنە دۆگماو عەقیدە چەندبارانە دیاری بکەم کەبەزەبری هێز لەلایەن گوتاری ئیسلامی هاوچەرخەوە سەپێنراون وەك ئەوەی ئەمانە دراوگەلێکی ئیمانینو ناکرێت قسەیان لەسەر بکرێت. لەبەرئەوەیە جەختم کردۆتە سەر فرێزی "لەنێو" مێژووداو بەمەش مانایەکی بەهێزترم داوەتێ؛ واتە ئیسلام لەمێژوودا نەك لەدەرەوەی مێژوودا.*

*(1) دوو نموونە هەیە لەسەر تیۆریزەی خێرای تایبەت بە سەرجەم مێژووی "ئیسلام" ەوە کە لەکێشەی کۆیلەوە دەستپێدەکاتو دواتر باسیان دەکەین، سەیری:*

*1- لەنووسینی دانییل پایپ (D.pipes):*

*"سەربازە کۆیلەکانو ئیسلام، سەرهەڵدانی سیستەمی سەربازیی"، چاپکراوەکانی زانکۆیییل، 1981".*

*2- لەنووسینی پاتریسیا کرۆن (P.Crone) :*

*" کۆیلەیەك بەسەر ئەسپەکانەوە: گەشەی سیاسەتی ئیسلامی"، چاپکراوەکانی زانکۆی کامبریدج، 1980- لەپاڵ ئەم دوو کتێبەدا، لەزمانی فەرەنسیدا دوو کتێبی م. لومباریش هەن بەناوەکانی :*

*- ئیسلام لەشکۆیی یەکەمیدا (ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان سەدەی هەشتەمو یازدەهەمی زایینییەوە). بڵاوکراوەکانی فلاماریۆن، پاریس 1971.*

*- "ناوچەگەلییە جوگرافیاییەکانو تۆڕە بازرگانییەکان لەکۆتاییەکانی سەدەی ناوەڕاستدا"، بڵاوکراوەکانی موتون 1972.*

*(2) سەیری کتێبی پول بالتاو کلود ریلو بکە لەژێر ناوی :*

*- La Strategie de Boumediene, Sindbad 1978.*

*(3) ئەمە بەو مانایە دێت کەلەگەڵ هەموو تاوسەندنێکی قەیرانە ئابووریو دیموگرافییەکاندا گوتاری "ئیسلامی" یان ڕاستتر گوتاری ئیسلامەوی پەرەدەستێنێو گوتاری عەقلانی لاواز دەبێ.*

*(4) سەیری ئەم سەرچاوە ئینگلیزیانەی خوارەوە بکە:*

*- Shahrough AKHAVI: Religion and politics in contemporary Iran, clergy- State relations in the Pahlawi period, state university of New York press, Albany 1980.*

*ئاینیو سیاسەتمەداران لەئێرانی هاوچەرخدا، پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتو چینی پیاوانی ئاینی*

لەسەرەدەمی ئال پەهلەویدا. چاپکراوەکانی زانکۆی ویلایەتی نیویورک 1980.

- M. E Barine and Nikki keddeie: Modern Iran. The dialectics of Continuity and change,1980.

ئێرانی نوێ: " دیالەکتیکی بەردەوامی و گۆڕان"، 1980.

بەفەرەنسیش:

- D. Shayegan: Qu'est-ce qu'une revolution religieuse? Les presses d'aujourd'hui, 1982.

(5) چیدی ناوی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ کورتدەکەینەوە بۆ (DIC) ئەم سەرنجە تەنها تایبەتە بەدەقە فەرەنسییەکەوە).

(6) ئەمە زۆربەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئەنجامیدەدەن کەهەڵدەستن بەگواستنەوەی دەقە ئیسلامییە کلاسیکیەکان یان هاوچەرخەکان بۆ زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی بەبێ هیچ جۆرە شیکارییەکی مێژوویی یان رەخنەیی.

(7) بەکاڵاکردنەوەی ئەم میکانیزمانەو کەشفکردنی ئەو گریمانە ژێربەژێرانەی گوتارێك ئاراستەدەکەن دوو پرۆسەی سەرەکین و پێویستە هەموو توێژینەوەیەکی رەخنەیی ئەم دوو پرۆسەیە ئەنجامبدات.. بەڵام ئەگەر سەیر بکەین دەبینین ڕۆژهەڵاتناسان بەدڵخەوە سوورن لەسەر وەرگێڕانی گوتارە ئیسلامییە کلاسیکی و هاوچەرخەکان بۆ زمانە ڕۆژئاواییەکان ( ئینگلیزی، فەرەنسی، ..) بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی. سەیری کتێبەکەمان : "نحو نقد العقل الإسلامي" بکە لەژێر ناوی "تأريخية الفكر العربي الإسلامي"دا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. لەناویشیدا بەتایبەتی سەیری ئەم وتارەمان بکە:" الدين والمجتمع من خلال النموذج الإسلامي" .

(8) بۆ روونکردنەوەی ئەم رستەیە، سەیری : محمد ارکون: "قراءات في القرآن" بکە .

(9) ئەراگۆن زاراوەی "ئەزموونی مەدینە" لەبری وشەی ئیسلام بەکاردێنێت بۆ ئەوەی وەسفی ئەو وەرچەرخانە بکات کەپێغەمبەر محەممەد لەژیانیدا بەشێوازێکی مێژوویی بەرپایکرد.ئەو بۆیە ئەم وشەیە بەکاردێنێت تاکو بەرگی باڵگەنەویست لەو ساتەوەختەی دامەزراندن دابماڵێت و دیوە مێژووییەکەی ئاشکرا بکا بێ ئەوەی هیچ کام لەرەهەندە رۆحی و رووە رەمزییە مەزنەکەی ونبکات.

(10) سەیری ئەم توێژینەوەیەمان بکە: " مفهوم العقل الإسلامي" لەو کتێبەی کەپێشتر باسمانکرد "تأريخية الفكر العربي" .

(11) پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان راستی مێژوویی قورئان و راستی ئیلاهیدا. سەیری کتێبی پێشوومان بکە: "قراءات في القرآن" .

(12) سەیری وتارەکەی پێشمان "مفهوم العقل الإسلامي" بکە.

(13) ئەرگۆن مەبەستی لەوەیە عەقڵی ئایینی ئیماندار کەبەمجۆرە بنیاتنراوە مەسەلەی پراکتیزەکردنی پرەنسیپی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی یان مەعریفی بەسەر ئەو زانستە تەکنیکیانەدا رەفز دەکاتەوە کەخۆی پشتی پێبەستووە. ئەمە لەکاتێکدا زانستی نوێ بەگشتی ئەو دابڕانە فراوان و ئاشکرایە نیشاندەدەن کەلەنێوان زمانناسی کلاسیکی و زانستی زمانی نوێدا هەیە، یان لەنێوان میتۆدە کۆنەکانی راڤەکردن و ئەو میتۆدانەدا هەیە کەراڤەی دەقەکانی ئێستا دەکەن یان بەشێوەیەکی فراوانتر لەنێوان سیستمگەلی فیکری کلاسیکی و سیستمگەلی فیکری نوێدا هەیە .

(14) هەموو ئەو نووسینانەی ئەمڕۆ ئەم بابەتە فەبەدراوە دەقۆزنەوە لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازییەکی باشی لێدەکرێت. سەیری ئەم کتێبانەی خوارەوە بکە وەك نموونەیەك لەوە:

— التوراة والقرآن والعلم: الكتابات المقدسة ممتحنة على ضوء المعارف الحديثة. لەچاپکراوەکانی سیغرز 1976. دانەرەکەی موریس بوکای (M. Bucaille)و هەتا بڵێی کتێبێکی بێ پێزە.

رۆجیە گارودی ، وعود الإسلام/ لەبڵاوکراوەکانی سوی، 1981. ئەمیشیان هەر کتێبێکی بێ پێزە.

لەم بارەیەوە سەیری ئەم توێژینەوەیەمان بکە:" مشكلة التأثيرات في التأريخ الثقافي طبقاً للمثال العربي- الإسلامي" لەکتێبی:

Lumieres arabes sur l'Occident medieval, Anthropos 1978.

(15) ئەراگۆن مەبەستی لەو ماوەیەیە کە پۆزەتیڤیزم مۆرکێکی ساویلکانەی وەرگرت و لەسەدەی نۆزدەهەمدا ناوبسەند.

(16) مەبەست لە "تەرمیز" خولقاندنی کەشێکی رەمزیی و سرووتنامێزی نوێیە (= سەرمایەی رەمزیی) بۆ ئەوەی جێگەی ئەو هێمایانە بگرێتەوە کە لەسەردەمی جاهلیەتدا باوبوون. لەپاڵ دروستبوونی دەوڵەتی نوێدا هێمای نوێ پەیدا بوو.

(17) زانایانی ئایینی موسوڵمان بە شەخسیی خۆیان لەفەرمانڕەوایی دووره پەرێز دەگرن بۆ ئەوەی قورسایی و دەسەڵاتی ئایینییان چاکتر بپارێزن، سەیری :

Jacques Berque: Ulemas, fondateurs, insurges du Magreb, Sindbad, 1982.

(18) ناونیشانی کتێبێکی بییر بۆردیۆیە: الحس العملي یاخود (الخبرة العفوية المباشرة).

(19) ئەمانەن سالانی خەباتکردن لەپێناو رزگاریی و سەربەخۆییدا.

(20) سەبارەت بە "الحذّاقة" سەیری:

Khalil Zamiti : Sociologie de la Folie, Introduction Shamanisme Magrebine.

بەڵام سەبارەت بەزاراوەی بەناوبانگی (سەرمایەی رەمزی) سەیری ئەو کتێبەی بییر بۆردیۆ بکە کە پێشتر باسمان کرد.

(21) مەبەست لەمە:- 1/ ئەو کەلتورە ناوچەیی و نەریتیانەی پێش ئیسلامە کە تا دوای دەرکەوتنی ئیسلامیش بەشێوەیەک لەشێوەکان بەردەوامبوون(ئەمە یاسای هەستی پراکتیکی یان یاسای دەوارنشینی کۆن، یاسای عەرز و ناموس و سەرتاپای هەموو دەرهاویشتەکانی ژیاری شوانکارەیی و کشتیاریی). 2/ ئەوکەلتورە ئیسلامییەی (یان شەریعەتیەی) کە بەشێوەیەکی تایبەت لەناو شار و پایتەختەکاندا پیادەکراوە و بەستراوەتەوە بەهەریەک لەدەسەڵاتی رەسمی و زمانی فوسحە و بیرۆکراتیەتی دەوڵەتەوە).

(22) ناونیشانی کتێبێکی پرپایەخی زانای ئەنترۆپۆلۆجی ئینگلیزی جاک گودییە:

J. Goady: La raison graphique, Minute, 1979.

(23) سەیری کتێبی پێشوترمان : "قراءات في القرآن" بکە.

(24) سەبارەت بەو جیاکارییە سەیری:

M. Arkoun: La pensee arab, p.u.f.1979.

(25) یەکێك لەو بەڵگانەی کە فیکری ئیسلامی کلاسیکی بەکاریدێنێت بۆ ئەوەی ئیعجازی قورئان بسەلمێنێت پێداگرییەتی لەداڕشتنە زمانەوانییەکەیدا کەگوایە لای عەرەبەکان هیچ شتێك لەبەرهەمە ئەدەبییەکاندا بەپەرێزی ناگات: سەیری "ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام" بکە بابەتی ئیعجاز و پەرجوو.

(26) ئەراگۆن ئەم خاڵەی بەفراوانی لەم توێژینەوەیەدا روونکردۆتەوە بەناوی (دەروازەیەك بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ئیسلام و سیاسەت).

(27) بەڵام شیوەنکردن بۆ سەردەمی ئەفسانەیی لەسەدەی چوارەمی کۆچییەوە هەبووە و ناسراوە. سەیری کتێبی "قوت القلوب"ی ئەبوتالیب بکە، چاپی قاهیرە 1932.

28) ئەراگۆن لەمەدا مەبەستی لەناوێتەکردنی توێژینەوە پەرەخوازییە مێژووییەکانە (diachronie) لەگەڵ توێژینەوە تەزامونی و هەنووکەییەکە ( synchronie)، بەمە دەخوازێت ئەو ململانێیە تێپەڕێنێ کە لەشەستەکاندا هەبوو لەنێوان بونیادگەرییەکان و مێژوونووسەکاندا( یان ململانێی نێوان بونیاد و مێژوو).

(29) لێرەدا بیر لە کۆمەڵگەکانی ئاسیاو ئەفریقیا دەکەمەوە کە چوونەتە سەر باوەڕی ئیسلام. بەڵام تەنانەت لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا لەسەر ئیسلام پێویستبووە لەگەڵ ئەو شارستانیەتە هەمەچەشنو دەوڵەمەندانەدا یەکبگرێت کە لەوێدا دەرکەوتون وەک شارستانیەتی سۆمەرو بابلو ماریو، هتد... ئەفسانەکانی گلگامێشو ئەسکەندەری گەورەو حەوت نوستووەکەی ناو ئەشکەوت رەنگدانەوەی روونیان لەقورئاندا هەیە. یاخود کاریگەرییەکانی تەوراتو ئەنجیلەکانو سابئینو چیرۆکە عەرەبییە کۆنەکان. سەیری کتێبەکەمان "قراءات في القرآن" بکە. ل69–86.

30) ئەوە روونە کە "راستی" بە سایکۆلۆژی–کۆمەڵایەتییەکان لەڕووی زانستییەوە چەند راستییەک نین، بەڵام خۆیان وەک راستییەک دەسەپێنن کە قسە هەڵناگرێت لەبەرئەوەی خۆشەیەری جەماوەرە، لەکاتێکدا فیکری زانستی لەو نێوەدا وەک "هەڵەیەک" یان پەشۆکاوییەکو خۆتێخزاندنێک دەردەکەوێت.

(31) بەمجۆرە سەرنج دەدەین وەک نموونەیەک چەمکی ئەرسەدۆکسیەت هەتا ئێستا بەشێوەیەکی ئیۆلۆجی بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی لەڕووی مێژووییەوە بیری لێبکرێتەوە یاخود هیچ جۆرە ئێرامانێکی مێژوویی رەخنەگرانەی لەسەر هەبێت. هەرچەندە ئاسانترە ئەوە دەربخرێت کەئەمە زادەی پرۆسەیەکی مێژوویی هێواشی کردەکانی بژارو لابردنو بڵاوکردنەوەی چەند ناوو نووسراوو قوتابخانەو فیکرێکە ئەویش بەپێی ئەو نیازو مەبەستانەی لەسەردەمێکی دیاریکراودا لەلای هەریەک لەگروپو گەلو دەسەڵاتی فەرمانڕەواوە هەبووە. کەلەپوور بەمجۆرە پێکدێت کە دواتر رۆڵی سیستمێکی ئەمنی دەگێڕێت بۆ تایەفەیەکی ئایینی یان نەتەوەیی. سۆسیۆلۆجیای خوێندنەوە لەکۆمەڵگە ئیسلامیەکانی ئێستەدا دەتوانێت هەڵسێت بەدەرخستنی پرۆسەی بژێریی و لابردن کە دەسەڵاتی رەسمی یاخود ئەو رای گشتییە پێی هەڵدەستێت کە گوتاری باڵادەست دەستی بەسەردا گرتووە.

(32) سەیری کریستیان جامبی بکە :

Chr. Jamber: La Logique des Orientaux, Henri Corbin et la Sciencedes forms, Seuil, 1983.

(33) لێرەدا میتۆدیەتی ئەراکۆن لەمیتۆدیەتی رۆژهەڵاتناسێکی وەک هنری کۆربان جیادەبێتەوە لەمەڕ مەسەلەی رەهەندی خەیاڵو کاریگەرییەکەی لەسەر ئیسلامی شیعە بەتایبەتی. لەکاتێکدا یەکەمیان (ئەراکۆن) وەک مەسەلەیەکی ئەنترۆپۆلۆژی دەیبینێت کە کاریگەرییەکی ماتەریانەی هەیە، بەڵام دووەمیان (هنری کۆربان) تەنها وەک خاسیەتێکی رۆحانیو سۆفیگەرایی دەیبینێت.

(34) ئەمە خاڵی ئەو هاوئاهەنگیو بەیەکگەیشتنەیە کە ناوەڕۆکێکی هەیە لەنێوان ئەو دەسەڵاتگەلە ئیۆلۆجیو عەقایدییە جیاوازانەی کە هەوڵی بەدیهێنانی جۆرە گرێدانێکی تیۆریو مەنتیقی دەدات بۆ بیروباوەڕەکانیان لەژێر کاریگەری ئەرستۆدا بەشێوەیەکی تایبەتی. لەپێناو پێکهێنانی ئەرسەدۆکسیەتێکدا کە هەموو جۆرەکانی "شذوذ" و وێنەو مەجازەکانی بەشێوەیەکی بەربڵاو لەلای ئەتباعەکانی مانای ناوەوە لەئیسلامدا هەن. پێویستە بەشێوەیەکی باش چاو بە سەرلەبەری ئەو مەسەلە بەناوبانگەی دژایەتی نێوان مانای ناوەوەو مانای دەرەوەدا بخشێنرێتەوە، ئەویش لەبەر تیشکی هەریەک لەداهێنانە نوێکانی زمانەوانی (ئەفسانە، چەمک)و زانستی سیمیائیات ( تایبەتمەندییەکانی گوتاری ئایینی)و ئەنترۆپۆلۆجیا (ئەفسانەو رەمز)دا.

(35) سەیری هەردوو کتێبی جۆرج دۆبیو ک: متر. .س بکە:

-G. Duboy: Les trois orders ou l'imaginaire du feodalisme. Gallimard, 1980.

-G. Castariadis: L'inistution imaginaire de la Societe, Seuil, 1975.

(36) ئەم کتێبەمان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لەژێر ناوی "تأريخية الفكر العربي الإسلامي" و لەسەرەتای ساڵی 1986 لەبەیروت دەرچووە– مركز الإنماء القومي.

(37) رەنگە ناونانەکان جیاواز بن، بەڵام ئەو پرەنسیپو فرمانە دەروونی– کۆمەڵایەتیەی پرۆسەی بەرهەمهێنانی کۆبیانەی کەسایەتیە مەزنەکان بەڕێوە دەبات هەرچۆنە وا دەمێنێتەوە. سەیری :

- M. Godelier: La production des grands hommes, Gallimard, 1982.

(38) دواتر لەکتێبێکدا بەتێروتەسەلی قسە لەسەر هەموو ئەو دۆزانە دەکەم کە لە تەواوبووندایەو تایبەتە بەژیاننامەی پێغەمبەر.

(39) ئەراکۆن لێرەدا ئاماژە بەهاوارە بەناوبانگەکەی فۆکۆ دەدات لەدوا کتێبیدا ( وشەو شتەکان) کەتیایدا بانگەشە بۆ مردنی مرۆڤ دەکات دوای کەمتر لەسەدەیەك لەراگەیاندنی نیچە بۆ مردنی خوا (دیارە لەرۆژئاوادا)...

(40) هەتا ئێستا هیچ جەشنە توێژینەوەیەك لەبارەی ئەو نووسەرە بێ وێنەیەوە نیە لەرێگەی ئەو تێهوانینە باسکراوەوە. ئەوەش نموونەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەو دواکەوتوییە گەورەیەی لێکۆڵینەوە مەیەتی لەکایەی توێژنەوەگەلی عەرەبیو ئیسلامیدا. بەشێوەیەکی کاتی سەیری توێژینەوەیەکی شارل بیلا بکە" ژیانو کارەکانی جاحیز".

(41) سەیری ئەندریە میلیل بکە: " جوگرافیای مرۆیی لەجیهانی ئیسلامیدا هەتا ناوەڕاستی سەدەی یازدەهەم"– موتون، لەسێ بەشدایە 1973.

(42) چەمکی موزایەدەی گێڕانەوەو لاساییکردنەوە کلیلێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لەمێژووی سیاسیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری باو لەکەشو هەوای ئیسلامیدا. دەبینین پێویستە لەسەر هەموو پێشەوا یاخود هەموو نووسەرێك کە بیەوێت خۆی بەسەر کۆمەڵی باوەڕداراندا بسەپێنێت لاسایی رەفتارەکانی پێغەمبەر یان هەر کەسایەتییەکی گەورەی وا بکاتەوە کە رووبەرێکی فراوانی لەخەیاڵی کۆدا داگیرکردبێت. وەك نموونەیەك سەیری مەهدی کوڕی تومرت بکە کە لەدژی موراتبین هەڵسا لەژێر ناوی داکۆکیکردن لەهەوادارییەکی تەوحیدیانەی پاكو بێگەرد. هەروەها سەیری پیشبڕکێی نێوان شەریفەکانی مەغریبو شوێنەکانی تر بکە.

(43) مەبەست لەوەیە کە سەرۆکی هەر ئایینزایەك یان قوتابخانەیەك، موزایەدە بەسەر ئەوانی ترەوە دەکات لەلاساییکردنەوە بەژیاننامەی پێغەمبەرو چاولێکردنی بۆئەوەی پاکژییەکی زیاترو بایەخێکی زیاتری چنگ بکەوێت.

(44) ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەراکۆن هەردوو میتۆدەکە رەتدەکاتەوە:– ئایدیالیزمی کلاسیکیو ماتریالیزمی دۆگماتامێزی چەقبەستوو. هەروەها رەفزی بیرۆکەی "فاکتەری یەکلاکەرەوە وەك دوا ئاکام" دەکاتەوەو پێیوایە کەچەند فاکتەرێکی کاریگەر رەوتو بزاوتی مێژوو ئاراستە دەکەن نەك تەنها فاکتەرێك. هەروەها پێویستە هەر حاڵەتێك بۆ خۆی توێژینەوەی تایبەتی لەسەر بکرێت بۆ زانینی گەمەی ئەو فاکتەرانەو کەشفکردنی فاکتەرە یەکلاکەرەوە کاریگەرەکە بەشێوەیەکی زیاتر. هەندێك جار فاکتەری ئابووری دەبێتە یەکلاکەرەوەو هەندێك جاری تر فاکتەرە ئەفسانەییەکە ئەم رۆڵە دەگێڕێت، بەبێ ئەوەی یەکێکیان بایەخی ئەوی تریان رەتبکاتەوە.

(45) بۆ نموونە سەیری : الماوردي : أدب الدنيا والفن. قاهیرە 1955و سەیری "الأحكام السلطانية"، قاهیرە 1966، بکە.

(46) سەیری :

-D. Goitein: The rise of the Middle- Eastern Bourgeoisie in Early islamic Times et he mentality of the middle classe in medieval Islam. بکە.

# شێخەکان و ئایدیۆلۆژیاکانیان

## هەڵوەشاندنەوەو سەرلەنوێ دروستکردنەوەی خێڵ لە عێراقدا

■ فالح عەبدولجەبار

● و. لە ئینگلیزییەوە: دانا سەردار

ئاسۆ جەبار

رژێمی عێراق تەنانەت لەکاتی پرۆسەی بە جەماوەریکردنی سوپاو بیروکراسیەتیشەوە بە کەسوکاری خۆی و خێڵەکان هەوڵی ئەدا هێزی ئەو خێڵانەی کە لە دەرەوەی دەسەڵاتدان لەنێو بەرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەو بۆشاییەی کە بە هۆی پرۆسەی هەڵمژینی ئەو دەزگا شارستانی‌یە تازە دروستبوانەوە لە لایەن دەوڵەتەوە دروستبوو، بووە هۆی سەرلەنوێ چالاکبوونەوەی تۆڕەکانی دۆستایەتی و نزیکایەتی وەك بەربەست و تۆڕەکانی پاراستن. هەتا سەروەت و سامانی دەوڵەت بەهۆی گوشاری شەڕو سزاکانەوە لاواز بوایە پێویستی‌یەکانی تۆڕی خزمایەتی و رەچەڵەکایەتی بەهێزتر دەبوون.

سەرلەنوێ دروستکردنەوەی خێڵەکان و مامەڵەی دەوڵەت لەتەك خێڵەکاندا دوو خەسڵەتی دیارن لە سیاسەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی نوێدا، ئەمەش بە ئاشکرا لە عێراق و ئەردەندا دەبینرێ. لەژێر سایەی بەعسی دیکتاتۆری تاکە حیزبی حاکمدا لە عێراق دوو جۆر لە مامەڵەی دیاریکراو گەشەی کردووە، یەکەمیان ئەتوانین پێی بڵێین خێڵەکایەتی دەوڵەتی کە بریتی‌یە لە پرۆسەی تێکەڵکردن و جێگیرکردنی رەچەڵەکە خێڵەکییەکان و هێما فەرهەنگییەکانی لە دەوڵەتدا، لە پێناو بەهێزکردنی نوخبەیەکی لاوازی دەسەڵاتداردا، ئەم پرۆسەیە سەراپاگیر بووە، کە بۆتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی هەندێك لەو تایەفە و خێڵە عەرەبە (سوونی)یانەو هەندێك لە کەسوکاری دەستەی دەسەڵاتدار. خێڵەکایەتی دەوڵەتی لە سالانی حەفتاوە دەستپێکردووە تا سەرەتای نەوەدەکان بەردەوام بووە.



نێو کەشێکی کۆمەڵایەتی شارستانیدا بەشە گەلێکی کۆچەر لەو تایەفە پەرتەوازانە تێیدا ئەژین.

نمونەی دووەم خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی‌یە کە ساتی لە دەستدانی دەوڵەت لە کۆمەڵگە مەدەنی‌یە ناجێگیرەکان دەردەخات. دەوڵەتیش لە ئەنجامی هەستکردن بە لاوازی بەهۆی شەڕو سزاوە گەشەی بە کاری وەك باڵادەستی یاساو کۆکردنەوەی باج و دەسەڵاتی یاسایی داوە و ئاراستەکردنیان رووەو هۆزە نێوخۆی‌یە لاوازەکان و ئەو تۆڕە رێژەییانەی کە هەبوون. ئەم جەشنە مامەڵەکردنە ئەو کۆمەڵگەلە هۆزانەی کە سەرلەنوێ دروستکرابوونەوەو بیناکرانەوە لە پێناو بەرفراوانبوونی دەوڵەتدا کاریاندەکرد. خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی بە پێچەوانەی خێڵەکایەتی دەوڵەتی‌یەو لەنێو سەرجەم تایەفەو نەوە بە نەوەی عێراقیەکاندا بڵاوبۆوە. ئەم چەشنە لە بەکارهێنانی خێڵەکایەتی وایکرد کە دەوڵەت بتوانێ کوردەکان و شیعەکان ئاراستە بکات دژی سەربازە ئێرانیەکان لە ساڵی ***1980-1988***، لە باری شیعەکاندا دەوڵەت توانی هەماهەنگی نێوان شیعەکانی عێراق و برا دینیەکانیان لە ئێران دامرکێنێتەوە.

هەردوو جۆرەکە واتە خێڵەکایەتی دەوڵەتی و خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی رەگوڕیشەیان لە بەردەوامبوونی فەرهەنگی هۆزایەتی‌دا هەیە. کە لە

**رەگە مێژووییە گەڕاوەکان**

***Reslient Historical Roofs***

پێ ئەچێ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خێڵ ئەو بوونە کۆمەڵایەتی‌یە بێت کە درێژترین بەردەوامی هەبێت و زۆرترین ناکۆکی لە بارەوە هەبێت کە هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و نێوەندیبوونی سیاسەت لە سەردەمی کشتوکاڵی‌دا هەتا قۆناغی پیشەسازی و دروستبوونی دەوڵەتانی نەتەوە خێل دووچاری گۆڕانێکی بەردەوام بووە. کەواتە خێڵ چی‌یەو خێڵەکایەتی چی‌یە؟ زانای کۆمەڵناس "ئیبن خەلدون" تیۆرییەکی بەربڵاوی گەشەپێدا، کە بە پێی ئەو دەورە خەلدونیانە ئەو هۆزانەی لە رووی سەربازی‌یەوە لە ئاستێکی باڵادا بوون لە نێو کۆمەڵگەلێکدا یەکیان گرتووە "واتە تێکەڵبوون" کە ئەمەش بە شێوەیەکی بەدوایەکداهاتوو بووەو هەروەها پێگەیان لە شارستانیەت چڕیوە. بەڵام لە کۆتایی‌دا جێگیر بوون واتە بە شوێنێك لەو شوێنانەوە خۆیان گرێداوە، ئیبن خەلدون پێی وابوو کۆچکردن و کشتوکاڵ نوێنەرایەتی دوو جەمسەری ناکۆك دەکەن لەنێو هاوکێشەیەکی دینامیکی‌دا و دواجار هۆزەکان لە دۆخی پەرەوازەیی شاری دەوڵەتدا مانایان دەبوو.

ساڵانێکی زۆر هۆزە بەهێزەکان لە عێراق دەوڵەتی بچوکی گەرۆك بوون کە هێزە

سەربازییەکانیان ئەبرد بەڕێوە، زەویوزاری زۆرو توانستێکی باشیان هەبووە لە دەستبەسەراگرتنی شوێنگەو ئەو ناوچانەی کە تیایدا جێگیر بوون، بەم شێوەیە سیستمی هەرەمی گەشەی کرد، کە وەستابوو لەسەر شێوەی ژیان و بژێوی لە کاتێکدا ئەو هۆزانەی کە بەخێوکەری حوشتر بوون و لە بەشی سەرەوەی هەرەمەکەدا بوون و بەخێوکەرانی مەڕوماڵاتیش لە خوارترو جوتیارانیش لە خوارترو دوابەدوای ئەوان دانیشتوانی زۆنگاوەکان بنکەی هەرەمەکەیان پێکدەهێنا. هەروەها لە کاتێکدا کە سیستمی جێگیر بوون باڵادەست بوو هەرەمێکی دیکە دروست بوو کە جوتیارانی برنج لە لوتکەکەیدا بوون و دوا بەدوای ئەوانیش جوتیارانی سەوزەو دواتر پیشەکاران. لەنێو ئەم هۆزانەدا ژن هێنان و شوکردن قەدەغەو نادروستبووە.

بەڵام سیستمی جێگیرو هێزی چەکداری عوسمانییەکان بوونە هۆی ڕوودانی وەستانێك لە خولی خەلدونیدا لە عێراق، پەیوەندی هێزەکانی گۆڕی بە سودی ئەو ناوچانە کە لە سایەی ئاسایش و جێگیربوونێکی زۆردان. عوسمانییەکان ئەو سەرۆك هۆزانەی کە بەخێوکەری حوشتر بوون گۆڕی بۆ کۆکەرەوەی باج و خەراج کە لەو سەروەختەدا لە ژێر سایەی هێزی ناوەندیدا بوون، کە باج و دەرامەتێکی پێویستیان وەك باجی دەوڵەت کۆکردەوە، ئەمەش بۆ خۆی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەگەڵ موڵکایەتی خێڵەکایەتی زەویوزاردا یەکیگرتەوەو بووە هۆی ڕوودانی دابەشبوونی هۆزو دابەشبوونیان بەسەر ئەوانەی کە خاوەنی زەویوزارن و ئەوانەی کە خاوەنی زەویوزار نین لە سەدەی بیستەمدا.

خاوەن زەوییەکان هێزێکی سەربازیان بنیادنا بەبێ پشتبەستن بە هۆزو ئەمەش لە پێناو بەهێزکردنی دەسەلات و ئیرادەیانا بووە. هەروەها یاسای کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا لادێکانی عێراقی لە سیستمی جەزای نیشتمانی جیاکردەوە، هەتا ساڵی "*1958*" لەو کاتەشدا دەوڵەتە کۆلۆنیالیزمییەکان هێدی هێدی وەزیفەی هۆزە دێرینەکانیان لە چەند پرۆسەیەکدا داگیر کرد، وەك پرۆسەی تۆمارکردنی زەویوزار و دابەشکردنی ئاوو ئاودێری و جێگیرکردنی یاساو هەروەها سەراپا هۆیەکانی زەبروزەنگیان بۆ خۆ قۆرخکرد.

هەروەها لەسەر ئاستی کومەلایەتیش، هۆز لەبەرچاو ونبوو گۆڕا بە کۆمەڵگە لادێیەکان کە لە خێزانە گەورەکان و تایەفە فەرعییەکان پێکهاتبوون، زۆربەی کات ئەم کۆمەڵانە پارێزگاریان لەناوی هۆزەکانی خۆیان کردووە بەڵام لە بری بەستنەوەیان بە سیستمی ئابووری گوزەرانی‌یەوە بەسترابوونەوە بە بازاڕی کشتوکاڵی‌یەوە.

لەگەڵ کۆچ لە لادێوە بۆ شار هەماهەنگی هاوپەیمانی لادێکان گوازرایەوە بۆ لادێ گەورەکان و شارە گەورەکان کە تیایدا پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی هۆزەکان زۆر لەسەرخۆ بووە. ئەو جوتیارە کۆچەریانەی لە ساڵانی پەنجاکاندا لە کوت‌و عەمارەوە کۆچیان کرد و لە گەڕەکەکانی ڕۆژهەڵاتی بەغدادا جێگیر بوون گەڕەکەکەیان بە شاری شۆڕش "مدینة ثورة" ناونراو دابەشکرا بەسەر چەند ڕێگەیەکی هاوسەنگ و بەشکراو بۆ شەقامە بچوکەکان و گەڕەکەکان و هەروەها سەرجەم ڕێگەویان و شەقامەکان وەك شەقامەکانی نیۆرك ژمارەی دیاریکراویان بۆ دانرا. لە ماوەی ساڵێکدا ژمارەکان گۆڕان بەناوی هۆزەکان و کە دەبوو شۆفێری تاکسی‌و پاسەکان و فەرمانبەرە رەسمییەکان فێریان ببن. ژیانی شار، کە تیایدا دابەشنەکرێ بەسەر پیشەی تایبەتی‌داو ئابووری و بازرگانی دەکرێت و شێوازی ژیان نامۆیەو دەوروبەر دوژمنە، فەرهەنگی خێڵەکی بەهێزتر دەکات.

خێڵەکایەتی ژیاریی گەڕاوە بە شێوەیەکی هاوکار ئامێز لەتەك زۆربەی ئایدیۆلۆژیاو بزووتنەوەکانی سەردەمدا ئەژی، تێکەڵی ئەو سەندیکایانە دەبێ کە کۆمۆنیستەکان سەرکردایەتیان دەکەن، یان تێکەڵی بزوتنەوە ئیسلامییەکان دەبن.

## هۆز لەنێو حیزبدا

*Tribe Inside Party*

دیارترین سیفەتی دەوڵەتی عێراقی لە قۆناغی کۆڵۆنیالیەوە تاکو ئێستا، پێکهاتووە لە جیابوونەوە لە بنکەی بەرفراوانی کۆمەڵایەتی "جەماوەر". لە سەرەتادا هێزی سەربازی بەریتانی ودواجار سامانی هەرە گەورەی نەوت کە بە هۆیانەوە دەوڵەت توانی چینە خاوەن موڵکەکان داڕوخێنێ و یان کەمیان بکاتەوە هەروەها دەستی گرت بەسەر بەشی هەرە گەورەی سامانی نەتەوایەتی. کاریشی ئەکرد بۆ دۆزینەوەی هەڵوێستی بەرپرسانە کە لە ڕێیەوە دابەشبوونی دەسەڵات بەسەر کۆمەڵگەی فرە نەژادو فرە ئایندا لەکار دەکەوت. عێراق ئەو دەوڵەتە بوو کە بەردەوام بە دوای نەتەوەیی‌دا دەگەڕا، لە کاتێکدا موڵکایەتی بەهۆی ئالیاتی یارمەتیدەرەوە لە ڕێی کۆمەڵگەلە باڵادەستەکانەوە هاتە گۆڕێ، بەڵام چینی کرێکارو چینی مامناوەندی بۆرژوای پشتگوێخست. ئەوکاتەی ڕژێمە رادیکالییەکان لە ساڵی *1958*دا ڕژێمی پاشایەتی ڕووخاند، توێنەرایەتی چینی مامناوەند لە دەسەڵاتدا ڕووی لە باشی کرد بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لە گرێدانی کۆمەڵە نەژادەکان و ئاینی‌یەکان بە دەوڵەتەوە، ئەمەش بووە هۆی بەرپا بوونی نائارامی. زۆر لەمە خراپتر هەڵوەشاندنی بنەما دامودەزگایەکان بوو بۆ بونیادە نیشتمانیەکانی وەك پەرلەمان و ئەنجومەنی پیران.

سوپا بوو بە خاوەنی هۆیەکانی زەبروزەنگ کە ئەمەش بۆ خۆی بوو بە تاکە هەل بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات لەم ڕژێمە نوێیانەدا، بەڵام ئەفسەرەکانی سوپا چینە کۆمەڵایەتیەکان و ئایدیۆلۆژیا جیاجیاکان پارچە پارچەیان دەکردن. لە شەستەکاندا زنجیرەیەك لە کودەتاو حکومەتە سەربازیەکان نەگەشتنە هیچ ئەنجامێك لە دۆزینەوەی بنکەیەکی جەماوەری کە بتوانێت بەرەنگاری بەرهەڵستکارانی ناوخۆ ببێتەوە. ئەندازیارانی بەعسی دووەم واتە ئەوانەی لە ساڵی *1968*دا دەسەڵاتیان گرتە دەست هەوڵیاندا ئەم کەموکوڕییە چارەسەر بکەن. دەستەبژێرە بەعسی‌یە نوێکان بە چوار سیفاتی دیاریکراو ئەناسرانەوە:

*1*–ڕەگوریشەیان لە شارۆچکە ناوچەییەکانەوە بوو کە هەماهەنگی خێڵەکایەتیەکان لەوپەڕی توندوتۆڵی‌دا بوو.

*2*–زۆر ئاگاداری هێزی سوپا بوون.

*3*–ئەزموونیان هەبوو لە سیاسەتی میللی‌دا.

*4*–هەستکردن بە لاوازی خۆیان، ئەم نوخبەیە لە ترسێکی بەردەوامی لە دەستدانی هێزدا ئەژیا، وەك سەدام حسێن وتبووی: ناتوانین ڕێ بە سێ یان چوار ئەفسەر بدەین دەبابەیەك ئاو بدەن و جارێکی دیکە دەستبگرنەوە بەسەر دەسەڵاتدا".

حکومەت بەهۆی بەرفراوانکردنی بنکەی حیزبی خۆیەوە بۆ "*1.800.000*" لە ماوەی "*8*" ساڵدا وەڵامی ئەو بەرهەڵستکاری‌یەی دایەوە، هەروەها هێزە سەربازی‌یەکان و هێزەکانی ئاسایشی لە خێزان و تۆڕە خێڵەکایەتی‌یە نزیکەکانی حکومەت پێکهێنا. پرۆسەی بە سەربازیکردن سێ بنەمای سەرەکی گرتە خۆ:

*1*–نوسینگەی سەربازی حیزب کە بێجییەکان یان خێڵی بێجات و هاوپەیمانە نزیکەکانیان دەیانبرد بەڕێوە.

2-نوسینگەی پەیوەندییە گشتییەکان کە نوسینگەیەکی بەرپرسیار بوو لە سەرجەم هێزەکانی ئاسایش و سەدام حسێن خۆی ئەیبرد بەڕێوە.

3-کۆمیتەی خێڵەکان کە بۆ پاسەوانیکردنی سنوری عێراق - سوریا دروستکرابوون.

بە بوونی ئەم سێ نوسینگەیە لەژێر ڕکێفی سەدام حسێندا توانی دەستەبەری کڕینی هەر کۆمەڵێك یان هەر خێڵێك بکات لە ناوچە سونی نشینەکانی عێراق. خێڵی بێجات زیاتر پەسەند دەکران لە دەزگا هەستیارەکاندا وەك گاردی کۆماری و وەزارەتی ناوخۆو پارێزگاریکەرانی بەغداو هێزی ئاسمانی. ئەم تۆڕە سەرەکیانە بوون بە جێگیری ئەو کەشە پیلانابیەی ئەوکاتە کە لە ئەنجامی کودەتاکاندا لە ئارادا بوو و متمانەو وەفاداری لێدەکەوتەوە. لەگەڵ ئەم خێڵەکایەتییە دەوڵەتییەدا حکومەت ئەو ڕەگەزە خێڵەکایەتیانەی لە شوێنی نیشتەجێکەیان جیاکردەوەو تێکەڵ بە خۆی کردن. ئەم تۆڕە سەرەکیانە تێکەڵ بە بیرۆکراسیەتی حیزب و کارگێڕی سوپا کران. پاتریاکی گەورەش سەرکردەی حیزب و سەرۆکی حکومەت بوو. بەڵام خێڵەکایەتی دەوڵەتی سەرجەم هەماهەنگییە خێڵەکایەتییەکانی لەناو نەبرد، بەڵکو ئەندامانی خێڵەکان هەتا زیاتر دەوڵەمەند و بەهێزبوونایە لەنێو خێڵەکەیاندا پایەدارتر دەبوون. لە بەرامبەریشدا خێڵ سودی لێوەردەگرێت بۆ ئەوەی نفوزی ئابوری و سیاسی زیاتر بەدەستبهێنێت.

کۆمەڵگەلە خێڵەکایەتییە مەرغوبەکان ڕێکەوتننامە حکومییەکانیان دەستگیر بوو، یەکێك لەو ڕێکەوتننامانە، بوونە نوێنەری چینی دەوڵەمەندە نوێکان بوو، هەندێك لە لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان ئەوەیان ڕوونکردەوە کە بێجیەکان و ڕەچەڵەکەکانیان پەیوەندیان کرد بە بەڵێندەرە دەوڵەمەندەکانەوە کە لە کۆتایی جەنگی ئێران-عێراقدا ژمارەیان گەیشتە "3000" سێ هەزار، بەمەش ئەو دەستەڵاتە ئابوری و سیاسییەی هەڵسوڕاوان لە ڕێی پەیوەندییە خێڵەکایەتییەکانەوە دەستیان بەسەردا گرتووە ئەتوانن جەخت لەسەر دەورو کاریگەری خۆیان بکەنەوە لەو ساتانەدا کە دەوڵەت تیایدا لاواز دەبێ.

## هۆز دژی دەوڵەت
*Tribe Versus State*

دوانەی مەنتقی خێڵەکایەتی واتە دەوڵەتی-بیرۆکراسی نوێ و پێبەندی هۆزایەتی پێکەوە لە ئاشتیدا ئەژین، بەڵام لەژێر سایەی ڕژێمی بەعسیدا هەر دەبێت بەگژ یەکدا بچن. لە ماوەی سەرەتای ئەو چوار ساڵەی حوکمی ڕژێمی بەعسدا هیچ نیشانەیەکی بەرهەڵستکاری لەمەڕ هێنانە ناوەوەی بنەچەی هۆزەکان بۆ نێو ڕژێمی بیرۆکراتی حیزب لە ئارادا نەبوو. لە ڕاستیدا حیزب پێشوازی لە هەر هەوڵێك دەکرد کە پشتیوانی و برەو بدات بە بنکەکانی حیزب. بەڵام دوو ڕووداو ڕوویاندا کە ئاماژەیەك بوون



بۆ دەرخستنی ناڕەزایی حیزب، یەکەمیان هەوڵی کودەتایەکی سەرنەکەوتوو بوو لە مانگی تەمووزی ساڵی 1973دا کە لە ڕێی بەڕێوەبەری دەزگای ئاسایشەوە "کازم گەزاز" داڕێژرابوو. هەروەها کودەتای حوزەیرانی 1979 دژی سەدام حسێن کە ئەندامانی سەرکردایەتی بەرەی شۆڕش "محمد عایش" و "عدنان حسێن" گەلاڵە بووبوو، یەکێك لە هۆیەکانی یاخیبوونی ئەندامە کۆنەکانی چینی ناوەندیی حیزب ڕقی ئەوان بوو لە دەسەڵاتی خێڵی بێجات، کە سەدام حسێن و برا تکریتییەکانی دەگرتەوە. ناڕەزاییەکانی نێو حیزب بەشداریکردنی دەسەڵاتیان دەویست. ئاشتبوونەوەیان دەویست لەگەڵ خێڵە دوورخراوەکاندا لەبری لابردنیان و دوورخستنەوەیان، لە ڕووداوەکەی ساڵی 1979دا بەرهەڵستکارانی حیزب هەوڵیاندا یەکێك لە بێجاتەکان، کە سەرۆك بەکر بوو دژی سەدام حسێن و زڕبراکانی بەکاربهێنن. سەرکەوتنی بێجاتەکان و هاوپەیمانەکانی ئەو وتەیەی ئیبن خەلدونی سەلماند کە دەڵێ: "ئەوانەی لەگەڵ هەماهەنگی خێڵدان دەبینەوە (سەردەکەون).

وەك شێوەکانی دیکەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵگەکانی ئیبن خەلدون لە ململانێکانی دەسەڵاتدا لە بەردەم هەڵاهەلا بوون و پەلاماردان. هەتا خێڵی "حسێن بێجات"یش دابەشبوون بەسەر هۆزو خێزانی گەورەدا کە بە پڕ بایەخترین یەکە سەرەکییە چالاکەکان دائەنرا. دەستەواژەی "چەتە تکریتییەکان" کە هۆیەکانی ڕاگەیاندن بەکاریدەهێنن چەمکێکی هەڵەیە چونکە خێڵەکانی تکریت بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا دابەش ئەبن کە بریتین لە:

1–ئەل بو ناسر "ال بو ناصر" کە بە تکریتییە دێرینەکان ناوزەد دەکرێ، کە دەڵێن لە "حامیە"ی ڕۆمانییەوە کەوتونەتەوەو لە دۆلیمەوە ترازاون، ئێستاکە "ئەل بو ناسر" هۆزێکی وەهمییەو بێجاتەکان تیایدا دەسەڵات دەبەن بەڕێوە. بێجاتەکانیش لە "10" خێزان پێکهاتوون، لەوکاتەوەی کە "ئەحمەد حەسەن بەکر" لە ساڵی 1968دا دەسەڵاتی گرتە دەست بەشێکی ئەلبەکر سەرۆکایەتی هۆزییان دەکرد. لە دوای مردنی "ئەلبەکر" دەسەڵات چووە ژێر ڕکێفی "3" خێزانەوە کە یەکێکیان "ئەل بو خەتاب" بوو کە ئەویش ئەو بەشە بوو کە سەدام حسێنی لێکەوتەوە.

بەپێی ئیبن خەلدون کۆمەڵگەل لەکاتی دەستبەسەراگرتنی سەروەت و سامانی دەوڵەتدا تێکئەشکێ. لە دۆخی وڵاتانی خاوەن نەوتدا تێکشکانەکان خێرا دەبن و بازدان تیایدا ڕوودەدات. بازدابەشبوونی یەکەم لەتەك پاکسازیکردنی تکریتییەکاندا ڕوویدا، وەك وەزیری بەرگری پێشوو "هەردان عەبدولغەفار تکریتی" کە لە ساڵی 1971دا لە کوەیت تیرۆر کرا، "ساڵەح عومەر عەلی"ش کە ئەندامانی کۆنسەی سەرۆکایەتی شۆڕش بوو لە ساڵی 1970دا گوێزرایەوە بۆ کارێکی بچوکی دبلۆماسی لە ئەمریکا. پڕ بایەخترین ڕووداوی بازدابەشبوونی بێجیەکان دەست لەکار کشانەوە زۆرە ملێیەکەی "بەکر" بوو لە حوزەیرانی ساڵی 1979دا، لەهەر دوو بارەکەدا خێڵ و حیزب دژی یەکدی بەکارهێنراون، کەلێنی سێیەم لەکاتی گەڕانەوەو تیرۆرکردنی هەردوو زاواکەی سەدام حسێندا بوو لە تشرینی دووەمی ساڵی 1995 "حسێن و سەدام کامل". لەم بارودۆخەدا خێڵ کەلێنی دژ بەخۆی تیادا ڕوودەدات. هەروەها پێکدادان لە نێوان زاواکان و ئەلمەجید و ئەل بو خەتابدا ڕووی دا، خێزانی سەدام هەستان بە دوورخستنەوەی ئەلخەتاب لە ئاسایش و دەزگاکانی ئەمن، هەروەها کوڕەکانی سەدامیش واتە عودەی و

قوسەی هەستان بە دوور خستنەوەی ئەلمەجیدو براکانی سەدام بۆ نێوەندە پلە دووەکان و بەرەو لەبیرچونەوەیان.

ئەم دژە بەرەکایەتی‌یە رەگوریشەی لە رێکەوتن لە رێی ژن و ژن خوازی‌یەوە هەبووە، سەرۆک سێ کچ و دوو کوڕی هەبوو، شوکردنی کچەکانی سەرلەنوێ دابەشبوونی دەسەلاتی سیاسی دەگەیەنێ کە تیایدا سەرجەم خێزانەکان لە پێشبڕکێدان بۆ ئەوەی بگەنە دەسەلات، سەرۆکیش بۆ کچەکانی رەچەڵەکی باوکایەتی بۆ هەلبژاردوون بە پێشکشەکردنیان بە خێزانی "کامل". ئەم مەسەلەیە ئاماژەیەکی تۆقێنەر بوو بۆ کۆمەڵەکانی دیکەو بە تایبەتی زڕ براکانی کە هەستیان بە هەڕەشە دەکرد، لە کاتێکدا کە برا بچووکی "حسێن کامل" هاتە پێشەوە بۆ داخوازیکردنی کچە بچووکی "سەدام حسێن" خێزانەکانی دیکەی ئەلمەجید دژی ئەم چڕبوونەوە نائاسایی‌یەی دەسەلات وەستان. ئەو مەرگە خوێناوییەی حسێن کامل کەلێنێکی تالی بۆ خێزانی سەرکردایەتی دروستکرد. کەلێنێکی دیکەش "عودەی" و "قوسەی" جیاکردەوە بەوەی کە نابێت هەردووکیان جێگری باوکیان بن.

### هۆز لەبری دەولەت
*Tribe Instead of state*

ئەگەر خێلەکایەتی دەولەتی سیاسەتێکی هۆشیاری دەولەت بێت ئەوا دەولەت هەولیداوە لە دەرەوەی خۆی هێزی خێل لەنێو بەرێت. رژێمی بەعسی تاکە حیزبی، سەرجەم پەیمانگا کۆمەلایەتی‌یە شارستانی‌یە تازە دروستبووەکانی هەللوشی وەك: یەکێتیەکان، رێکخراوە پیشەییەکان، چاپخانە سەربەخۆکان، هۆلە بازرگانیەکان و ئەنجومەنە پیشەسازیەکان. ئەو بۆشاییە گەورەیەی دەسەلات کە دەولەتی دەسەلاتی بالا خولقاندی چالاککردنەوەی سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی تۆڕەکانی رەچەلەکایەتی وەك بەربەستەکان و تۆڕەکانی پاراستن و بنکەکانی سەرچاوەی "دارایی".

پێویستی تۆڕەکانی خزمایەتی پەرە دەسێنێت کاتێك کە خێرو سامانی دەولەت لە بەرئەنجامی فشاری جەنگ و سزاکان کەم بۆوە. لە سالانی هەشتادا ئەندامە گەورەکانی حیزب هەستان بە لاوازکردنی هێزە نێوخۆییەکانی خێلەکان، ئەمەش بەهۆی خەلقکردنی ئەو دەورەی کە تا ئەم سەورەختە پیاوە ناودارەکان پێی هەلدەستان. لەگەل کەندڕکردنی خێلەکان لە لایەن حیزبەوە هەرەمیەتی خێل لە زوربەی ناوچەکاندا شێوا. بۆ نمونە کادرێکی حیزبی سەر بە کۆمەلێکی ئاست نزم "وەك دانیشتوانی زۆنگاوەکان دەیتوانی زالبێت بەسەر دەستەیەکی بالای خێلدا. بەلام چوونە نێوەوەی حیزب بۆ نێو خێل تەنها کاتی بوو.

لە ماوەی شەڕی عیراق و ئێراندا ئەندامانی حیزب کران بە سەرباز بۆ بەشداری کردنی شەڕ و حیزب هەستا بە بلاوکردنەوەیان بەنێو پانتای‌یە خێلەکایەتی‌یەکاندا، دوابەدوای زیادبوونی بەرتەسکی ئابووری شێوە کۆنەکانی سەرکردایەتی سەرلەنوێ دروستبوونەوە. راگەیاندنی دەولەتیش بەم ئاراستەیە بەشداریکرد لە رێی پڕوپاگەندە زۆرەکانی شیعرو هەلبەستەکانی جەنگی میللی خێلەکایەتی. بەشی راگەیاندنی وەزارەتی بەرگری سەرنجی خستبووە سەر چەمکە خێلەکایەتیەکانی ئازایەتی و جوامێری سەربازی و تۆلەو شەرەف، کە لێرەدا مەبەستی ئەفسەرانی خێلەکان بووە. لەگەل جەنگی دووەمی کەنداودا دەولەت زۆربەی هێزە ئابووری سەربازییەکانی لە دەستداو لە داهاتی خودی خۆی دامالرا، دەولەت لە خزمەتگوزاری‌یە کۆمەلایەتی‌یەکان کشایەوە و چینی مامناوەند و هاولاتیانی پێگە نزم و گوندنیشنەکان زەرەرمەند بوون، ئەمەش بەهۆی

هەڵئاوسان و باج و خەراجی زۆرەوە بوو. هەروەها ئەو چالاکییە بازرگانیانە لەگەڵ زیادبوونی فەقیریدا رووی لە زیادبوون کردو دەسەڵاتی بەسەردا نەگیرا.

دەوڵەتیش وەك ئامرازێك بۆ کۆنترۆڵکردن و حوکم زەرەری زۆری لێکەوت: سوپا ئاستی نزم بۆوە بۆ ئاستی یەك لەسەر سێی پێش شەڕەکە، حزبیش پەکیکەوت و هێزەکانی ئاسایشیش بەدەست زەرەری گەورەوە دەیانناڵاند، لە سەروەخت و لە دوای راپەڕینەکانی ئازاری **1991**، بەتایبەتی لە ناوچەی گوندنیشنە شیعەکاندا کە دەسەڵاتی دەوڵەت تیایدا لاوازە و، بەڵام هاوکات لە ناوچە سونی نشینەکاندا بە تەواوەتی خێڵەکایەتی سەریهەڵدایەوە بۆ پینەکردنی ئەو کەلەبەرانەی کە رژێمی دیکتاتۆری خستبوییەوە.

## دەوڵەت خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی دەدۆزێتەوە

***The State Detects Social Tribalism***

دەوڵەت خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی بەدیکرد بەڵام دروستی نەکردووە، لە ماوەی جەنگە زەرەرمەندەکانی مەیدانی جەنگی بەسرەو عەمارە لە ساڵی **1982–1985**دا خێڵە عەرەبییەکان لە ناوچەکانی "القرنە، و زۆنگاوەکان" بەرەنگاری هێرشەکانی هێزی ئێرانی بوونەوە، ئەم رووداوە لەبەر چاوی دیدەوانەکانی رژێمدا ون نەبوو. بەڵام خێڵەکایەتی میللی سەربازی عەرەبی جیاواز بوو لە رێکەوتنە بازرگانیەکانی رژێمی پێشوو لەگەڵ خێڵە کوردییەکاندا بۆ شەڕکردن لەگەڵ کوردە نیشتمانپەروەرەکاندا کە بە شێوەیەکی هەرەمەکیانەو وڵاتپارێزی عێرقایانە بووە.

رژێم ناوبراو "روغان غفور المجید" کە ئامۆزای سەرۆك بوو کردی بە بەرپرسی رێکخستنی خێڵە شیعەکان وەك هێزی بەرگری لە بەرەکانی بەسرەو کوت و زۆنگاوەکان. رژێم جیاوازی نێوان شیعەکانی عەرەب و شیعەکانی فارسی قۆستەوە، لە کاتێکدا شیعەکانی ئێران بەشێکی جێگیرو دیاربوون لە نەتەوەی ئێران و جیاواز بوون لەو شیعە لانێیانەی لە عێراقدا هەبوون. ئەم کۆمەڵە رەگەزە بە شێوەیەکی تایبەتی لەنێو ژمارەیەك لە خێڵە عەرەبەکانی زۆنگاوەکاندا دۆزرانەوە، لەو سەروەختەدا فەرمانگەکانی حیزب پشتیان بەست بە ئازایەتی و پیاوەتی و جوامێری سەربازی کۆمەڵێك خێڵ و بانگەشەی ئەوەی پێوە دەکردن کە روحێکی عەرەبی پاکن.

لە دوای بەرپابوونی شەڕو راپەڕینی **1991** و کەوتنی حیزب و هەڵکەوتنی پێکهاتە دەسەڵاتگەرییە نێوخۆییەکان، بەعس کاری کرد بۆ دروستکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو هێزەی لە گەشەکردندا بوو، بۆ جاری یەکەم بوو لە مێژووی عێراقی هاوچەرخدا پێشوازی لە شاندێکی گەورەی سەرۆك خێڵەکان بکرێ لە کۆشکی سەرۆکایەتیدا لەبەرواری (**29**ی مارسی **1991**) دوا بە دوای ماوەیەکی کەم لە سەرنەکەوتنی رژێمی عێراق لە جەنگی کەنداوداو دامرکانەوەی راپەڕین، لەو سەروەختەدا سەرجەم شاندی خێڵەکان یەك لە دوای یەك رۆشتن بەرەو کۆشکی کۆماری بۆ ئەوەی دروشمی هۆزەکانیان بەرزبکەنەوە وەك نیشاندانی هێمای وەفاداری و پێبەندی.

لە یەکێك لەو کۆبوونەوانەدا سەرۆك داوای لێبوردنی خۆی نیشاندا لەمەڕ ریفۆرمی زەویوزارە کشتوکاڵییەکانی پێشوو کە پردی پەیوەندی نێوان شێخەکان و خاوەن زەوییەکانی نەهێشتبوو. بڕیاری دا زەویوزار دابەشبکرێتەوە وەك پاداشتێك. رۆژنامەکانی عێراقیش ئابروگێڕانەوەی خێڵەکانی بە رێگەی جیاواز گرتبووە ئەستۆ، کە لەبەرنامەکانیدا شێخی هۆزەکانی خستبووە بەری پێشەوە لەبری رێکخراوە خوێندکارییەکان و یەکێتییەکان.



## سەرلەنوێکردنەوەی خێڵەکایەتی
*Retribalization*

سەرلەنوێ دەسکەوتنی بونیادی حەقیقی خێڵە بنچینەییەکان لە دەوری شێخەکان کە نێرکی خێلایەتین زۆر گرانە. کۆچ و جیاوازی بایەخی ئابوریو کۆمەلایەتیەکان و گۆڕان لە شێوازی ژیان و رێکخەری بەهاکان تایبەتمەندییە ژیاریو کەسایەتیەکانی خێڵی لەنێو بردووە. هەتا ئێستاکە هەندێك لەو خێزانە دێرینانە ناو و هێمای خێڵە کۆنەکانیان هەلگرتووە کە ئەمەش بەرەنگاری وێنەیەکی شوناس ئامێز نابێتەوە. بەلام ئەو هەلەی کە رژێم پێشکەشی سەرۆك خێڵەکانی کرد وایکرد هاولاتیانی خۆیان کۆبکەنەوەو ناوی لێبنێن خێڵە دێرینەکان. بەلام سەرۆك خێڵە ئەسڵییەکان، پلەوپایەی بەرزیان وەکی خۆی مایەوە. خێڵە تازە دروستکراوەکان جێی گاڵتەجاڕی خەلك بوون، یەکێك لەو دەستەواژە گاڵتەئامێزانەی خەڵك بەکاریدەهێنن بریتی‌یە لە "شێخ دروستکراوی تایوەنە *Chieftains made in Taiwan*"

ئەگەر رەسەن بن یان ساختە خێڵەکان سەرلەنوی دروستکراوە بوون بەبێ بەشداری خێڵە دێرینەکان، بەلام هەندێك جار بەشداریان تیادا دەکرد. ئەو پێکهاتە نوێیە، بناغە سەرەکیەکەی شارە و پشت بە کشتوکاڵ نابەستێت و لقی ئاشکرای نی‌یە. زۆربەی کات سەرۆکەکانیان لە پیشەکارەی چینی مامناوەند بوون یان هاولاتی ئاسایی بوون یان ئامالّی ئەوان بوون. سەرۆك خێڵە نوێکان لەبری دیوەخانە تەقلیدی‌یەکان، ئەپارتمانیان بەکرێ دەگرت و ناوەندی کارو مومارەسەی شێوازی ژیانی خێڵەکایەتی‌یەکان بەکاردەهێنا.

خێڵە نوێکان پارێزگاریان لە یاساو رژێم دەکردو کاریان دەکرد بۆ چارەسەرکردنی بەریەرەکانێی

نێوان ئەندامەکانی خۆیان و یان نێوان ئەندامانی خۆی و ئەندامانی خێڵەکانی دیکە. ئەو ململانێیانەش یان بازرگانی بوون یان تیجرامی بوون. کە چارەسەری بابەتەکانی وەك خوێنبایی تیادا دەکرا، لەگەڵ گەندەڵی، ناپاکی یاساو دادگاکاندا رژێم پەنای بردە بەر دەوری دیاری خێڵەکان و بەمەندگرتنی بۆ چارەسەرکردنی بەریەرەکانێی نێو خێڵەکە یان لە پێناو پارێزگاریکردندا. ئەم خزمەتە بە داهاتێکی چاك دەگەڕایەوە بۆ ئەو خێڵانە، ئەم خێڵە تازانە سەرچاوەیەکی سەربەخۆی دارایی بۆ خۆیان کۆدەکەنەوە.

لە نیسانی ساڵی *1996*دا رژێم هەستا بە رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و خێڵەکان کە تیایدا پێشنیاری پلانێك کرا بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنێك کە بتوانێت پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە سەرۆکەوە هەبێت، لەگەڵ پێدانی چەکی زەویوزارو پاسپۆرتی دبلۆماسی و جیاکاری سەربازی و لە بەرامبەر ئەمەشدا پێبەندییەکی تەواوەتی. بێجگە لە رێپێدانی یاسایی هەندێك لەو خێڵانە موهیمەی ئاسایشی نەتەوەییان پێسپێردرا، وەك چۆن لە بەرواری تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی *1998*دا لەکاتی ئاشکرا بوونی بەڵگەنامەکانی نێوان عێراق و ئەمریکا رووی‌دا، کە یەکە سەربازییەکان بە جلوبەرگی مەدەنیەوە بەنێو ناوچە گرنگەکانی بەغداد و شارەکانی دیکەدا بڵاوبونەوە بۆ یارمەتیدانی یەکە تایبەتەکانی هێزەکانی ئاسایش لە کاتی بە ئەنجامگەیاندنی پێویستی‌یە ئیستیخباراتیەکانیاندا. لە کاتێکدا ئەم چالاکیانە لە پێشدا ئەرکی سوپای میللی بوو. هەرچەندە سروشتی رێکخستن جیاواز بێت دەوڵەت هەر هێز دەدا بە سەرۆکە نێو خۆییەکان، چونکە ئالیاتەکانی پێشووی لەنێو چوو بوون یان لاواز بوون.

## خێڵ دژی دەوڵەت

### *Tribe Versus State "Redux"*

لەوانە بوو هاوپەیمانی لەگەڵ خێڵە نوێکاندا کار بکاتە سەر زیادکردنی هێزی دەوڵەت و بەڵام ئەم پەیوەندی‌یە بەردەوام هەڵگری گێرمەوکێشە بوو. ئەو رەگەزانەی کۆمەڵ کە وازیان لە پەیوەندی خێڵەکایەتی هێنابوو لەوە دەترسان کە ئەو سەرکردانە کە تازە دەسەڵاتیان بەدەستگیربووە، هەمان رێسا ئاساییەکانی خۆیان لەناوچە شارستانیەتەکانیشدا پیادە بکەن. هەروەها ئەو چەتە خێڵەکیانەی کە لەناوچە گوندنیشنەکاندا بوون جێی گومان بوون. بۆ نمونە، هەندێك کەس لە خێڵی "دۆلیم" کە هەستان بە تیرۆرکردنی رێبوارانی سەر رێگەی بەغداد– عومان. ئۆتۆمبیل و پاسەکان بۆ دوورکەوتنەوە لە مەترسی‌یەکانی دۆلیم بە رۆژی روناك و بەکاروان دەڕۆشتن. هەروەها رێژەی تاوانی تیرۆر بەخێراییەکی زۆر زیادی کرد تا رادەیەك بووە هۆی دروستکردنی شەرمەزاری بۆ وەکالەتەکانی چەسپاندنی یاسایی بۆ هۆزە نوێکان. لەبەر ئەم هۆیە هەندێك لەو بەشانەی کە خێڵەکایەتی نین بۆ ئەم مەبەستە هەستان بە داهێنانی هۆز بۆ خۆیان. حزبیش کۆمەڵێك شکاتنامەی لەمەڕ دژی پێکهێنانەوەی خێڵەکان تۆمار کردووە.

هەروەك خێڵە دێرینەکان خێڵە نوێکانیش هەرەمێك پێکدێنن کە هاوپەیمانیەتیەکان بەردەوام تیایدا لە گۆڕاندایە. لە کاتێکدا هاوسەنگێکی ناپایەدار هەیە، بەڵام ئاسکەو لە لایەن دژەکانەوە پەلامار دەدرێت. چارەسەرکردنی دووبەرەکایەتی نێوان هۆزەکان لاوازی دەوڵەت ئاشکرا دەکات.

لە بەغداد هەندێك لە بەشەکانی خێڵەکایەتی بۆ نمونە کۆمپانیایان دامەزراند کە لەسەر سیستمی سزاو پاداشت دامەزرابوو، بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە دەوڵەتداو لە پراتیکیشدا بە شێوەیەکی ئاشکرا

کارەکانی کۆمەڵگە مەدەنییەکانی ناوچەکانی دیکەمان وەبیر دێنێتەوە. ئەم کولتورە لە کارگێڕی زاتیەوە هەڵقوڵاوەو کۆمەڵگەی عێراقی هان دەدات بۆ جۆرێك لە کارگێڕی زاتی *Autonomy* دوور لە دەوڵەت ئەمەش لە بارودۆخی مانەوەی سەروەت و سامانێکی نەتەوایەتی جیا لە دەسەڵاتی سیاسیدا دەبێ.

نەبوونی ئەو سنورە ئاشکرایانەی نێوان کارمەندانی دەسەڵاتی یاسایی دەوڵەت و سەرۆك خێڵەکان بووە هۆی رووداني پێکدادانی راستەوخۆ لە نێوان وەکالەتەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی خێڵەکان. وەك هەندێك لە سەرۆك خێڵەکان شکاتیان لە کۆمەڵێك بەرپرسانی حکومەت کرد بەوەی کە دەستدرێژیان کردۆتە سەر یاسای عورفی یان بەهۆی ئازادارنی جەستەی ئەندامانی هەندێك لەو هۆزانە لەبەر ئەوەی کە لە حیزب جیابونەتەوە یان بەهۆی کاری تاوانبارییەوە. خێڵەکان هەستان بە کۆکردنەوەی شکاتەکانیان دژی دەوڵەت و کارمەندانی حیزب و داوای تەعویزاتی خێڵەکایەتی یان داوای خوێنباییان دەکرد. هەورەها هەڕەشەی بەکارهێنانی زەبروزەنگ بەکردار تیرۆرکردنی ئەفسەرە سەربازییەکان و ئەفسەرانی ئاسایش لە لایەن ئەندامانی هۆزەکانەوە لە ئارادا بوو، وەك هەوڵێك بۆ تۆڵە سەندنەوە. لە مانگی مارسی *1997*دا ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆرش هەستا بە دەرکردنی مادەی بڕیاری "24" وە تیایدا رێ لە خێڵەکان دەگرێ بۆ بەکارهێنانی هەرکارێك دژی کارمەندانی دەوڵەت لەکاتی رووداني هەر زەرەرێك لە خێڵەکان لە لایەن هۆزەکانیانەوە یان لەکاتی بەڕێوەبردنی کارەکانیاندا.

داڕێژرانی دەوڵەت و حیزب کاری کردە سەر رووداني ململانێی ئاڵوگۆڕ لە نێوان هۆزەکان و دامودەزگاکان. ئەم دەخالەتانەش بەرئەنجامێکی سروشتی بوون لە کارلێکردنی نێوان خێڵەکایەتی دەوڵەتی و خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی. لە قۆناغی یەکەمی خێڵەکایەتی دەوڵەتیدا کۆمەڵگەل و تاکەکان لە نیشتمانە هۆزی خۆیان دەرکران، بەڵام دواجار کە خێڵەکایەتی کۆمەڵایەتی گەشتە ترۆپك جارێکی دی گەڕاندنیانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. ئێستاکە پێویستە رژێم وریا بێت لە هەر ململانێیەکی خێڵەکایەتی کە ئەتوانێت ململانێیەکی وێکچوو لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا بخولقێنێت، بە پێچەوانەوە راستە، چونکە هەر ململانێیەك لە دامودەزگاکاندا رووبدات دەنگدانەوەی خۆی هەیە لەنێو خێڵەکاندا. بۆ نمونە کێشەی "العمید مظلوم الدلیمی" نمونەیەکی باشە بۆ ئەم حاڵەتە، کە تیرۆرکردنەکەی هانی رووداني کۆمەڵێك ناڕەزایی گەورەی دا لە شاری رومادی. هەندێ کەس لە خێڵەکەی خۆشی هەستان بە چالاکی بەرهەڵستکاریی سەربازی یەکلەدوایەك لە بنکەی ئەبو غرێبی سەربازیدا، ئەمەش وای لە سەدام حسێن کرد داوای یارمەتی لە "عەلی حسێن مەجید" بکات.

بەم پێیە گەڕاندنەوەی خێڵەکایەتی ئەبێتە هۆی کەوتنەوەی دەرئەنجامە جیاوازەکان: وەك پێکدادانی نێوان دەوڵەت و خێڵەکان، پێکدادانی نێوان بەشەکانی ئەو کۆمەڵە خێڵەکایەتییەی کە لەنێوچووەو لە نێوان بەشەکانی ئەو کۆمەڵەی کە سەرلەنوێ خێڵەکانی دروسکراونەتەوە، هەروەها پێکدادان لە نێوان خێڵەکان خۆیان و پێکدادان لە چوارچێوەی دەوڵەتدا.

**سەرچاوە:**

*Middle East Report*
*Magazine 215- Sammer 2000*

**سەرچاوەکانی نووسەر:**

*1-Ali Wardi, Mantiq Ibn Khaldun (the logic of Ibn Khaldun) (Bagdad 1962); Ibn Khaldun Muqadima, pp. 136, 143- 44.*

*2-The best treatment of these years remains) Hana Batata, The old Social Classes and Revolutionary Movements in Iraq (Prenceton, NJ: Princeton University Press. 1981).*

*3-Ba'th Membership in 1968 was only 150, though Same estimates put it between 300- 400. Interview, Salah Omer Ali, London, April 3 and 10, 1994.*

*4-Samir Khalid, Republic of fear (Berkeley, CA: University of California Press, 1989). PP. 26- 27.*

*5-Batata, The old social classes and Revolutionary Movements in Iraq. P. 1093.*

*6-Karen Chaadhry "on the way to market" Midle east Report 170.*

*7-Ibn Khaldun, Muqaddima, PP. 119-20.*

*8-Interviews with Hashim Iqabe, folkloric poet, London. January 22. 1996.*

*9-On Iraq shi"ism, see Yitzhak Nakash, the shi"a of Iraq (New Haven, CT, Yale university press 1994) interviews with Ba'th party caders, London Feberuary 1995 and Amman, April- May 1995.*

*10-Al- Hayat, July. 30. 1991.*

*11-Interviews and letters from tribal members residing in Europe, Jordan, Suudi Arabia and Iraqi Kurdistan, iraqi wealthyinport Japanees cars and electroniets The lower classes generally buy cheaper products made in Taiwan.*

*12-Al- Sharq Al Awasat, May 14. 1996.*

*13-Amatzia Bahram "New Tribalism in Iraq: Sadam Hussain Tribal Pololtics" International Jurnal of middle east studies 29 -1997.*

*14-Al. Sharq Al Awasat, march 39- 1997.*

*15-Iraqi news Agency, March 29- 1997.*

*16-Al Wasat, June 26- 1995.*

*"State Socialism"*

# نۆکەر

■ نووسینی: ئەلیستەر ئەلپاین

● و. لە سویدییەوە: ئیدریس ئیبراهیم گەلاڵی

خوێنەری بەڕێز: ئەمە نۆکەرو ئەوە میر، خۆت سەرپشك بە، کامیان هەڵدەبژێری، یان دەبی بەکامیان، ئەمە شانۆگەرییەکە پێویست بە هیچ ئەکتەرێك ناکات، چونکە جیهان خۆی ئەو شانۆیەیە کە شانۆگەرییەکەی تێدا نمایش دەکرێ و هەمووشمان تێیدا ئەکتەرین، لەوانەیە لە خوێندنەوەی ئەم بابەتە، هەندێکمان تەقەی سەری بێ و هەندێکیشمان شاگەشکە ببین، دۆستێك یان هەڤاڵێکی خۆمان لێ بێت بە نۆکەر یان میر، لەوانەشە پڕبین لە: ئەگەرچی، پێویستە، بەلام، دەبێ، دەکا، بکا، ئەوانە قسەی نووسەرەکە نین، بەڵکو ئەوە نۆکەرە، میر بەو چەشنە دەدوێن و رستەکانی پێ درێژ دەکەنەوە یان کورتی دەکەنەوە. ئەمانە سیحری نووسینەکەیە کەوا لە نۆکەر بکا بەکاریان بهێنێ. گرنگیش نییە رستەکان هەر جۆرێ بن، گرنگ ئەوەیە لەو وشانە بگەین، کە لە ژێرەوەی دێڕەکاندا نووسراون و بەدی ناکرێن. میکافیلی و ماك ئەلپاین و (میرو نۆکەر) هەڵمەتیان بۆ دەبەن و پێیان ناگیرێن، ئەی ئەگەر بەوان نەگیرێن، چۆن بە ئێمە راودەکرێن.

بیخوێنەوەو میرو نۆکەرەکانیان تێدا بدۆزەرەوەو دووریش نییە ئەو قەناعەتەت لا دروست بکات کە چۆن هەندێ جار میر لەلای ئێمە دەچێتە خانەی نۆکەرو نۆکەریش دەچێتە خانەی میرەوە. گرنگ ئەوە نییە کامەیان لەسەر کورسی دانیشتوون و هزرەکان هی کێن، گرنگ ئەوەیە، دەستەلاتەکان چین و بۆچی بەکاردێن، کێ رۆلی میر دەبینێ و کێ رۆلی نۆکەر.

کاتی خۆی ئەم بابەتەم بەش بەش، لە گۆڤاری "*Times*" بلاوکراوەتەوە، کە هەر لەگەڵ بلاوکردنەوەی، نزیکەی سەدهەزار دانە زیاتری لێ چاپ کراوەو رەواجی لەسەرتاسەری ئەوروپاو ئەمریکا پەیدا کردووە، ' دوایشیدا لە دووتوێی کتێبێکدا چاپ کراوەو بۆ زۆربەی زمانەکانی ئەوروپا وەرگێڕراوە.

وەرگێڕ

## نۆکەر

میکافیلی، کتێبی "میر"ی نووسی، چونکە دەیویست کارێکی دەست بکەوێ. کاری سیاسی، لە هەموو کارەکانی تر سەرنج راکێشتر بو. شەپۆلەکانی دەریاش هەمیشە مرۆڤی وەك میکافیلی، کە دەیانەوێ بۆ کاری رامیاری بگەڕێنەوە، بەرەو لێوارەکانی دەماڵی. میکافیلی بە لێهاتوویی خۆی و ئەو زانیاریە زۆرەی دەربارەی مێژوو هەیبوو، لەو باوەڕەدا بوو کە دەتوانێ، ئامۆژگاری میرێك بکات، چۆن کارەکانی خۆی بەڕێوە دەبات و چۆن ئەو رێبازانەی، کە لە رووداوەکانی مێژوودا هەڵیدەهێنجێ بۆ سوودی تایبەتی خۆی بەکاربهێنێ. بەڵام مێژوو رێگا نیشاندەرێکی باوەڕپێکراو نیە. بۆیە ئەو کەسەی دەیەوێ یان دەگەڕێ بەدوای خزمەت کردن لەلای میرێکدا کە دوا رۆژی روونە، کارێکی بێ شەرمانەیە، چاوەڕوانی ئەوە بکات، کە ئامۆژگاری میرێك بکات، چۆن کارو فەرمانەکانی ئەنجام بدات، بۆیە پێویست بوو ئەو کەسەی خۆی لە میکافیلی بە (میکافیلی) تر دەزانێ، لە بری ئەوەی ئامۆژگاری میر بکات، کتێبێکی نوسی با، کە تیایدا ئامۆژگاری نۆکەرەکانی میر بکاو میر ژیرترین نۆکەری هەڵبژاردبا و راستەوخۆ، لەلای خۆی، دایمەزراندبایە، بەو شێوەیە، دەسەڵاتی بدابایە، بە میکافیلی کار بکات، بەو شێوەی کە خۆی دەیەوێ، ئەم کتێبە ئەبوایە ناوی نۆکەر با، ئەوەشی روون کردباوە، نەك چۆن میکافیلی ئامۆژگاری میر دەکا چۆن حوکم بگێڕێ، بەڵکو میر فەرمانی بە نۆکەرەکە بکردایە چۆن پەیڕەوی رێبازی میر بکا، چۆن پرسیارەکانی رێك بخات و ئەو رێگایانە بان رێژ بکات، بۆ ئاسان کردنی بەکارهێنانی دەسەڵاتی شازادەو سەرپەرشتی ئالقەی ئەو کەسانە بکات کە لە نزیك میرەوە دەژین. لە کتێبەدا، ئەبوایە، ئەوەشی روون بکردایەوە، کە سیاسی‌یەکان لە راستیدا، هەمان بێ هێزو ناتوانایی، ترس و ترسەنۆکیان تێدا هەیە، کە هاوولاتی‌یانی تر هەیانە. بەڵام ئەوان لە چوارچێوەیەکی داخراودا دەژین و هەست بە هێز دەکەن و ناچارن، بەشێوەیەکی نامەنتیقی گفتوگۆ بکەن، سەرەڕای ئەوەی کە سیاسی‌یەکانیش مرۆڤن، بەڵام ناتوانن خۆیان وەك مرۆڤێکی ئاسایی پیشان بدەن، بۆیە نۆکەر ناوێکە پڕ بە پێستیان. بواری ئەوە هەیە، نۆکەرەکان، خەڵك هەڵخەڵەتێنن و بە ئاقارێکی تریاندا ببەن. نەك لەبەر ئەوەی حەز دەکەن، یان دەسکەوت بەدەست دێنن. بەڵکو بۆ ئەوەی، داهاتووی بیرو بۆچوونەکانی میر مسۆگەر و دڵنیا بکەن.

لەو کتێبەدا، دەمەوێ هەندێ، فرت و فێڵ دەست نیشان بکەم، کە لە رێگایانەوە مرۆڤ بتوانێ بیر (هزر)ێك لەو زەوییە ناهەموارە بدۆزێتەوەو دەستەڵاتی بەتەواوی مسۆگەر ببێت.

هزر شتێکی پڕ بایەخە بۆ میر ئەو فەلسەفەیە کە میر چۆن بنەمای گفتوگۆکانی خۆی دابڕێژێ، هزری ئامانجەکانی میری تێدایە کە بۆ خەڵکانی خۆی خەبات دەکا. هزر ئەوە دەست نیشان دەکات، کە میر چۆن، قەڵەمڕەوی خۆی فراوان بکاو پێشبڕکێ لەگەڵ دەستەڵاتدارەکانی تردا بکا، هزر سەنگی مەحەکی موراڵەی خەڵکەکەیەتی. هزر لەگەڵ میر دەست پێ دەکات، ئەگەر هەندێکیش بیانەوێ ئامۆژگاری بکەن، ئەوە لە راستیدا خۆی کەوتۆتە ژێر کاریگەری هزری دەسەڵات. میر دەستەڵاتی خۆی لە هزرەوە هەڵدەهێنجێ. میر پێویستی بە هزرە. بۆ ئەوەی بڕیاری پێویست بدات: کە بەهۆیەو دەسەڵاتی بپارێزێ. بەبێ هزر مرۆڤ هیچ نییە.

کاتێ من لەو کتێبەدا باس لە میر دەکەم مەبەست هەموو سەرکردەیەك نی‌یە، بەڵکو مەبەستم ئەو میرەیە کە تەواو بێ هەڵەیەو بەرزترین روحی

هەیە کە پێویستە هەموو میرێك هەیبێ. میر دەسەڵاتی خۆی بۆ سوودی خەڵکە، تەنیا بۆ ئەوە دەسەڵاتدارە. هزر پارمەتی میر دەدات، کە دەستەڵاتدار بێت. ئەوە میر نییە. لە ناکاو سەرپەرشتی پێداویستی مرۆڤەکانی تر بکات. ئەگەر میر هەستی بەوە کرد، کەسانی تر هەن، دەیانەوێ هزرەکانی تێك و پێك بشکێنن، یان پاش ماوەیەکی تر نەیەڵن هزرەکانی ئەنجام بدات. ئەوە پێویستە میر هزرەکانی خۆی بگۆڕێ و خۆی میرایەتی خۆی هەڵوەشێنێتەوە.

لەو کاتەدا ئەو تەنیا، خاوەن فەرمانێکە کە رۆڵی ئەوە بەدیار ناخات کە لە راستیدا میرەو سەرکردەی ئەو نۆکەرانەش نییە کە خزمەتی دەکەن، کەس باوەڕ بە هزرەکانی ناکات. وتوویانە، هیچ شتێك هێندەی هزر دەستەڵاتی نیە. لە کاتێکدا کە خۆشی دێت. رۆڵی نۆکەر ئەوەیە، خزمەتی هزرە راستەکانی میر بکات. کە ئەوەی کرد ئەوە نیشان دەدات، کە هزرەکان مسۆگەرن و کاتەکانیشیان پێ گەییوە.

نۆکەر ئامرازی میرو هزرەکانیەتی نەك هی دەوڵەت، دەوڵەت نۆکەری خۆی هەیە، بەرپرسیارەو بۆی دڵسۆزە، بۆیە بە گۆڕانی میرو هزرەکان، نابێ خۆی لە دەوڵەت بدزێتەوە.

من لەو لاپەڕانە، کە باس لە نۆکەر دەکەم، مەبەستم تەنیا یەك مرۆڤە یان بەشێوەیەکی تر بڵێم، مەبەستم ئەو لێپرسراوەیە کە سەرپەرشتی دەزگایەکی تایبەتی دەکا، من مەبەستم لە تەواوی دەست و پێوەندەکانی میر یان لێپرسراوێکی سیاسی کابینەکە نییە. ئەگەرچی ئەم خزمەتکارانە بە گشتی پێك هاتوون لە دارو دەستەکانی میرو ئەندامی کابینەکان. لەم نووسراوەدا دەمەوێ بەتەواوی لە ئاستێکی بەرز باس لە وشەی "نۆکەر" بکەم و روونی بکەمەوە. جیاوازی نێوان میرو نۆکەر ئەوەیە کە میر وەك دەسەڵاتدارێك دەسەڵاتی هەیە، نۆکەر ئەو دەسەڵاتە بەکاردێنێ کە لە پەیوەندی خۆی لەگەڵ میردا سەرچاوە دەگرێ تا بتوانێت لە رێگای ئەو هەڵبژاردنە، توانای خۆی بەکاربێنێ.

ئەوە کاری نۆکەرە، یارمەتی میر بدات و بیروبۆچوونەکانی بۆ هەواداران روون بکاتەوەو بتوانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ تا وەك پشتیوانێك رێکیان بخات. نۆکەر دەبێ سوود لە هزرەکانی وەربگرێ، بۆ ئەوەی تواناو لێهاتوویی هەوادارانی میر بەکاربێنێ و زۆرترین پارە کۆبکاتەوە، هەروەها سوود لە هزرکان وەردەگرێ هەتا بەلانی کەم کەمترین پارە لە خەڵك بەدەست بێنێ. چونکە ئەگەر هەر کەسێك بە پارەیەکی کەمیش پشتیوانی ئەو هزرانەی کرد، ئەوە بە شێوەیەکی قانونی بەدیاری دەخەن کە میر مافی ئەوەی هەیە دەسەڵاتدار بێت. ئەو پارەیەی نۆکەر کۆی دەکاتەوە، بۆ بانگەشەکانی میر بەکاردێت و بەو پارەیە ئامۆژگاری مرۆڤی شارەزا دەکاو وەك کارێکی هونەری کاریگەری لەسەر دەنگدانی خەڵك بۆ میر دەبێ. کارە سەرەکیەکانی میر ئەوەیە کە هزرەکانی دابڕێژێو رایان بگەیەنێ، نۆکەریش بانگەشەکانی میر رێك دەخاو بە هیچ شێوەیەکیش نابێ لە یادیان بکات کە تەواوی سەرەداوی بانگەشەکان بۆ میر بگێڕێتەوە. بۆ میر گەلێك گرنگە کە بزانێ تەنیا ئەوە باوەڕی خەڵکی بۆ خۆی بردۆتەوە، چونکە دوای سەرکەوتن هەڵبەتە زۆر هەن، سەرکەوتنەکان بۆ خۆیان دەگێڕنەوەو داوای پاداشت دەکەن. ئەو میرەی بەهەوڵ و تەقەلای کەسانی تر، دەگاتە دەسەڵات دەبێ باش بزانێ و وەك رۆژ لێی روون بێ، کە دەسەڵاتداریەکەی تا سەر مسۆگەر نابێت و بەهەمان شێوە، بە هەوڵ و تەقەلای ئەوان، دەسەڵات لە دەست دەدات.

ئەو میرەی تەنیا بەهێزو بازوی خۆی دەگاتە دەسەڵات. هەستیش بە مسۆگەربوونی دەسەڵاتەکەی دەکات، نابێت جارێ رێزو پاداشتی کەسانی تر

بداتەوە کە خەباتیان کردوە چونکە تا ئێستا خۆی خاوەنی دەسەلاتەکەیشە.

خەلك زۆر بە زەحمەت باوەڕ بەو میرە دەکەن کە بە بەخت یان بە هاوکاری کەسانی تر بە دەسەلات گەیشتووە. میر ئەبێ هەمیشە وشیار بێت کە لە چاوتروکاندنیشدا نابێت خەلك هەست بە بێدەسەلاتی و لاوازی بکەن. میر دەبێ خاوەن دەسەلات و دوارۆژ بێت. خاوەن هزر بێ ئەگەر دەسەلاتی دزی بێت، ئەو تەنیا میرێکە وازی بە دەسەلاتی خۆی دەکاو چاوەڕوانی ئەوە دەکا کە یەکێکی تر دەسەلاتەکەی لێ بستێنێ و تەخت و تاجەکەی تێك بدات. پێویستە نۆکەر بانگەشەکەی میر بگێڕێت و سەرپەرشتی ئەوە بکات، چۆن ئۆرگانەکەی کار دەکات. میر پێویستە ئەوە روون بکاتەوە کە چۆن نۆکەر سەرپەرشتی ئۆرگانەکە بکات و کاریکات، زۆر بە وردیش ئاگاداری خۆی بێ و ئەو رێچکانە دیاری بکا کە چۆن جاردەرەکان بیرو هزرەکانی بەکاردێنن. هزر پێویستی بە ئۆرگانێکە بۆ کاتی گەیشتنی هزرەکان، بەلام ئۆرگان بەتەواوی جیاوازی لەگەل هزردا هەیە.

هزر زۆر بەخێرایی گەشە دەکات کاتێ نەگۆڕ بێ، بەلام ئۆرگان بە گوێرەی گۆڕان یان پێویستی گەشە دەکا. ئەزموون سوودێکی زۆری بۆ ئۆرگان هەیە، بەلام هیچ سوودی بۆ هزر نییە. هزر تەنیا کاتێ توانای هەیە کە ئەگەر میر لێی هەلنەگەڕێتەوە. نۆکەر دەزانێ رۆل و تایبەتمەندیەکانی چین، چونکە لە دلی هەر نۆکەرێك میرێك دەژی و حەز دەکا نەجیب زادەو چاپووك و بەناوبانگ و دوارۆژی روونی هەبێ. ئەمە مافی خۆیەتی کەوابێ میر بۆی سیمبولێکە. نۆکەر هەمیشە دەیەوێت لە دلیا میر هێمن و بێ دەنگ بێ، چونکە ئەگەر ئازایەتی و چاپووکی لە دلیا دۆزرایەوە، ئەوا زیرەکی نۆکەرەکە دەبێتە نەخۆشیەکی بێ دەرەتان، بۆیە دەبێ نۆکەر هێزو چاپوکی و زیرەکی خۆی دەست بەسەردا بگرێ و سوود لە هێزو توانای خۆی تەنیا بۆ خزمەتی میر لێ وەبگرێ، بەلام بە پێی تێپەڕبوونی کات ئەو نۆکەرە دەبێتە میرێك لەناو نۆکەرەکاندا.

نۆکەر بۆ ئەوەی کارەکانی خۆی رایی بکات پێویستی بە "سیحرێکە". من مەبەستم لە کۆمەلەی تایبەتمەندی کەسایەتی هەمەجۆری نۆکەرە، کە هەیەتی. سیحر رووپۆشی دەرەوەی نۆکەرە، کاتێ خۆی تێکەلاوی جوولانەوەکە دەکا. سحر دیوارێکە لە پەنای خۆی دەشارێتەوە لەوانەی باشی دەناسن. سحر تەنیا ئەو راستیە نییە کە پارێزگاری لە کەسایەتی نۆکەر دەکا. لە مێژوودا هاتووە کە سحر گرێ کوێرەیەکە رۆژانە سوودی لێ وەردەگیرێ لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی ئەو کەسانەی کە هەمیشە سەردانی دەکەن. سحر بێبەزەیییە، پێویستە بەگوێرەی بۆچوونەکانی نۆکەرەکە هەلبژێردرێ، نەك لەبەر ئەوەی نۆکەرەکە دەیەوێ بەرامبەر هاوکارەکانی بەکاربێنێ. نۆکەری راستەقینە هەرگیز خۆی بەم شتانە هەل ناخەلەتێنێ. نۆکەر تەنیا بۆ ئەوەیە، وزەو یارمەتی پێ بدات، خزمەتی هزری میری پێ بکا. سحری نۆکەر، سێ مەبەستی سەرەکی هەیە: خۆشەویستی، ترس و قین، دلسۆزی، هیچ بایەخێکی لەو جیهانە نیە کە لە میرو نۆکەرەکان پێك هاتووە. باوەڕکردن بە دلسۆزی، تەنیا ئازارو پەشیمان بوونەوەیەکی قولی بەدواوەیە. دلسۆزی تەنیا، کەرەستەیی رۆمان نووسەکان و سەگە بەوەفاکان و تایبەتمەندی ئەسپەکانە. لە بازنەی میرو نۆکەراندا، دلسۆزی لەگەل بارودۆخەکە گەشە دەکا. ئەگەر لەناکاو تووشی دلسۆزی بووی، سوپاس گوزاری بە، بەلام هەرگیز چاوەڕانی دلسۆزی مەکە، با لە بەرنامەکەشتدا نەبێ، ئایا نۆکەرەکە دلسۆزە؟ نۆکەر تەنیا بەرامبەر هزرو میرەکەی دلسۆزە کەسی تر نا، چونکە ئەو بەتەنیا باوەڕی بەو دوانە هەیە تەنیا کاتێکیش کە ئەم دوانە یەك بن، باوەڕ

"غەریزەیەکی" زۆر لە دڵسۆزی بەهێز تـرە. دڵسۆزی ئەو هەستەیە، کە باوەڕ دەمرێ ئەو دەمێنێتەوە.

میکافیلی، دەڵێ: "پێویستە، میر هـەوڵبدا واز لـە قین بێنێ" بەڵام قین مەبەستێکە لە سحری نۆکەر.

پێویستە سحر بەجوانی خۆی بڕازێنێتەوە، بـەڵام قینێکی کەم، وەك بەردێکی تیژکراوە بـۆ سحرو هـێز بە سحر دەدات، بەڵام سەرەڕای هـەموو ئەمانـە سحر پەڵەیەکە بـاوەڕێکی زۆری پـێ دەدا، تـرس بەشێکی تری یارمەتی‌یە. بۆیـە هەمیشـە باشـە ترسێکی کـەم هـەبێ. گـەرچی تـرس شـوێنێکی دەبـێ، نـەك لـە پیاوەکـە خـۆی، بـەڵکو لـە دەوروبـەر. بـەڵام خۆشەویستی بە پێچەوانـەوە پێویسـتە لاقـاوێك بـێ یارمەتی ئەوەش بدات کە کەمترین هـێزی فـەرمانێکی جوان، لە دوای خۆی بشارێتەوە. ئارەزوو بەشێکە لـە خۆشەویستی، بابەتێکـە زۆر قسـەی لەسـەر دەکرێ، بەڵام ئەوە لایەنێکی بـێ هـێزی نۆکـەرە، لـەو هـەل و مەرجەدا دەبێتە هۆی شڵەژانی بیرەکانی نۆکەرو هیـچ سنورێکی تریشی نی‌یە، کە خۆی ئامادە نەکا بۆ ئـەو خۆشەویستی‌یە. ئەوەت لەیاد بێت، کـە مـن بـاس لـە سحری نۆکەر دەکـەم، نـەك لـە خـودی خـۆی کـە لـە ڕاستیدا چۆنە. نۆکەر دەبێ بۆ خۆشەویستی بە توانـا بـێ، ئـەبێ ئاگـاداریش بـێ، هیـچ خۆشەویسـتێکی ڕاسـتەقینە نی‌یـە، کاریگـەری لەسـەر مـەزندەکان دانەنێ. خۆشەویستی بەڵگەیەکی زۆر گرنگە، ئەگـەر نۆکەرێ بیەوێ باوەڕ بە کەسێکی تر بێنـێ کە بـاوەڕ بـە هزرەکـانی بکـات، سـەرەتا پێویسـتە نۆکـەر هزرەکانی خـۆش بـوێ. خۆشەویسـتی بـەهێزترین چـەکی دەسـتی نۆکـەرە، کە دەیەوێ بـیری مـرۆڤ بگۆڕێ، زۆر کەس سەیری ئەوە دەکەن نۆکـەر چـەند حەز لە هزرەکان دەکـاو لێی دەکۆڵێتـەوە، هـەندێکی تر سەیری ئەوە دەکەن، نۆکەر چەند خۆشی دەوێـن، بۆ ئەوەی گوێی لێ بگرن. ئەگەر نۆکەر بیەوێ بـاوەڕ بـە کەسانی تـر بکا، بـاوەڕ بـە هزرەکـانی بکـەن، پێویستە پێشـەکی مرۆڤـەکانی خـۆش بـوێ، ئەگـەر ئەمـە بـە ئـارەزووی نۆکەرەکـەش نـەبێ، بـەڵام نابـێ هـەرگیز باسی بکـا. بـەهیچ شـێوەیەکیش بـیری لێ بکاتەوە. بیر پەیوەندیـەکی ئاسـانە، هـەروەك وشـە. خۆشەویسـتی یـەکێکی تـر، بـەرزترین فۆرمـە بـۆ دوو ڕوو، چونکە دەیـەوێت بیکـا بـە لایـەنگیری بۆچوونـی شتەکان و بەهیچ شێوەیەك نابێ نکوڵیان لێ بکات، بۆ ئـەوەی بۆچوونـەکانی پـێ بگوڕێـت. مـن وشـەی خۆشەویستی بەکاردێنم، هەر شتێکی دەروونی هەیە. نۆکەر نابـێ، هـەرگیز، پەیوەندیـەکی فـیزیکی لەگـەڵ یەکێکی تر بکـا، کـە دەیـەوێ بۆچوونـەکانی بگـۆڕێ. ئاقوس لێ دەرەکان، لە نۆکەر زیاتر حەز لە لەشی تـر دەکەن. بەڵام چاوپۆشی لە ئارەزوەکـە دەکـەن و لـە دەروونی خۆیان پەنگی پێ دەخۆنـەوە. دەڵێـن "مـن ئەو مرۆڤەم خۆش دەوێ، کە بۆ بـەرژەوەندی کـاری خۆمـی هەڵدەخەڵـەتێنم" ئـەوەش، ئەبێتـە ئاسـان کردنـی کارەکـانی مـن و بـەرژەوەندی مـیر. بـەو خۆشەویسـتی‌یە فیزیکیـە، دەتـوانم بۆچوونـەکانی بگۆڕم. ئەمە تەڵەیەکە وازی لێ بێنە.

لە ڕاسـتیدا نۆکـەر زۆر مەبەسـتی تـری هەیـە کـە سحرەکان بەکاربێنێ، بـەڵام خۆشەویسـتی و تـرس و قین، سێ کوچکەی هەستیارن لە کارەکانی نۆکەردا.

نۆکەر ئەبێ کاریکی وا بکا، هەموو کەسێك بـاوەڕ بە سحرەکانی بێنێ، بێجگـە لـە خـۆی، نۆکـەر پێش ئەوەی دەست بەکار بـێ بـۆ دۆزینـەوەی سـحرەکانی پێویستە، هەموو کارو نیشانەکانی خۆی بـەدیار بخـا. لـە کاتـە هـەرە ناخۆشەکانیشـدا نۆکـەر دەتوانـێ جیاوازی لە نێوان خۆی و سحرەکانی نێوان ڕاستی و ڕاسـتی‌یەکانی تـر ببینـێ. نۆکـەر ئەگـەرچی بـە شەرمیشەوە، تەماشای سحرەکانی خۆی بکات، بەڵام وەك سێبەرێك بە دوایاندا دەجووڵێتەوە، دەزانـێ کـە ئەمانـە گرێ کوێرەی فێڵەکانیـەتی ئـەبێ بـەدڵێکی سافەوە، باوەڕی بە هزرەکە هەبێ. نۆکەر نابـێ ڕێگـا

بدا، کاتێ سوود لە سحرەکانی وەردەگرێ و مۆسیقایان بۆ لێدەدا، نابێت هیچ شتێك دزە بکاتە ناو هرزەکانی، تا ئەم کارە ئەنجام بدات، پێویستە باش تێی بڕوانێ و کاولی نەکاو بەشێوەیەکی وەهم هەڵس و کەوت بکا، کە خۆی ترسی ناکۆکی نەبێ کاتێ کارەکە لەگەڵ سحرەکە ئەنجام دەدات. کاتێکیش ڕووداوێکی پڕ دەردەسەری ڕوودەدات، ئەوا نۆکەرەکە خۆی لەگەڵ ناکۆکی سحرەکە ڕووبەڕوو بۆتەوە بۆیە ڕووی داوە، زیرەکی نۆکەرەکە لەوەدایە کە حسابێکی ورد بکا کاتێ دەیەوێ بخولقێنێ. هۆکارەکانی پەیدابوونی ئەم جۆرە ناکۆکییانە لە سحرەکەدا، پێویستە زۆر بە وردی و ڕوونی بیسان شارێتەوە، تەنیا لەکاتی پێویستیدا ئاشکرایان بکا، چونکە ئەمانە بۆ خەڵك بەشێوەیەکی ناسروشت و کەم و کوڕی لە ئاکارو نیشانەکانی نۆکەر بەدیار دەکەون. کارو سحرەکانی نۆکەر هەندێ کات بەتەواوی لەیەکتر جیاوازن. لەوانەشە بە دوو شێوەی جیاواز چارەسەر بکرێن بەڵام هەرگیز نابێ نۆکەر ناچار بکرێ یەکێکیان لەنێوان کاری پێویست و سحر هەڵبژێرێ. ئەم توانایەکی زۆر بەنۆکەر دەدا، خەڵکیش لەسەر ئەو زانیاریانەی کە لەسەر سحرەکان هەیانە حوکم لەسەر نۆکەر دەدەن. خەڵك حەز دەکا ئارام بێ و لەهەمان کاتدا دان بە جل و بەرگی سەربازی و مەدەنیدا دەنێن و حەز دەکەن بزانن نۆکەر چۆن دەیان پۆشێ چونکە خەڵك هەرگیز بنج و بناوانی نۆکەر ناناسن و نازانن، ئەو چۆن خۆی بەدیار دەخات. ئەگەر هاتو بەگشتی زانرا کە نۆکەرو سحرەکان یەك نین، ئەوە زیرەکییە بۆ نۆکەر کە واز لە پیشەکەی بێنێو بگەڕێتەوە ناومالی و خێزانی خۆی، خەریکی کێڵانی زەویەکەی بێو دارو درەخت بڕوێنێ کە ئەمە باشترین شێوەی مەدەنیەتە. باشترین کاریش بۆ پیاوە سیاسیەکان، ئەوەیە کە باخ دروست بکەن بەتایبەتی لە کاتێك کە واز لە سیاسەت دێنن. بەناوبانگترین باخی سی چو "Suchou"ی چینی وەزیری ئابووری دروستی کردووە کاتێ بەشێوەیەکی کاتی وازی لەکاری سیاسی هێنا. نۆکەر دەبێ ئەوە باش بزانێ کە شانازییە بۆی کە خەڵك هەڵ بخەڵەتێنێ، بەڵام بێ ئابڕووییە، خۆی هەڵ خەڵەتێنێ. پێویستە نۆکەر هەمیشە ئەوەی لەیاد بێ کە سحرو نۆکەر بە پلەی دووەم لە دوای هزر دێن.

میر، هزر، نۆکەر، سێ قاچی کورسییێکن، بەم پێیە هەر یەکێکیان وەردەگری، هەر قاچێکیش وەك ئەوەی تریان بەسوود و گرنگە، هەریەکەیان ڕۆڵ سنورێکی واتادارو دیاری کراویان هەیە. میکافیلی لە کتێبی میر دەیەوێ بەو شێوەیە میرێك داوا بکا "میر پێویستە، چارەسەرکردنی کاری ناشایستە بە نوێنەرەکانی بسپێرێ، خۆشی سۆزو بەڵێنەکان جێبەجێ بکات" ئەوە تاکە وازییەکی هاوبەشە لە کتێبی "میر" لە پەیوەندی نێوان میرو نۆکەردا سەردەمانێك میکافیلی ژیانی خۆی تایبەت کردبوو بە پێشنیاری سیاسی.

بۆچونەکانی جیهان بە شێوەیەکی گشتی "میکافیلستییەکان لەگەڵ کاری چەپەڵ، هەڵخەڵەتاندن و دووڕوویی پێکەوە دەبەستنەوە". من ئەمانە بەم شێوەیە بەدیار دەخەم و زیاتریش لەو باوەڕەدام ئەمە هەستێکی بەهێزە لە خوێنی میردا، کە نۆکەرو هزرە ئەگەر بەو شێوەیە کاربکەن. سەرکەوتنی باش لە دەسەڵاتی دەوڵەت بە دەست دێنن و نەتەوەکە ئایندەیەکی ڕوونی دەبێ، باشتریش ئەبێ ئەگەر ئەم سێ هێزە پێکەوە کاریکەن و بزانن چۆن ئەم دوودڵییە یان سێ کوچکەییە بەکاربێنن. من مەبەستم ئەوە نییە، نەتەوەیەك، لە ناو بچێت، ئەگەر یەکێك لەو هێزانە تێك شکا بەڵکو مەبەستم لەو توانایە ئەوەیە ئەم سێ کوچکەیە پێکەوە ئەتوانن بۆ

دەوڵەت شکۆمەندو مەزن بن. ئەمانە بیرو هزری نەجیب زادایەتین.

ئامانجی سەرەکیم لەم کتێبەدا ئەوەیە، کە تەواوی فرۆوفێڵەکانی نۆکەر کە بەکاریان دێنێ، دەست نیشان بکەم، بۆ ئەوەی میر وەك خاوەنی دەسەڵاتێك بمێنێتەوەو هزرەکانی بکا بە راستی. کاری نۆکەر، ئەوەیە بزانێ کە هیچ کۆسپێك بەهۆی هزرەوە نابێ بە راستی، ئەم کتێبە، بۆ ئەوانە نییە، کە دەیانەوێ و ئامادەن سازش بکەن. بە پێچەوانەوە، ئەوانە دوور دەخاتەوە. هەروەها باسیش لە ئامۆژگارییە سادەو لاوازەکان ناکات، داخوازی ئەو قوربانیانە دەکا کە بەهۆی زانیارییەکان ئەنجام دەدرێن و هێرش و پەلامار، لەوانەیە، ببنە هۆی سەرکەوتن.

بۆچون و تێڕوانینەکان لە رەفتاری نۆکەردا لە چەندین سەرچاوەوە وەرگیراون.

پەیوەندی نێوان میرو نۆکەر، وەك پەیوەندیی نێوان بەڕێز پیك ویك "*Mr. Pickwick*" و بەڕێز سام ویلر "*Mr. Sam Weller*"ن و لایەنە بەهێزەکانی خزمەت کردنیش لە نێوان بێرت وستێر "*Bertie Wooster*" و جیفیس "*Teeves*" نییە. دیکنس "*Dickens*" و ود هاوس "*Wodhouse*" ئەو نووسەرانە نین، کە سیاسەتمەدارانی سەردەم هەوڵدەدەن، ئامۆژگارییەکانیان لێوەربگرن، بەڵام پێویست بوو خۆیان بن واتە ئەوان.

بەکارهێنانی دەسەڵات، روون و ئاشکرایە، هەموومان دەزانین کە لە هەندێ ئامانج گەیشتووە. بەکارهێنانی تواناش کاتێ بەدیار دەکەوێ کە شتێك روودەدات، کەسیشمان نازانین کێ خۆی لە پشت پەردەکە مەڵاس داوە، دەسەڵاتی قۆناغی سەرەتاییە، بۆ ئەو کەسەی کە لە پێشدا توانای هەبووە. نۆکەر ئەو مرۆڤە بەتوانایەیە. ئەگەر هەر کاتێکیش بەدوای فریودان گەڕاو ویستی دەسەڵات بەکاربێنێ با زیاتر نۆکەرایەتی نەکاو پێویستە دەربکرێ. چونکە خوازیاری بەکارهێنانی دەسەڵات بەدیاری دەخات، کە هەڵپەو ئارەزووی میرایەتی دەکا. لە هەمان کاتیشدا نۆکەر گەوجی و گێلایەتی و زۆرزانی خۆی بەدیاردەخا، ئەوە باش بزانێ کە وزەو توانا وەڵامێکی بەهێزە بەرامبەر بە دەسەڵات. تەنیا یەك شێوە دەسەڵاتیش هەیە، کە جارجارە پەنای بۆ دەبا، ئەویش، ئەو دەسەڵاتەیە کە هەڵپەو ئارەزووی ئەوانەی تر تێك دەشکێنێ و لەناوی دەبات، یان بەشێوەیەکی تر دەسەڵات کە نەگەتیڤ و لە هەوو شتێك خۆشترە.

هەرکامێك لە هۆکارەکانی مرۆڤ بن، گرنگ نییە، کە هێشتا بە دیار نەکەوتبن، چونکە ئارەزووە راستەقینەکان رۆڵ دەبینن. پێویست بەوە ناکات کەنۆکەر کردارەکانی مرۆڤ بنووسێتەوە. ئەمانە شتی بێ سوودن، تەنیا کردارەکان حسابیان بۆ دەکرێ. ئەوەی داهاتوو، چ باوەڕێکی بەسەر هۆکارەکانی میرەوە هەیە. ئەمەش هەر بێ سوودە. نۆکەر بۆ ئێستا دەژی و پێویستە لە قازانجی میردا بێت. نۆکەر هیچ بەرژەوەندییەکی بە رابردووەوە نییە، پێویستیش ناکا بیری لێ بکاتەوە، چۆن مێژوو حوکم بەسەر میردا دەدات، یان کاریگەری لەسەر کردارەکانی دادەنێ. ئەمە پێویستە رابردوو وا رێك بخات، کە لەگەڵ میردا بگونجێ. بیرەوەری سەدەکانی رابردوو کە لەلایەن مێژوو نووسەکان نووسراوەتەوە بەڵگەی کەمن بۆ سەلماندن، ئەو مێژوو نووسانەی کە هەوڵ دەدەن، بەڵگەنامەکان بۆ ئەو گروپە یان ئەوی تریان بنووسنەوە، هەمیشە بە ئارەزووی خۆیان دەیشێوێنن و بەپێی سیاسەتی سەردەم دەیگۆڕن. مێژووی پێش میکافیلی بنچینەیەك بوو بۆ ئەو کە بە کاری بێنێو بڕیاری لێ بدات. دوکۆمێنت و رۆژنامەکانی سەردەمیش بوونەتە بەڵگە بۆ مێژوونووسەکان. هیتلەرو ستالینیش

مێژوویان دووباره نووسییەوە. ڕۆژنامەكانی ئێستاش ئەم دەنووسنەوە.

میر و نۆكەر و هەوادارەكانیان دەتوانن فەرمان شەنەبا بكەن، كاتێ دانەوێڵەكەش پاك بووەوە، بڕیاری خۆیان بدەن، مرۆڤیش بەم شێوەیە دەزانێ كە بایەكە ڕووی لەكام لایەو چەندیش بەهێزە، كاتێ نۆكەر بڕیار دەدات ئەبێ پشت لە مێژوو و شاكاری مێژوو نووسەكان بكا مێژووش تەنیا ئەوكاتە بەكەڵكە كە كردارەكان بە تەواوی ئامادە بن و میر بڕیاری خۆی لەسەردابن. لە مەندێ بواری تایبەت، وەك لەدایكبوون و مردن، كۆتایی ڕووداوەكە بەدیار دەكەوێت و بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ مێژووەكەی لێكبدرێتەوە. بۆ نموونە، ناشێ، رابگەیەندرێ، كە ناپلیۆن "Napoleon" لە واترلو "Waterloo" شەڕەكەی بردووە، بە پێچەوانەشەوە مرۆڤ دەتوانێ بڵێ بلوخێر "Bluche" یان ویلین گتون "Wellington" شەڕەكەیان بردەوە. گەرچی لە ڕووداوە گەورەكاندا، تەنیا شوێنی یەك لێكدانەوە هەیە. بەڵام لە ڕووداوی بچووكدا هەمیشە راستییەكان تارمایی دارن و تەنیا ئەوانە راستیە كە هەستی پێ دەكەن، كە خۆیان لە نزیكیەوەن و تاكە راستێكیشە، كە دەبێتە راستییێكی ڕوون و ئاشكرا، ئەگەر ئەو راستیەش هەڵەبێ، بەڵام لەو راستیەدا هەموو سەرئەنجامەكان بە كردەوە هەن. زۆریە لەو باوەڕەدان، كە راستی نەگۆڕە، راستی ئەوەیە مرۆڤ باوەڕی پێ بێ، كەواتە نۆكەر دەتوانێ راستی بخولقێنێ.

ئەوە گرنگە بزانرێ، كە بەڵگەیەكی باوەڕ پێكراو بەهێزترە لە راستی. وازم لێ بێنن، با ئەو موعجیزەیە بكەمە نموونە، راستی راستەقینە تەنیا بۆ خوایە. ئەوە موعجیزەیەكە كە باوەڕی پێ دەكەن، زۆریەی ئەوانەی نەیان دیوە باوەڕی پێ ناكەن. نۆكەر بەدوای راستییە حەتمیەكەدا ناگەڕێ بەڵكو ئەو بۆچوونە پەیدا دەكا، كە باشتر لەگەڵ میر دەگونجێ، نۆكەر ئەو بۆچوونە بڵاو دەكاتەوەو رایدەگەیەنێت، تا دەبێتە بەڵگەیەكی چەسپاو، بۆ ئەوەی ئەم وتوێژە بەردەوام بێ و راستییەكە ببێتە راستییێكی ڕوون و ئاشكرا، نۆكەر پێویستە بەڵگەی نوێ وەدەست بێنێ و وتوێژەكەی لەسەر هەڵبچنێ، ئەگەرچی حەقیقەتەكەش لە راستی زۆر دووربێ، كاتێ بە باشی چەسپا هەموو خەڵك لە دەوری كۆدەبنەوەو جێگیریش دەبێ، بە پێچەوانەوە بەڵگەی ساختە، وەك بەڵگەیەكی راستی بەدیار دەكەوێت و نۆكەر بەزیرەكی و زۆر بە ئاسانی بەڵگەی راستی نیشان بدات، نابێت وتوێژەكانی بە تەمبەڵی و بەشێوەیەكی درۆزنانە هەڵبچنێ.

با باس لە ڕووداوی فاتیمەندەر "Fatimaunder" بكەین، كە لە ساڵی *1936* لە پرتوگال ڕوویدا، خەڵك ئەم ڕووداوەی بینی یان باوەڕی بەخۆی كرد كە بینیویەتی، كە ڕۆژ لە دەوری زەوی خولایەوە، هەندێكی تریان ئەوەیان بە یاسایەكی دژی سروشت زانی و باوەڕیان بە موعجیزەكە نەبوو، ئایا ئەم موعجیزەیە چۆن ڕوویدا، ئەمە هیچ گرنگ نییە، بەڵكو ئەوە گرنگە كە خەڵكەكە چۆن باوەڕ دەكا، بۆچی دوودڵی كەوتە نێوان خەڵك و هەندێ باوەڕیان كردو هەندێكی تر ئەو ڕووداوەیان بە شتێكی حەتمی زانی؟

ئەوە لە توانای مرۆڤ بەدەرە، راستیەك بەهۆی گریمان یان بەهۆی گریمانكارییەكی تر بیسەلمێنن. هەروەك ڕووداوەكانی تر، چۆن موعجیزەكە لێكبدرێتەوە یان باوەڕ بە خەڵك بكەن. كە ئەمە ڕووی داوە.

لەوكاتەی كە تیۆرەكانی نۆكەر دەخرێنە بەرباس، ئەبێ ئەوان باس لەوە بكەن كە خەڵك بەگشتی باوەڕیان پێی هەیە، بەڵام پێویستە ئەوان،

خۆ لەم جۆرە شتانە بەدوور بگرن، ئەوکاتەی بە تەواوی و چالاکانە، خۆیان بۆ شێتایەتی ئامادە دەکەن. ئەمەش هۆی ئەوەیە کە نۆکەر پێویست ناکا باس لە بۆچوونە گشتی‌یەکانی خەڵك بکا، بەڵکو ئەو هۆکارە یاریدەدەرانە بەکاربێنێ کە پشتیوانی گفتوگۆکان دەکەن. لەوانەیە تێڕوانینە کۆنەکان، هێزێکی مەزنیان هەبێ و پشتیوانێکی باش بن بۆ هزرەکان، ئەگەرچی ئەمە هەرگیز نەبۆتە هۆی دەرهاویشتنی هزرێك.

میکافیلی باس لە کۆمەڵێ دەسەڵاتدار دەکات کە ئەوەیان هەڵبژاردووە. نۆکەرەکانیان، بەزووترین کات بکوژن و کاتێ دەسەڵاتیان پەیدا کرد، هەڵبەتە ئەمە ئاستەمە بۆ ئەو کەسانە وا کار بکەن لەلای دەسەڵاتدارێك زیرەکترو بلیمەترن کە راهاتووە بە کوشتنی نۆکەرەکانی. ئەمە رووداوەکانی سەدەی چواردەم و پانزدەمی ئیتاڵیان. ئەوە بێ دوودڵی وا لە نۆکەر دەکات زۆر بە وردی دراسەی ئەو میرە بکات کە یارمەتی داوە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. نۆکەر، پێویستە لە هەموو باروئۆخەکان بکۆڵێتەوە، پێش ئەوەی سەرکردەکەی ببێ بە میر یان سەرکردە، میر هەندێ جار دەقیزێنێ بەسەر دەست و پەیوەندەکانی و باسی چۆنیەتی پایە بڵندی خۆی دەکات، بەمەش بۆ نۆکەر بەدیار دەکەوێ، کە هەرگیز یارمەتی میری نەداوە، بۆ بوون بە میر، بەڵام پێویستە نۆکەر، لە بری ئەوەی بۆ میرە نوێیەکەی روون بکاتەوە، کە ئەو هەمیشە هەر میر بووە لە ناخی خۆیدا تەنیا پێویستی بە کات بووە ناوی میرایەتی پێ ببەخشێ.

میر دەزانێ چۆن، هەڵسوکەوت لەگەڵ باروئۆخەکان و دەسەڵاتداران دەکات. نۆکەر، پێویستە بە تەواوی و بە روونی بە شێوەیەکی زیرەك و ئارام و بەخووڕەوشتی بەرزو بەرێزەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵ نوێنەرانی میر بکات، چونکە بۆ کێشە ئاڵۆزەکان و ترسناکەکان، هیچ ئامرازێك لە رێزگرتن باشتر نی‌یە. بەڵام بە هەموو شێوەیەکە ئاخەوتن لەگەڵ خەڵك دەکرێ، پێویست ناکات، نۆکەر هەمیشە خووڕەوشت بەرزبێ.

پێویستە و هەمیشە هەواداری نوێ بۆ هزرەکان پەیدا بکرێ، هەندێك جاریش نۆکەر ناچار دەبێ، پەنا بۆ سحرەکان ببات بۆ ئەوەی بتوانرێ هزرەکەی لەلای ئەوانەی کە حەزی لێ ناکەن پێشوازی لێ بکرێ.

بەهۆی ئەفسانە، هزرەکانی میر تارمایەکیان بەسەردا دێت، بەڵام نابێ هەرگیز هەوڵی ئەوە بدات، بیان گۆڕی. هزرەکە، هەمیشە بۆ هەوادارە راستەقینەکان روون و ئاشکرایە. بەڵام پشتیوانی هەلپەرستەکانیش پێویستە. ئەگەر ئەوانە نەزانن، بە تەواوی چۆن پشتیوانی دەکەن، پێویستە نۆکەر بەشێوەیەکی ئاسایی ئەوان تێبگەیەنێ.

میکافیلی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا رایگەیاند، پێویستە هەموو نەیارەکان تێك بشکێندرێن، دوای ئەوەی میر دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام ئەم رێبازە ناتوانرێ لە ناو خەڵکی مەدەنی‌دا پیادە بکرێ. لەوانەیە لەبار بێت بۆ ژمارەیەکی کەمیان کە خۆویستن. ئەمانە دەتوانرێ بە فێڵ لەناو ببرێن نەك بە توندوتیژی. بەڵام پێویست ناکات، هەرگیز لە بواری هزرەکاندا تاقی بکرێتەوە. هزر وەك ئەمام گەشە دەکا هەتا زیاتر بیبڕییەوە زیاتر پەل و پۆ داوێ و هێزو توانا پەیدا دەکات.

نۆکەر نابێ لەناو نەیارەکان گیر بخوا و هاوپەیمانان لە دەوری هزرێکی تری جیا لە هزری میر کۆبکاتەوە، چونکە میر لە هزرەکانی تر دڵ پیسە، بەهەمان شێوە لە نۆکەریش دڵ پیس دەبێ. هزرەکانی تر دوو جۆرن یان چالاکن یان ناچالاك. ئاین هزرێکی ناچالاکە دەتوانێ لەگەڵ هزرەکانی تر بژی، ئاین، بەدەرنی‌یە لە هزرەکان. زۆر گرنگە، نۆکەر بە پارێزەوە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکات "بۆ من لێرە واژەی ئاین، بریتی‌یە لە رێکخراوەیەکی

هێزی کۆمەڵایەتی- مەسیحی کە تەنیا ئەندامی پیاوی هەیە: نوسەر" نۆکەر پێویست ناکا خۆی تێکەڵاوی ئەو باروتۆخە بکات، کە لەوێوە هەستە دڵسۆزەکانی بەرامبەر میر بخرێتە بەر تاقیکردنەوە، یان خەڵك ئەو باوەڕەیان لا پەیدا ببێ کە سوودیان لە میر وەرگرتووە، بەهۆی ئەوەی کە نۆکەرەکە لەگەڵ هەموو ئەم رێکخراوانە بە خووڕەوشتێکی بەرزەوە رەفتار بکات، بەڵام لەوە زیاتر قاچت رامەکێشە. هێزەکانی تر: کۆمۆنیست، سوشیالیزم، پارێزگارخواز، فاشیزم و.. هتد، هێزی چالاکن، چاو لەوانە بپۆشە یان هەوڵ مەدە، باوەڕ بەمانە بکەیت. میر دژی ئەوانەیەو ئەو هێزی خۆی هەیە. نۆکەر پێویستە، هاندەربێ و دژی ئەوانە بوەستێ، وەستان دژی ئەمانە تەنیا بە هێزەکانی میر دەبێ و هێزی میرەکەش بەهێزتر دەبێ ئەگەر بەهێزێکی تەواو بەکاری بێنێ. نۆکەر پێویستە بەگژ هێزەکانی تردا بچێتەوە. هەمیشە دۆستانەو خووڕەوشت بەرز بێ، بەرامبەر نوێنەرەکانی ئەم هێزانە. ئەوان هەرگیز چاوەڕوانی ئەمە ناکەن و بەهەمان شێوە وەڵامی نادەنەوە. ئەوەش هەناسەیەك بە نۆکەرەکە دەدا هەوادارە چاودێرەکانی خۆی دوورە پەرێز رابگرێ، نۆکەر دەبێ بە تەواوی دابەشبکرێ کە بە توندی دژی هێزی دوژمنەکان بوەستێ. نۆکەر ئەبێ هەمیشە زانیاری پەیدا بکا، پێش ئەوەی دەست بە گفتوگۆ بکا بە هیچ شێوەیەك نابێ کوێرانە بەگژیاندا بچێتەوە.

لەوانەیە لەبەر ئەوەی میکافیلی مێژوونووس بووە، ئامۆژگاری میر بکات. کە شوێن هەڵگری مێژوو بێ، بەڵام مێژوو تەنیا لە ئەنجامی کەم و کووڕی مرۆڤەکانەوە دووبارە نابێتەوە. میر شارەزایەو پێویستە هانی نۆکەر بدات. کێشەی نوێ بخوڵقێنێ، بەڵام دوژمنانی میریش، کتێب دەخوێننەوە، کاتێ نۆکەر پیلانەکانی میر ئەنجام دەدا، پێویستە رەنگدانەوەی رەسەنایەتی بێ. ئەوە هێزی میرە، سەردەکەوێت، یان شکست دێنێ. ئەگەر هێزەکەش تەواو بەهێزو بەتین بوو، ئەوە بەو خێراییە بڵاو دەبێتەوە کە تەم و مژی بەیانیانی پێ بڵاو دەبێتەوەو بەبێ هێز میر نییە. ئەوکاتەی کە هەست بە هەڵەکانی هێز کرا، پێویستە نۆکەرو سحرەکان لەسەر پێ بن و وازی خۆیان بکەن.

هەندێ کات لەوانەیە میر هەست بەوە بکا، کە ئارەزووەکانی، ئارەزووی خەڵکی ئاسایی بن، بەڵام میر خەڵکێکی ئاسایی نییە. بۆیە لە هیچ باروذۆخێکدا، نابێ باوەڕ بەخۆی بکا کە ئەو جۆرە کەسەیە. ئەوە ئەرکی نۆکەرە، کە هەل و مەرجەکان بۆ میر روون بکاتەوەو بیری بخاتەوە خۆڕاگر بێ، بەڵێ لەوانەیە وا رووبدات میر حەزبکا کە خەڵکێکی ئاسایی بێ. ئەوەش لە ئەنجامی ئەوە روودەدات کە میر خۆی بەکارو پیشەی خەڵکی ئاساییەوە خەریك بکات. بەڵام ئەوە بە هیچ شێوەیەك بۆ میرێکی راستەقینە، شتێکی راست نییە. لەوانەیە شیاو بێ بۆ ئەو کەسەی دەخوازێ میر بێ، یان بە میری لە دایك بووبێ و کە تەنیا چاوەڕوانی ئەوە بکات ببێ بە میر، دڵنیاشە لەوەی دەبێتە میر، لە میراتەوە بۆی جێماوە. نۆکەر پێویستە لە هەموو حاڵەتێکدا دان بە خۆیدا بگرێ و پەلە نەکاو هەوڵبدا ئەوەی دەیزانێ بیپارێزێ و لە میری ئاشکرا نەکات، دەبێ جورئەتی ئەوەش بکا. کەسێکی تر لەسەر لایەنی شاراوەی خۆی زانیاری لەمیرە وەرنەگرێ.

ئەو کەسانەی ئاکارو نیشانەکانی، خۆیان بەمیر دەڵێن، بەهیچ شێوەیەك لە چاودێری کردنی کارەکانی دەوڵەت رێگا ناگرن. ئەو نۆکەرەی ئەو شتانە رێك دەخا هەمیشە بە ترسەوە دەژی. ئەگەر نۆکەر نەتوانێ خۆی دوور بگرێ لەو جۆرە کردارانە، ئەوا پێویستە زۆر باش ئاگاداری سحرەکانی بێ. چونکە بێ گومان، ئەو پێویستی پێیانەو نابێ هیچ

شتێك هزرەكانی لێ دوور بخاتەوە، بەخەیاڵ پڵاوو فرۆفێڵ نۆكەر، جارجار دەتوانن، سوودیانی لێ وەرگرن، بەگلەیی ساختە نۆكەر هانی دوژمنەكانی بدا، كە گلەیی لە وتووێژەكانی "گاڵتەبازی" بكەن.

هەڵبەتە نۆكەر هیچ ئارەزوویێكی نییە ئەنجامی بدات. لە دوایشدا نۆكەر وازی لێ دێنێ و خەڵكانی تر باوەڕی پێ دەكەن، كە دوژمنەكە تاوانبارە. تا لەو كاتەدا دوژمنەكانی نۆكەر جەژنی سەركەوتن دەگێڕن. كە خۆیان گلەییەكانیان كردووەو هەموو شتێكی تریش لەیاد دەكەن، كە گلەیی پێ لە نۆكەر بكەن، بارودۆخێكی فیزیكی واش دروست دەكەن، كە تاوانباركردنی نۆكەر هیچ ئیمكانێكی نییەو دوژمنەكانی بە رووڕەشی دەمێننەوە. زۆر كارێكی سەخت و ئاستەمیش دەبێ و ئالوێ جارێكی تر ئەگەر كارێكی خەراپیش ئەنجام بدات تاونباری بكەن.

ئەم جۆرە فێڵانە كە گلەییەكان، هیچ بەندو بناوانێكیان نییە، باشترین شتن، كە مرۆڤێكی زیاتریش تاوانبار كردبێ دەربازی بكەن.

لە دەورووپشتی میر، وەزیر هەن، كە هەم بە توانان، هەم راوێژكاریشن، هەموو ئەمانە دوژمنی میرن، چونكە ئەوان دەزانن كە نۆكەر مێشكی میرە. ئەوانیش دەیانەوێ پەیوەندی باشی خۆیان بپارێزن، تەنیا بۆ ئەوەش ئەو قسانە دەكەن، كە میر بیبیستێتەوە. هەموو ئەو مرۆڤانەش ناتواندرێ تێك بشكێندرێن. بەڵام پێویستە یەك لەمانە بۆ ناوچەكەیەكی نائارم یان شوێنێك، كە دوارۆژێكی روونی نیە بنێردرێ بۆ ئەوەی ببێتە نموونە بۆ ئەوانەی تر كە بیر بكەنەوە، ئەوانە دوژمنن و هەوڵدەدەن كە قەناعەت بە میر بكەن، واز لە هزرەكانی بێنێ، بۆ ئەوەی بتوانن دەسەڵاتی لێ بسێننەوەو شوێنی بگرنەوە، میر نابێ واز لە هزرەكانی بێنێ، چونكە كە رووخا خۆیی و نۆكەرەكەشی دەڕوخێ. كاری نۆكەر ئەوەیە بتوانێ بە رەسمی و نارەسمی لە پشتیوانی ستراتیژی و تاكتیكی كەڵك وەربگرێ. هەوڵدانەكانی ئەوانەی دەیانەوێ هزرەكان بگۆڕن، رابگرێ. چونكە مانەوەی نۆكەر بە مانەوەی میرو هزرەكەیەوە ماوەتەوە.

گیروگرفتی میر ئەوەیە چۆن هزرەكان بڵێ و دەستی بەسەر وەزیرەكاندا رابگات، لە هەمان كاتیشدا خەڵك رازی بكات، ئەگەر هزرێك نەبێتە پەڵەیەكی نەگەتیڤ بۆ هزرە دژەكانی بەهێز دەبێ، وەزیرەكانیش واز لە هزرێكی دروست ناهێنن بۆ هزرێك كە كاری پێ نەكرێ. ئەوان هیواخوازن ببنە میر، بەڵام ئەوان سەربازێكن و هیچی تر نا، دەستیش بە هەڵاتن دەكەن. كاتێ زانیان هزرەكە بە بایەخەو ناكرێ جیاوازی لە هزرەكانی تری پێ بكرێ. تا لەوكاتەدا، دەست و پێوەندەكان بیر لەوە دەكەنەوە كە ئایا هزرەكان لە مەیدانی كاركردندا لە سوودی ئەواندایە، هەروەها لە دژە ئارەزووەكانی دژە هزرەكانیش دەگەن، لەو دەرفەتەدا، میر پێویستە، ئەوانە بكاتە هەوادارو هەموو ئاماژەكان بەبێ دوودڵی بسڕێتەوەو دەست بكات بە راگەیاندنی هزرەكان و گرەوەكە بباتەوە.

نۆكەر پێویستە سحرەكان بچێنێ بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك تایبەتمەندی جیاواز دەبێ بەرامبەر بە كۆمەڵێك كەسی جیاواز ئەو كارە بكات كە بە شێوەیەكی ورد دەست نیشانی كردون و كاتیان بۆ دابنێ و لەكاتی خۆشیاندا چاوی پێیان بكەوێ، لەبەر ئەوەی خەڵك رێو رەسمی یاسایی دەخوازن لە ئەنجامەكەی سەرسام دەبن و هەوڵدەدەن زیاترو تایبەتمەندانەتر، ئالۆزی بۆ دروست بكەن. بەو كەرەستانەی كە نۆكەر بەهەر یەكێكیانی بەخشیوە، بەڵام نۆكەر دەتوانێ ئەو تایبەتمەندیانە بگونجێنێ و گەشە بە سحرەكانی بدات، پێش ئەوەی بڵاویان بكاتەوە. چ نۆكەر بێ چ هەركەسێكی تری دیوان بێ.

دەتوانێ ئەمە بکات بۆیە پێویست بەوە ناکا، بڵێین پێویستە تۆکەر بە توانا بێ، با توانای ئەویش هەرچەند بێ، بە بێ ئەفسانە هەموو شتێك لە دەست دەدات. ئەمە پێویست بەوە ناکات ئەو ج پەیوەندییەکی راستەقینەی هەیە. سروشتی تۆکەر، ئەگەر پیاوچاك یان پیاوخراپ بێ، هیچ سوودی نییە. کاتێ پێشبینیەکانی بەدیار دەکەون، کە سحرەکان بەراست ئەنجام بدات. سحرەکانی تۆکەر هەرگیز نابێ، لەگەل مزرەکانی میر بگۆڕدرێنەوە، چونکە تەنیا موڵکی خۆیەتی.

تۆکەر زۆر زیرەکانە نیگەرانی و دوودڵی بڵاودەکاتەوەو خەڵك ئازاد دەکات کە باوەڕ بە بۆچوونەکانی خۆیان بکەن، سەبارەت بە ژیان و رابردووی خۆی "تۆکەر" بە بەکارهێنانی خەڵکی تر، وەك بەدگۆیی کردن، وازیان لێ دێنێ هەیکەلێکی شازادە کە زانیاری دوور لە راستی دروست بکەن. تۆکەر کاتێ یەکێك بە خەراپە باسی دەکات کە یەکێکی تر بدۆزرێتەوە، تەنیا بە چاکە باسی بکات. لەناو ئەم دژانە، تۆکەر، ئەو کەلوپەلانە پەیدا دەکات، کە پێویستن بۆ کۆشکی سحرەکانی کە بە چاوی خۆی دەیانبینێ، زۆر کەس هەن دووبارەی دەکەنەوە کە وەستاون لە بەدگۆیی. بۆ یەکێك بە یەکێکی تر دەڵێ "من دەیناسم، بە روونی ئەوەیە کە من بۆ تۆی باس دەکەم، چونکە باوەڕم بەتۆیە" ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ "تۆ بە تەواوی بەهەڵەدا چووی باس لە تۆکەرەکە دەکەیت من ئەمەوێ لەناوەڕۆکی راستیەکانی تێ بگەم" ئەویش دووبارەی دەکاتەوە کە بیستوویەتی، مرۆڤ هەمیشە باوەڕ بەوە دەکات کە خەڵکانی تر بە زنجیرە لە یەکتریان بیستووەو باوەڕیان پێ کردوە. بەمە لە ماوەیەکی کورتدا ئەرکەکانی تۆکەر دەنووسرێنەوەو دەبنە راستێکی روشن و روون. کە هەمووشیان دەزانن، ئەمانە زۆر لە راستییەوە دوورن.

زۆربەی بەکرێگیراوەکانی تۆکەر، بەبێ دەنگ بۆی دەجەنگن، چونکە ئەو دەیەوێت هەرچۆنێ بێ کاریگەری لەسەر ئەو شتانە دابنێ کە روو دەدەن بۆ نموونە لەمیانی گۆڕانی رێکسختنی ئەو رووداوانەی کە روویان داوە بەرهەڵستکارەکان هەست بەوە دەکەن ئەوەی ئەوان دژی خەبات دەکەن، گۆڕاوە، بەڵام زۆر سەختە بزانن، ئەمە چۆن روویداوە. سحری تۆکەر لە شەڕێکی رووبەڕوودا خوازیاری هێرشێکی دیارەو بانگێشەیەکی کورت و ناڕەوایانەیە، بەڵام ئەوەی خەڵك لەشەڕ چاوەڕوانی دەکات پێویستە هەمیشە سحری تۆکەر فاڵی بۆ گێڕابێتەوە. لەکاتی ئاشتیدا سحرەکە پەیوەندی بە بەزەیی و هاوڕێیانی تۆکەرەوە هەیە، ئەمەش سروشتی ئاشتییەو لە هەمان کاتیشدا توانای فاڵ گرتنەوەی بۆ هەیە. ئەوەش گرنگە کە رووناکی "فاڵەکە" بەرەو رووی سەرچاوە سەرەکییەکەوە بێ، بەڵام پێویست بەوە ناکات، بەشێوەیەکی وا لێکبدرێتەوە کە تۆکەرەکەش توانای نەبێ لە مەیدانی کار جێبەجێی بکات. ئەوە سحرەکانی تۆکەرن کە بوونەتە "فاڵ". تۆکەریش پێویستی بە هاوکارێك هەیە، لەلای بێت بۆ کاتێکی باش، بەڵام نەك بۆ ماوەیەکی درێژ، بۆ ئەوەی بزانێ تۆکەر چۆن کار دەکات. هەڵبەتە هاوکارێکی باش پێویستی بە پێنج ساڵ هەیە کە بکاتە ئەو ئاستەی ببێتە مرۆڤێکی چالاك، هاوکارەکە لەماوەی ئەم پێنج ساڵەدا وزەو توانایەکی تێرو تەسەل وەردەگرێ. پێویستە هەموو ئەوانەی هەوڵدەدەن، بگەنە پلەیەکی بەرز، ئەوەیان لە یاد بێ لە ساڵەکانی کۆتایی، زیاتر دەناسرێن و ناوبانگ پەیدا دەکەن. چونکە خەڵك ئەو کەسانەی خۆش دەوێ و رێزیان لێ دەگرن کە دوای چەندین ساڵ ئەرك کێشان کاتێکی زۆریان لە دەسەڵاتدا نەماوە. تۆکەر ئەو شتە باش دەزانێ و هەروەها باشیش دەزانێ، کە ئەو دەم و چاوانە لە

پێش چاوی خەڵك ون دەبن، کە خۆیان خەملاندوویانە.

پێویستە ئۆکەر ئەوەندە لە توانایدا هەبێ شانازی بەو کەسانەوە بکا کە بە هۆیانەوە، پلەوپایەی دەست کەوتووە، تەواوی کەسایەتی ئەوان باس بکا و هەموو سەرکەوتنەکانی خۆشی، بۆ ئەوان بگێڕێتەوە. ئەوان گەلێك جار بێواتان بۆیە ئۆکەر پاڵەوانیەتی خۆی لەسەر ئەوە بنیات دەنێ کە ئابڕوویان بەرز رادەگرێ. ئۆکەر پێوستە بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵك زۆر زیرەك بێت هەروەها چۆن ئەوان خۆیان بەدیار دەخەن. ئەمە هونەرێکی سەختە لە کاتێکدا ئێمە هەموومان ئارەزووی ئەوەمان هەیە خەڵکانی تر لەو ئاوێنەیەدا ببینین کە خۆمانی تێدا دەبینین. ئۆکەر پێویست ناکا توانای ئەوانەی تر هەلسەنگێنێ بە هەمان شێوە کە دەیەوێ، گۆڕانەکانی ئەوان بدۆزێتەوە. ئۆکەر دەبێ گۆڕانکاری فیزیکی کەسەکان لاواز بکات. شێوەی نوێی جل پۆشین. بدۆزێتەوە، چونکە ئەم گۆڕانکاریانە لەلای ئۆکەر پێویستە وەلام بدرێتەوە ئەمانە، لەوانەیە بۆ ئۆکەر ئاگاداریەك بن، بەلام گۆڕانکاری تر بە گوێرەی پێویستین. ئەوانە: دامێنان، رەشەبای وێران کردن ئارەزووی کارکردن، هەروەها تەمبەڵی کردن لەخۆ دەگرن. ئەمانە بە زۆر هۆ دەست پێ دەکەن، بەلام ئۆکەر تەنیا پێویستی بەوە هەیە کە بزانێ لە راستیدا خەڵکەکە گۆڕاوە. ئەی چۆن دەبێ وشیاربێ! چونکە گەلێك جار مرۆڤێك باروددۆخێك دەخولقێنێ و خێرایی بە گۆڕانکارییەکان دەدا یان رووداوێك بەرهەم دێنێ، کەلە دواییدا رەفتارە نوێیەکانی بەتەواوی بەدیار دەکەون.

دەربارەی راستی و راستییە روونەکان بۆ مرۆڤ تەنیا راستیەك نییە بەلام راستی روون، راستیەکی چالاکانەیە ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ چی دەبینێ و بەچی باوەڕ دەکات. ئەوەی دەزانن و باوەڕ بە خۆیان دەکەن، ئیمکانی جێبەجێکردنیان نییە، بەلام ئەمانە زۆر لە راستیەوە دوورن. زۆربەیان باوەڕ دەکەن، کە حەز دەکەن باوەڕ بکەن، ئۆکەر هاموشۆی ئەوانە دەکات کە لەو باوەڕەدان کە وان، نەك ئەوانەی خۆیان چۆنن، ئۆکەر لە کونجێکەوە زۆر بە وردی و هوشیارانە، سحرێك بۆ خۆی دەخولقێنێ، کە زۆر بە وریایی هەڵچندراوە لەوانەشە ئۆکەر جیاوازی لە نێوان راستی و سحرەکەدا بکات. هەروەکو من وتومە. هەندێ جار رووداوی وا لە چالاکییەکانی بیردا پەیدا دەبن ئەمەندە بە گێچەڵن دەبێ ئۆکەر بەشێوەیەکی وا خۆی لێ نزیك بخاتەوە کە گوێ بە سحرەکانی خۆی نەدا، بەم شێوەیە خەڵکانی تر سەرسام و نیگەران دەکات، کە هەمیشە بە مل ملانێیەکان دەشڵەژێن. ئەم شێوە گۆڕانە کاریکاتێریە دوژمنەکانیشی سەرسام دەکا، ئەمە شتێکیشە کە هێشتا خۆی باوەڕی پێ نییە. بۆ نموونە خۆ لێ دەرباز کردن، بەهۆی نەخۆشێکی کت و پڕ، ئەبێ ببێتە ئالقەی سحرەکە. ئەمە وازی ئۆکەرەکە ئاشکرا ناکات و خەڵك بەزەیی پێدا دێتەوە. کاتێ مرۆڤ، نەخۆشیەك بەکاردێنێ وەك لێبوردنێك بە گژ ناسازیەکی راستەقینەدا دەچێتەوەو پێشبینی ئەوەش دەکا کە شەڕێك بەرپا بکات و لە کۆتاییدا سەر بکەوێت، خەڵکانی تریش باوەڕی پێ دەکەن و فەرامۆشی دەکەن لە باسکردندا، چونکە خەڵك باس لە شتە سادەکانی ناوەوەی یەکتر ناکەن.

ئۆکەر پێویستە سحری وا بچنێ دەربارەی مێژوو خووە سادەکانی خۆی و بەبێ ئەوەی بچووکترین لاوازیش نیشان بدات، بە ئەسپایی بەکاریان بێنێ. ئۆکەر لە راستیدا کە بچێتە ناو بێلانەکان بێ بەزەیی دەبێو جڵەوی پاکی و دڵسۆزی بەردەدات، لەو رووبەرەی کە سنووری نێوان مرۆڤ و سحرەکان دەکێشرێت بۆچوونەکانی ئۆکەر ناکۆك دەبن. ئەگەرچی دەروازەیەکی واش نەبێ کە دزەی تێدا

بکرێت بە ئاشکرا لە نێوان پیاوەتی و فێڵبازی، چاکەو خراپە، بەخشندەیی و قرچۆکی، بەڵام ئەگەر ئەم سنورە نەکێشرێ، بوونی چەمکی نۆکەر لەناو دەچێ. لەوکاتەدا ئەگەر بە پەلە نۆکەر لە کارەکەیدا دەرنەکرێ، ئەوا میر تیا دەچێت.

لە حاڵەتی ئاساییدا کەسێك شوێنی کەسێکی مردو دەگرێتەوەو زۆربەی خەڵك رێزی بۆ مردوو هەیە، ئەگەرچی مردووەکە لە ژیاندا خۆشەویست نەبێ و ئازاریشی دابێ، بەڵام ئەوە زیانێکە بۆ میرو نۆکەرەکانی، نۆکەریش چاوەڕوانی ئەوە دەکات، کە میر رێزی بۆ میری رابردوو هەبێ و بەرەبەرەش هێزو ناوبانگی خۆی لەوەوە وەردەگرێت. لە راستیدا میر لەسەر ورگی میرە مردووەکە دەژی، کە خۆی گرت، واز لە هزرەکانی میری رابردوو دێنێ، ئەگەر ناوبانگی باش نەبوو نۆکەر میر بە هزرەکانی خۆی دەوڵەمەند دەکات و پیشانیشی دەدات کە هزرەکان سەرکەوتنی گەورەتریان لە رەفتارو چارەسەرکردنی لەچاو میری رابردوو بەدەست هێناوە.

سحری نۆکەر لەوەدایە وەك مرۆڤێکی دەسەڵاتدار تۆقێنەر بێ لە هەمان کاتدا پێویستە بۆ خاسیەتە کەسایەتییەکانی خۆشەویستی هەبێ، مەبەستم لە خۆشەویستی، خۆشەویستی مەزنە، نەك ئەو هەستە ترسناکەی مرۆڤ، بۆ بەرامبەرەکەی دەریدەخات. بۆ ئەوەی بە حەزو ئارەزووەکانیخۆیانی ببەستێتەوە. مەبەستم رێزە، نۆکەر هەرگیز نابێت باوەڕ بکا، کەسێك هەبێ خۆشی بوێت، یان ئەوپەڕی رێزی بگرێت، تەنانەت میر. تاکە شتێك کە باوەڕی پێ دەکەن سحرەکانیەتی. هەموو مرۆڤێك پێوستی بە دڵسۆزیە، حەزیش دەکات بە ئاشکرا ئەو دڵسۆزیە دەربڕێ ئەم بە هەستێکی جوان دەزانێ.

نۆکەر پێویستە هەموو جۆرە ناوبانگی خۆی رەت بکاتەوە. تاکە ئەرکی ئەوەیە. خزمەتی میرو هزرەکانی بکات. تاکە ناوبانگێك. کە بەدوایدا وێڵە پێویستە لە خزمەت سحرەکانیدا بێت. نەك خۆشەویستی خەڵك رابکێشێ. هەمیشە ئەو پێویستە ئەوەی یاد بێ کە تاکە رۆڵی ئەوەیە نۆکەرایەتی بکات و هێزو رێزی خۆشی لەوەدا دەبینێتەوە نەك لە شتی تر. نۆکەر دەبێ، لە کارەکانیدا بە باوەڕێکی مەزنەوە خۆی نیشان بدات و دەبێ خۆی لە لووت بەرزی بەدوور بگرێ، چونکە بەمانە خەڵکانی تری لێ دوودڵ دەبن. نابێ خۆی باوەڕی بەخۆی هەبێ. ئەبێ زۆر بە وردی پیلانەکانی بچنێ و نابێ باوەڕ بە بەڵێنی خەڵکانی تر بکات. نابێ بە هیچ شێوەیەك پێشبینی سەرکەوتنی پیلانەکانی لێ بکات. پێویستە چارەسەرێك هەبێ وەڵامی پێبداتەوە سحرەکانی نۆکەر جیاوازی لە نێوان ئەوانەی لە نزیکەوەن و هەڕەشە لە هزرەکانی دەکەن و ئەوانەی لە دوورەوەن و خۆشیان دەوێ و ئەوپەڕی رێزی دەگرن، دەکات. ئەوانەی دوایی باوەڕەکانی خۆیان لەسەر کەمترین زەمینە هەڵچنیوە، ئەوانەی یەکەمیش، زیاتر هەڵبژاردەن، ئەوانەی لە نزیکەوەن، لەوانەیە زۆر بە باشی بناسن و دوودڵیشبن لە سحرەکانی.

نۆکەر پێویستە سوود لە کەسێك وەربگرێت، کە چارەسەری دیسپلینەکانی لەناو کەسانی تر بۆ بکات کاتێکیش ناوبانگی کەم بۆوە، ئەوە دەتوانێ کارەکانی تری لەگەڵدا دابەش بکات. نۆکەر پێویستە ئاگاداری شەرەف بێ چونکە نۆکەر بە پلەیەکی بەرز، یەکێکە لەو جۆرە کەسانە، لە هەموو وازیەکانی تردا، خۆی لەداواکاریەکانی دوارۆژ تێر دەکات. هەر ئەمەشە بەرەو پێشەوەی رادەکێشێ. هاوڕێکانی دەبێ شانازی پێوە بکەن و ئەگەر شکستیشی هێنا. وای باس بکەن، بەهێزەوە لە پێشکەوتندایە. نۆکەر دەبێ وا بڕوانێتە خۆی، کە هیچ هیوای تری نییە کاتێ گەیشتە ئەو رادەیەی کە خۆی دەیەوێت ئەوەش لەمیانی ئەو هەموو تەقەلایەیە کە بۆ میری

داوە پێی گەیشتووە دەتوانێ پێی بگات. لە ئایندەدا، ناتوانێ زیاتر بەرەو پێشەوە بچێت و وازیش لە هەموو میواکانی نێنێ. لەوکاتەشدا میر هەست بە ئاسایشی خۆی دەکات چونکە نۆکەر رەقیبی نییە. ئەمەش کاتێ بە تەواوی بەدیار دەکەوێت کە هزرەکان دەپشکوون و سوودیان بۆ هەردوولا تێدایە. میواکانی سەختن و خەڵك وەك میر هەڵس و کەوت لەگەڵ میر دەکات وەك نۆکەریش لەگەڵ نۆکەر لەوکاتەشدا نۆکەر ناوی خۆی دەبیستێتەوە زیرەکی خۆی بەکاردێنێ و پیشانی خەڵکیش دەدات کە لە راستیدا لەگەڵ میر یەکسانە.

ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی نۆکەرە، پێویستە بەوەش رازی بێت و ئاگاداری ئەوەش بێت کە خۆی یەکێکە لە سێ کوچکەکە، رێگاش نەدا ئەوان تووشی گێچەڵی بکەن. نۆکەر هەرگیز نابێت بۆ ئەوەی هونەری خۆی پیشان بدات، بکەوێتە داوی شانازی بەخۆوە کردن، پێویستیشی بەهەموو تایبەتمەندێکی میوا هەیە. هێز بزوێنەرو جەسووری- ناشبێ ئەوەش نیشان بدات، کە گەیشتۆتە ئامانجی خۆی. نۆکەر خۆی ئەوە باش دەزانێ، پێویست ناکات خەڵکانی تر بزانن.

ئەرکی نۆکەر ئەوەیە هەمیشە بە ئاگاوە لە خزمەتی میردا بێت. نۆکەر کاتی بۆ رابواردنیش هەیە، بەڵام بەو چالاکیانەش رازییە کە لە رێگایانەوە بەو کەسانە دەگات کە لەوانەیە، لە کارەکانیدا یارمەتی بدەن، بۆیە پێویستە هەمیشە خۆی بە میرەوە خەریك بکات.

تەنیا لە توانای ئەویشدایە، کە هەمیشە هزرەکانی میری لە خەیاڵدابن و بشتوانێ ئەرکەکان بەتەواوی جێبەجێ بکات. نۆکەر پێویستە کەناڵی تایبەتی خۆی بۆ زانیاری کۆکردنەوە کە یارمەتی دەدەن هەبێت، پێویستیشە بەتەواوی بزانێ چۆن کەناڵەکانی دەوڵەت بەکاردێنێ، لە راستیدا ئەو کەناڵانە دڵسۆزترن، بەرامبەر بە میر، بۆیە پێویستە بە ئاگادارییەکی زۆرەوە سوودیان لێ وەربگرێت و هەرگیز باوەڕیشیان پێ نەکات. نۆکەر پێویستە بەمەبەستی پەیداکردنی شارەزاییەکی باش دەربارەی بوارە جیاجیاکان، زانیاری لەکەسانی خاوەن ئەزموون وەربگرێت. نۆکەر پێویستە هەڵسەنگاندێکی پوختی دەربارەی ئەوەی کە روودەدات هەبێ، نۆکەر گوێ لە زۆربەیان دەگرێ و لە بێژینگیان دەدات، پێش ئەوەی بڕیاری خۆی بدات. هەرگیز نابێ پارەش بەوانە بدات کە زانیاری دەدەنێ بەڵام ئەگەر تووشی بە تووشی کەسێك بوو، کە زانیاری دەفرۆشێ، پێویستە گوێی لێ بگرێ و بە گوێرەی کارەکانی پارەی پێ بدات. بەڵام نابێ هەرگیز خۆی بەدوای ئەم جۆرە کەسانەدا بگەڕێت. مرۆڤ نابێ هەرگیز پشت بەو زانیاریانە ببەستێ کە بە پارە دەفرۆشرێن. یان ئەوانەی بەدوای شەرەف یان تۆڵەوەن. کارەکانی مرۆڤی بەشەرەف پێویستە رێزیان لێ بگرێت. بەڵام نابێ بە راستیان وەرگرێت. چونکە مرۆڤی بە شەرەف زۆربەی جار زیادەڕۆیی دەکات بۆ ئەوەی راستییەکانی باوەڕ پێکراوبن. درۆ هەندێ راستی تیایە باشترین درۆش، گەلێك جار بناغەی لەسەر راست دادەمەزرێ.

پرسیارەکەی نۆکەر، ئەوە نییە، کێ خاوەنی پەیامەکەیە؟ بەڵکو ئەوە کێیە ئەو پەیامەی ناردوە؟ بۆ چیشی ناردووە. کەسانی "ئەحمەق" ترسناکترن، هەوڵی ئەوە دەدەن پەیامێکی وا برازێننەوە لەوانی تر سەرنج راکێشتربێ. ئەم هەڵانە شلەژانیان بەدواوەیە، لە بری ئەوە پێویستە نۆکەر گوێ لە قسەی بۆش بگرێ و وشەیەك لێرەو یەك لەوێ، کۆبکاتەوەو هەمیشەش کۆنترۆڵیان بکات. بەدوای نمونەی تردا بگەڕێ، پێویستە چاویشی لەوە بێت کە میر هەمیشە بەڵێنەکانی خۆی دەباتە سەر، ئەمەش زۆر ئاستەمە و هەمووکاتێکیش ئیمکانی نییە، بەڵام

لەبەر ئەوەی میرو هزر یەکن، وازی کردنەکەش لەسەر دوو پەت دەبێ و تەنیا دزەکان بریندار دەبن. لە راستیدا دوو ئیمکان هەیە، یەکەمیان کە نۆکەر هەوڵبدات نەهێڵێت میر ئەو پەیمانە بدات کە ئاستەنگ بێ لە جێبەجێ کردن، دووەمیان ئەوەیە نۆکەر کەسێکی تر بدۆزێتەوەو تاوانەکانی بخاتە ئەستۆی ئەگەر پەیامەکە جێبەجێ نەکرا. ئەوەش گرنگ نییە، نۆکەر خۆی بەرپرسە یان نا، هەرچۆنێ بێ دەبێ سحرەکان لەسەر بناغەی ڕێز بنیات بنرێ. نۆکەریش پێویستە بەخێرایی بگۆڕێت خێراتر لەوەی رووداوەکە رووبدات. لەوکاتەشدا نۆکەر دەکەوێتە ناو ستراتیژی فێڵ بازی و پێویستە بە ئەسپایی کە کێ ئەمە بکات دەست نیشانی بکات، لە راستیدا خەڵکی بەرێز نۆکەر وەك مرۆڤێکی بەرێز دەبینن، بەلام خەڵکی بەگومان، فێڵەکان دەدۆزنەوەو لە سروشتی مرۆڤیشدایە، خۆی ببینێو لە ڕێگایەوە خەڵکانی تریش ببینێ، و بیان خەملێنێ. نۆکەر پێویستە خۆی بە هەڵخەڵەتاندن خەریك بکات، گەورەترین ئاگاییش، ئەوەیە نۆکەر جیاوازی لە نێوان خۆهەڵخەڵەتاندنی گەورەو بچووکدا بکات. واز لە هەڵخەڵەتاندنی بچووك بێنێ، هەڵخەڵەتاندن وەك قەوزەی سەر بەرد وایە بەرەبەرە دەڕوێتەوە. بۆ خەڵك باشترە کە هەڵخەڵەتاندنەکە، مەزن بێ، بەلام ئەمە گەلێك جار کارەکانی زەحمەت تر دەکات، لەوانەشە هەندێ جار ئیمکانی نەبێ، واز لە هەڵخەڵەتاندن بێنێ، ئەگەر ئیمکان هەبێ، وازیش لە خەڵك بێنێ ئاساییە لە راستیدا خەڵك باوەڕ بەوە دەکەن، کە دەیانەوێ باوەڕی پێ بکەن، تەنیا ڕێگایەکی گونجاویان پیشان بدەن کە ئەگەری بەرزکردنەوەی توانای ئابڕووی هەیە. خەڵکەکەش زۆربەیان خۆیان لەناو هەڵخەڵەتاندنەکان دەدۆزنەوە، کە کەسە بە شەرەفەکان زەحمەت تر، بەلام زۆربەیان دەیانەوێ پرسیارەکە واز لێبێنن و بیشارنەوە. تەنیا بۆ ئەوەی پشتی تێ بکەن، پێویستیان بە بێ وەفایی نییە، مرۆڤی بەدەر لەو حاڵەتانە بەدیار دەکەون کە لەناو ئەو خەڵکەدا باوەڕێکی جێگیری هەیە، ئەوە لەوانەیە میر بێ.

نۆکەر و دەست و پێوەندەکانی میر، بە هزری میر بەرێوە دەچن، بەلام ئەوانەی تر بە پاداشت. پێویستە نۆکەر زیاتر ئاگاداری ئەوانە بێت کە چاویان لە پاداشتە، ئەمانە لەمیر دوورتر دەوەستن و ئامادەشن هزرەکەی لاواز بکەن. ئەرکی نۆکەریشە کە ئەو دوو ڕوانە ئاشکرا بکات، چونکە ئەوانە چانسی تالان کردنیان هەیەو بەردەوامیشن بە چوستی کار بۆ میر بکەن.

وەکو زۆربەی خەڵك میریش حەز بە ئامۆژگاری ناکات، تا ئەوکاتەی کە ئامۆژگارییەکان، لەگەڵ بۆچوونەکانی کۆك نەبن، ئەگەر نۆکەریش پێشبینی حەزەکانی میر بکات و ئامۆژگاری بکات، کە یەك بێت لەگەڵ ئەوان، ئەوە نۆکەر تەنیا ستایش وەك خەڵکی تر وەردەگرێت. ئەوەش جوانییەکە دەربارەی میر. حەز دەکەیت، ڕێزی میر بگری ئامۆژگاری مەکە، لەجیاتی ئەوە چاوی لێ بپۆشەو هەوڵبدە میر لە کێشە بێواتاکان رزگار بکە، یارمەتی بدە واز لە "جدی" تریان بێنێ، هەرگیز ئامۆژگاری میر مەکە. میر زۆر بڕیاری تەواوی هەیە. ئەگەر پێشتر بڕیاربدات، هەرگیز بە میر مەڵێ رۆڵی خۆی وازی بکات، ئەو خۆی هەستی پێ دەکات. ئەو میرەی پێویستی بە ئامۆژگاری زۆر هەیە، پێویست ناکات مرۆڤ نۆکەرایەتی بکات، دوارۆژی نۆکەر لە قسەکانی میردایە. نۆکەر پێویستە بە وریایی و بە ئەسپایی میری خۆی هەڵبژێرێ. ئەوەتا کە هەڵبژاردنەکە پێویستە نۆکەر بیکێ. ئەوەی میر پێویستییەتی، بەڵگە بڕیاردەرەکانییەتی، ئەرکی نۆکەر ئەوەیە ئەمانەی بۆ ئامادە بکات. کاتێك نرخ بۆ خەملاندنی میر دادەنرێ. تەنیا یەك پێوانە هەیە: ئایا میر هەموو بەڵگەکانی هەیە؟ ئایا نۆکەر هەموو ئەو شتانە

دەزانن، کە میر دەیزانن؟ تۆکەر هەرگیز دژی ئەو قسانە نیەو بە بەڵگە هەڵەکانی هەڵدەبژێرێ هەڵبەتە پۆلێنکردنی بەڵگەکان ئەرکێکی تری تۆکەرە.

تۆکەر هەرگیز ئەوە نادرکێنێت، کە بۆچوونەکانی لە هی میر باشترن. ئەگەر میر هەڵەیەك بكات، ڕووداوەکە وا بەدیار بخات، کە هەڵسەنگاندنەکەی تۆکەر ڕاستە، ئەوا پێویستە هیچ نەدرکێنێ. تۆکەری گێل کە ئامۆژگاری داوە لە داهاتوودا تووشی هەڵەی دەکات و شوێن پێی خۆی لەق دەکات. ئەو تۆکەرەی کە ئامۆژگارییەکی ڕاستی پێشکەش کردووە، میر گوێی پێ نەداوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی نێوانی لەگەڵ میر تێك بچێ. ئەگەر هەڵەکە گەورەتر بێت، ئەوە هەموو شتێك لەدەست دەدرێت. ئایا میرەکە ئەوەندە لاوازە کە تۆکەرەکە یارمەتی بدات و بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە؟ ئەگەر میر بە بەردەوامی هەڵە بکات، ئەوە میرێکی ڕاست نییە، کە خزمەتی بکرێت و دیارە هەر لە ئەساسدا میرێکی ڕەسەن نەبووە.

# گفتوگۆ



- لەگەڵ محەمەد ئەرکون دا
- لەگەڵ نەسر حامید ئەبوزەیدا دا

هاشم ساڵح



# گفتوگۆ لەگەڵ "محەمەد ئەرکۆن"دا

■ هاشمساڵح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



**هاشم ساڵح:** سەبارەت بەو هیومانیزمەی لەگەڵ سەردەمی ڕێنیسانسدا لە ئەورووپا دەستی پێکردو، لە سەردەمی ڕۆشنگەریو دوای ئەویشدا چەسپی: واتە تا ڕاگەیاندنی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی لەسەر دەستی شۆڕشی گەورەی فەرەنسی ساڵی 1789، پرسیارێکم هەیە، تۆ یەکەمین کتێبی گەورەی خۆت بۆ لێکۆڵینەوەی (هیومانیزمی عەرەبی لە سەدەی چوارەمی‌کۆچی/ دەیەمی زایینی) تەرخانکرد. وەك نموونەیەکی ئەم قۆناغەش "مەسکویە"ی مێژوونووس و فەیلەسوف وەرگرتبوو. پاشان تاوتوێکردنی ئەو بابەتەت لە کتێبی دووەمدا (چەند وتارێك دەربارەی فیکری ئیسلامی) بەرفراوانتر کردو، لێکدانەوەکانت بەشێوەیەکی تایبەت جەختیان لەسەر "تەوحیدی" دەکردەوە.

***بەڵام وەکی ئاگادارین فەلسەفەی مرۆگەری لەلایەن بیریارانی فەرەنسییەوە بەتایبەت "میشێل فۆکۆو ژاك دێریداو ژان فرانسوا لیوتاردو ژێل دیلۆزو.. هتد" ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توند بووەوە. ڕات چییە بەم گفتوگۆو مشتومڕەی کە بە درێژایی چارەکە سەدەی ڕابردوو، فیکری فەرەنسی داگیرکردبوو؟***

***تۆ بۆخۆت داوای هیومانیزمێکی نوێ دەکەیت، ڕەنگ و ڕوخساری ئەو هیومانیزمە نوێیە چۆنە؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** ئەڵبەتە من هاوڕام لەگەڵ ئەو بیریارانەی ناوت هێنان (فۆکۆو ئەوانی تر)، لەو ڕەخنانەی ئاراستەی ئەو هیومانیزمە ڕووکەشەیان کردووە: واتە هیومانیزمی (گوتارو قسە) کە لە خوێندنگاکانی فەرەنسادا بە خوێندکاران دەوترێت. ئەمە بۆخۆی بریتییە لە قسەی شیرین و هیومانیستیەتێکی ئەبستراکتی تیۆریە کە پەیوەندی بە واقیعەوە نییە. ئەم هیومانیزمە هیچ جۆرە بەراوردکارییەك لە نێوان پێودانگە بەرزو باڵاکانی فەلسەفەی مرۆگەری و ئەو مومارەسە سیاسیانەدا ناکات کە لەسەر زەمینەی واقعدا ڕوودەدەن و، هەریەکەیان لە شوێنێکن. هەر ئەوەندە بەس نیە بڵێین: ئێمە هیومانستین، ئێمە لەگەڵ ئاقاری هیومانستی داین، ئێمە پێمان وایە مرۆڤ گەورەترین سەرمایەیە لە بووندا، پاشان لەسەر زەمینەی واقعدا مومارەسەی شتێکی تر بکەین، مومارەسەی جیاوازی کردن و ئاڤەرۆزەکردن و تەریك کردنی بیانییەکان، یاخود ئەوانەی لە ڕووی پلەوپایە یان زمان و پێست و ئایینەوە لە ئێمە ناچن!.. ئەمە هیومانیزمێکی ڕووکەشەو، (فۆکۆ) و کەسانی تریش مافی خۆیانە کە ئیدانەی بکەن، بەتایبەت پاش هەموو ئەوەی لە ماوەی سەردەمی کۆلۆنیالیەت و ماوەی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا ڕووی دا.

ئەوکات ئەم هیومانیزمە ڕووکەشە لەکوێ بوو، یان چی کرد؟ سەرەڕای ئەوەش ئەمجۆرە لە فەلسەفەی مرۆگەری هەوڵی ئەوە نادات تا تاوتوێی مەرجی پەیوەندی و گفتوگۆ لە نێوان مرۆگەری فەلسەفی تیۆری لەلایەك و، لەگەڵ مومارەسەی سیاسی و ئەخلاقی عەمەلی لەلایەکی ترەوە بکات. مادامەکی ئەم کارەش ناکات ئەوا مرۆگەرییەکی نوقسان و ڕاستەقینە نییە. لێرەدا جارێکیتر دەگەڕێمەوە لای (تەوحیدی). (ئەبو حەیانی تەوحیدی) لای خۆیەوە ئەمەی کرد. چونکە ئەو قەناعەتی بەو قسە شیرینانە نەدەکرد کە ئەمیرو وەزیرو فوقەهاکان دەربارەی ئاکار دەیانکرد.. پاشان لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیاندا تەواو پێچەوانەی ئەوە ڕەفتاریان دەکرد. (تەوحیدی) لەو هەلومەرجە باوەی لە سەردەمی خۆیدا لە ئارادا بوو یاخی بوو. ئەمەش سەر ئێشەی زۆری بۆ دروستکرد.. (تەوحیدی) بە چاوانی خۆی دەیبینی چۆن چۆنی هەردوو وەزیری بەناوبانگ (ابا الفضل بن العميد) و (الصاحب بن عباد) هەموو فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمەیان کۆدەکردەوە، ئەویش لە پێناو کەیف و ڕابواردن و بەڕێکردنی شەو بەخۆشی و قسەو باسی نەستەق لە کۆشکەکانی (بەغداد و شیرازو ڕەی)دا. لەم لاشەوە دەیبینی کە خەڵکی ئەو شوێنانە چۆن بەدەست هەژاری و نەبوونیەوە گیرۆدەن. کاتێك ئەم جیاوازیە بێ ئەندازەیە بینی هەستی بە قەیرانێك کردو وتی: نا ئەمە کارێکی ڕاست نییە. ئەو قسەیەی فەیلەسوف و چینی دەستەبژێری باڵادەستی بەگوێدا نەچوو، سەبارەت بە خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ و بەهاو مەزنی مرۆڤ.. لێرەوە دەستی کرد بە سەرکۆنەکردنی ئەو هیومانیزمە ئەبستراکتەی لەگەڵ واقیعدا نایەتەوە. ئەمە لەسەردەمی (تەوحیدی)دا

ڕووی دڵ، لەوکاتەشەوە ڕوودەدات. لە ساتەوەختی ئێستاشدا ڕوویداو فەیلەسوفە فەرەنسیە ڕاستەقینەکانی لەوێنەی (فۆکۆو دۆلۆزو دێریداو.. هتد) ئیدانەیانکرد.

(تەوحیدی) وتی: هیومانیزم شتێکی زۆرجوانەو، هەرچیەکیش ئێوە دەیڵێن ئەی فەیلەسوف و بیرمەندە مەزنەکان لەجێی خۆیدایەو باوەڕم پێیەتی. بەڵام پراکتیزەکردنی عەمەلی ئەم قسانە، کوا لەکوێیە؟

(تەوحیدی) دەیویست دروشمی: زانست بە کارو کردارو، کردار بە زانست بچەسپێنێ. مەسەلەکەش لە سەردەمی ئێمەدا وەکی خۆیەتی وەك چۆن لەسەردەمی (تەوحیدی)یشدا هەمان شت بوو، بە واتایەکی دی مەسەلەی هیومانیزم مەسەلەیەکە زەمەن تێی نەپەڕاندووە، ئەمێستاو بۆ ئایندەش لە ئارادایەو ئامادەیی هەیە. دەستەواژەیەکی جوانی (تەوحیدی) هەیە دەڵێت: (مرۆڤ لە بەردەم مرۆڤدا دەستەوستانەو ناتوانێت لێی تێبگات). ئەم دەستەواژەیە لە ڕووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە شتێکی تازەیەو، (محەمەد ئەرکۆن) لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا نەی وتووە، بەڵکو (ئەبو حەیانی تەوحیدی) لە سەدەی چواری کۆچی/ یان دەیەمی زایینیدا، واتە بەر لە دە سەدە وتویەتی. من لە بەهێزی ئەم دەستەواژەیەو لە بەهێزی ئەو پرسیارەی لەخۆی دەگرێت تێدەگەم. ئەو پرسیارەی دەکرێت بخرێتە ڕوو بەمجۆرەیە: چۆن دەکرێت مرۆڤ بە شێوەیەکی عەمەلی و مەلموس لەگەڵ خۆیدا ئاشت کەینەوە. مەبەستم ئاشتکردنەوەیەتی کە بە شێوەیەکی سیاسی بەرجەستە بێت و، لە سستمێکی ئەخلاقی کە لەسەر زەمینەی واقیعدا هەبێت ڕەنگبداتەوە. هاوکات لە سستمێکی ئابوریشدا کە شتێك لە دادپەروەری و یەکسانی تێدا بێت بەرجەستە بێت.. ئەمە بریتییە لە هیومانیزم و ئاقاری مرۆگەری ڕاستەقینەو فەلسەفەیەك کە لەسەر مرۆڤ و ڕێزگرتنی مرۆڤ دروست بوویێت و، بەلایەوە مرۆڤ بەنرخترین و دەگمەنترین شتێك بێت لە بووندا..

***هاشم سالح: کەواتە گەر (تەوحیدی) لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بژیایە ئەوا دەستی بە یاخیبوون دەکرد وەك چۆن لە ساتەوەختی خۆیدا یاخی بوو، ڕەنگە کتێبەکانیشی بسوتاندایە وەك چۆن لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا لە ساتەوەختی نائومێدی و عەدەمیەتێکی پڕاوپڕدا ئەوەی کرد؟!***

**محەمەد ئەرکۆن:** بێگومان. شتێکی ئەوتۆم نییە سەرباری ئەوەی بخەم کە (تەوحیدی) لەم بارەیەوە وتویەتی. بەرهەم و نووسینەکانی (تەوحیدی) تایبەت بەم مەسەلەیە بە نوێگەری لە قەڵەم دەدرێت. نوێگەرییە بۆ سەردەمی خۆی و بۆ سەردەمی ئێمەش. چونکە *نوێگەری بەسەردەمکردن یاخود تەزامونیەت نییە، بەڵکو هەڵوێستێکی فیعلی و خرۆشانێکی ڕوحی دیاریکراوە کە ڕەنگە لە کۆنترین سەردەمەکاندا هەبێت و لەنێو ئەوانەدا نەیدۆزیتەوە کە ڕۆژانە لە گەڵیاندایین.*

ئەو نوێگەریەی ئێستا لێی دەدوێم نوێگەریەکی عەرەبی- ئیسلامییە، نەك ئەورووپی- خۆرئاوایی. ئەڵبەتە بیرمەندانی ئەورووپیش هەن کە هەمان هەڵوێستی (ئەبو حەیانی تەوحیدیان) هەبووە، نوێگەریش تایبەت نییە بە خۆرئاوا یان خۆرهەڵات، هەڵوێستی نوێگەری ئەڵبەتە لە هەموو سەردەمێك و لای هەموو میللەتان هەیە. ئاقاری مرۆگەری (هیومانیزم)یش تایبەت نیە بە ئەورووپاو خۆرئاوا وەکی هەندێك لە خۆرهەڵاتناسان دەیانویست وامان تێبگەیەنن، (ئەبو حەیانی تەوحیدی) کاتێك باسی

لەم کێشانە کرد قسەی لە (مەرگی مرۆڤ) نەکرد وەکی ئەوەی (فۆکۆ) کردی، بەڵکو کتێبێکی بە ناوی (الاشارات الالهیە) و کتێبێکی دی بەناوی (المقاسبات)ەوە نووسی.

**هاشم سالح:** ***بەڵام لە لایەن فوقەها توندڕەواکانەوە تاوانبارکرا بەوەی لە ئایین و بیروباوەڕی خۆی وەرگەڕاوە. قسەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: (زەندیقەکانی ئیسلام سیانن: مەعەڕی و ئەبوحەیانی تەوحیدی و ئیبن ڕەواندی. بەدترینیشیان لەسەر ئیسلام (تەوحیدی)یە، لەبەرئەوەی ئەو دوانەی تر بە ئاشکرا بێ باوەڕی خۆیان ڕاگەیاند بەڵام ئەو بە نهێنی هێشتیەوەو ئاشکرای نەکرد. سەبارەت بەم قسە بریندارکەرانە چی دەڵێیت؟***

**محەممەد ئەرکۆن:** بەڵێ، بەوە تاوانبارکرا بیروباوەڕی گۆڕیوە. بەڵام ئەمە مانای چییە؟ ئەو کەسەش کێیە کە تاونباری دەکات و: بە چ مافێك ئەو تاوانەی دەداتە پاڵ؟ فوقەهاکان وەکی من و تۆ مرۆڤن و لە هەڵە بەدوور نین. بەهەرحاڵ ئەمە نەغمەیەکی ئاشکرای هەموو توندڕەوەکانە. هەر بیرمەندێکی ئازاد بیەوێت شتێکی تازە بێنێتە ئارا لە مێژووی ئیسلامدا و، شکۆمەندی فکری ئیسلامی زیاتر بکات تاوانباری دەکەن. ئەمە ئەو شتەیە لە ڕابردوودا ڕووی داو بەردەوام لە ئێستاشدا ڕوودەدات. لە ڕاستیشدا ئەو بیرمەندانەی مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکیەوە بەهێند وەردەگرن و ڕێز لە هەموو لایەنەکانی دەگرن و تاوتوێی هەموو ڕەهەندەکانی دەکەن، ئەوا ئەمانە دەبنە ئامانجی هاوسەردەمانیخۆیان.

هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هاوسەردەمانیان لێیان ناگەن، یان لەبەرئەوەی هەمان ئەو ئامرازانەی ئەوانیان پێ نییە، یاخود لەبەرئەوەی چانسی ئەرەیان نییە بە ژیانێکی چڕو دەوڵەمەندا گوزەر بکەن کە حەقیەقەتی مرۆڤیان بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە بۆ ئاشکرا بکات. بۆ بەدبەختی (تەوحیدی) ئەم چانسەی هەبوو! منیش بۆ بەدبەختیم هەمان چانسم هەبوو، وەکی ئەو دووچاری سەرئێشە بووم، هەریەکەشمان ڕووبەڕووی جۆرەها قسەی ناشیرین و ناووناتۆرەو هێرشی توند بووینەوە.

ئا ئەمە ئاقاری مرۆگەریەو، من لەگەڵ (تەوحیدی)دا پەیمپێبرد. ئەم چەمکە نە لەداهێنانی خۆمەو نە لە ئەورووپا یان لە خۆرئاواشم خواستووە وەکی هەندێك پێیان وایە. بەڵکو زادەی بزاوتێکە لە سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی (نۆیەم و دەیەمی زاینی) لە ناوچەی ئێران– عێراق دا سەری هەڵدا. بۆ نمونە (جاحظ) بۆخۆی هیۆمانستێکی مەزن و، ڕابەرێکی بزوتنەوەی هیومانست بوو.

**هاشم سالح:** ***(تەوحیدی)، (جاحظ)ی بە مامۆستای خۆی دەزانی لە بەیان و شێوازدا..***

**محەممەد ئەرکۆن:** بێگومان، لەبەرئەوەی هەردووکیان هەواداری ئەم ڕێبازە بوون و، هەردووکیشیان بە پلەی یەکەم پەخشان نووس بوون‌و زانایەك بوون لەوانەی شارەزاییان لە تەواوی هونەرو زانستەکانی سەردەمی خۆیاندا هەبوو. دەکرێت مرۆگەری بەمجۆرە دیاریبکەین: مرۆگەری بریتی‌یە لە تێکەڵ بەیەکتر کردنی کلتور و شارستانیە جیاجیاکان‌و، کۆکردنەوەیان نە چوارچێوەیەك و لە ژینگەیەکدا. (جاحظ) عەرەبێکی موسڵمان بوو، بەڵام بەسەر باهۆزی ئەو کلتورو بیرو بۆچونانەیشدا کرابووەوە کە لە دوورەوە دەهاتن. هاوکات (تەوحیدی)یش بۆ خۆی عەرەبی، ئیسلامی، یۆنانی،

فارسی و... هتد بوو. هەموو شتێك بوو. تەواوی سەردەمەکەی لەودا کۆبووبووەوە. بۆیە مایەی گاڵتەجاڕیە کە ئایدیۆلۆژیستەکان و ناسیۆنالیستە توندڕەوەکان ململانێی لەسەر بکەن و، لە بارەیەوە بڵێین ئەو تەنها فارسە یاخود عەرەبە.. (تەوحیدی) فارسیش و عەرەبیش بوو، تەنانەت زیاد لەو دوانەش بوو. چونکە ئەو خاوەنی ئاقارێکی مرۆگەری بەرفروان بوو کە بە سنووری ئەتنیکی یان ئایینی یاخود مەزهەبیەکانەوە پابەد نەدەبوو.

***هاشم ساڵح: دەستەواژەکەی "میشێل فۆکۆ" سەبارەت بە (مەرگی مرۆڤ) لانی کەم دوای سەد ساڵ لە بانگەوازە بەناوبانگەکەی "نیتشە" هات لەمەڕ (مەرگی خودا) (ئەڵبەتە ئەمە بەمانا مەجازیەکەی)، ڕات چیە بەرامبەر دەستەواژەی فەلسەفی رادیکاڵی لەمجۆرەو، چۆن چۆنی تێی دەگەیت؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** ئەمە وام لێدەکات هەمان ئەو شتە دووبارە بکەمەوە کە پێشتر دەربارەی هیومانیزمی (قسە) باسمکرد: هەمیشە شێوەیەکی دیاریکراو لە مرۆڤ دەمرێت. مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست مرد. ئەو مرۆڤە تەواو بوو، ئەمە بەڵگەنەویستێکە..

***هاشم ساڵح: مەبەستت ئەوەیە لە ئەورووپاو خۆرئاوا کۆتایی هات؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** بەڵێ، بەتایبەت لە خۆرئاوا دەکرێت بڵێین سەدەکانی ناوەڕاست بە فیعلی تەواوبوو، نوێگەریش جێگەی خۆی خۆشکردو مەشروعیەتی خۆی دامەزراند. نمونەیەکی دیکەت بۆ باسدەکەم: ئەو مرۆڤە موسڵمانە جەزائیریەی لە سەرەتای سەدەی بیستدا ژیا تا ساڵی (1930–1940) مردو کۆتایی هات. ئەو جەزائیریەی من ناسیم، مەبەستم باوکم و مامەو هەردووکیان کاریگەریان لەسەرم هەبوو مردن. ڕەنگە بتوانی چەند نمونەیەکی کەم و دەگمەن لەوانە، لەناو جەرگەی جەزائیر یاخود لە لوتکەی شاخەکاندا ببینیتەوە. بەڵام ئەوانە بە شێوەیەکی عەمەلی وەکی ئەوەیەك و وەکی حەساسیەت و وەکی جیهانبینی تەواوبوون. بۆچی تەواو بوون؟ لەبەر ئەوەی گۆڕانکاری دیمۆگرافی قووڵ بەسەر کۆمەڵگای جەزائیریدا هات، وەك چۆن لە تەواوی کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامیەکانی تردا ڕووی دا. لەم بارەیەوە نمونەیەکت لەسەر فەرەنسا بۆ دێنمەوە. بەم دواییانە کتێبێکی تازە دەربارەی مێژووی ئایینی ئەم وڵاتە دەرچوو، لەم کتێبەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە فەرەنسا نەك جارێك بەڵکو چەندین جار چۆتە ناو ئایینی مەسیحیەوە. ئەمە لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی هەموو جارێك پێویستی بەوە کردووە گەلی فەرەنسی شوێن ئەو گۆڕانکاریە کلتوری و کۆمەڵایەتیانە بکەوێت کە بە شێوەیەکی کتوپڕ و لە ناکاو لەناو کۆمەڵگای فەرەنسیدا ڕووی داوە، ئەمەش ناچاری کردووە سەرلەنوێ بچێتەوە ناو ئایینی مەسیحیەت و جێگای ئەو هۆکارە تازە کتوپڕانەش بکاتەوە کە لەناو کۆمەڵگەی فەرەنسیدا دروست بوون. کەواتە بەردەوام شێوەیەکی دیاریکراو لە مرۆڤ دەمرێت، ئەوانەی پەیوەستن بە شێوە کلتورێکی دیاریکراو مەرجەعیەتێکی کلتوری تایبەتەوە کۆتاییان دێت، پاشان کلتوری دیکەو شێوازی دیکە لە هیومانیزم و مرۆڤ جێگایان دەگرنەوە. بۆ نمونە ئەو مرۆڤەی لە هەناوی شۆڕشی فەرەنسیەوە هاتەدەرێ، ئەو مرۆڤە فەرەنسیە نیە کە سەر بە سەردەمانی کۆن بوو، بەڵکو مرۆڤێکی دیکەیە. کەواتە بەم پێیە دەتوانین بڵێین خەڵکێك دەمرێت، شێوازێکی دیاریکراو لە

مرۆڤ دەمرێت بەڵام ناتوانین بڵێین مرۆڤ یان خوداوەند بە تەواوەتی دەمرن. ئەوە قسەیەکی بێمانایە. ئەمە پوچگەرایی و عەدەمیەتێکی بەتاڵە. نە موسڵمانان و نە عەرەب پێویستیان پێی نییە. جۆرێك لە تەقدیس هەیە لەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤەدا دەمرێ و کۆتایی دێت کە وایلێکردووە لە قۆناغێکدا باڵادەست بێت و بژی. بەڵام یەزدان وەك مەرجەعیەتێکی سەرمەدی و وەکی دەلالەتێکی رەهایی ئەوا ئەو زیندووەو نامرێت.

***هاشم ساڵح: گەیشتن بە رەهاو ئاوێزان بوونی رەها لە بووندا پێداویستییەکی بەردەوام و هەمیشەیە بۆ مرۆڤ؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** بێگومان، ئەو نیگەرانییە روحیەی ناخی مرۆڤ و ئەو حەزە زۆرەی بۆ نەمری و سەرمەدیەت، بە هەردووکیان رەهەندێکی سەرەکی لە رەهەندەکانی مرۆڤ پێکدەهێنن. مرۆڤ تەنها بە شتە مادیەکان و بەرخۆری مادی ناژی، گەر وابوایە ئەوا وەکی ئاژەڵی لێدەهات. مرۆڤ ناوبەناو پێویستی بەوە هەیە کە مەرجی مادی بوونی تێپەڕێنێ، بۆ ئەوەی باوەش بە شتێکی دیکەدا بکات کە زۆر تەمەن درێژترو بەرفراوانترە، واتە شتێکی هەنووکەیی و تێپەڕ نەبێت. ناکرێت مرۆڤ لەم رەهەندە سەرەکیەی دابڕین و، مافی ئەوەشمان نییە کە شتێکی وا بکەین. ئەڵبەتە ئێمە لە ئاستی ئەوە کەم ناکەینەوە کە پێی دەڵێن (روحانیەتی خۆرهەڵاتی) یان تەسەوف، لە بەرامبەر (مادیەتی خۆرئاوا) مادیەتێك کە تێر نابێت. ئەم کلێشەو دابەشکردنە نەزۆکانە لە فیکردا بەهێند وەرناگیرێت. مادیەت لە هەموو جێیەکدا هەیە، بەهەمان شێوەش روحانیەتیش هەیە، هاوکات تێربوونی روحی بە بێ تێربوونی مادی شتێکی بێمانایە.. ئێمەوە سەر پرسیارەکەت دەربارەی (نیچە) و دەستەواژە بەناوبانگەکەی لەمەڕ (مەرگی یەزدان)، (داوات لێدەکەم ئەم دەستەواژەیە بخەیتە نێوان چەند کەوانەیەکەوە نەك تەنها دوو کەوانەوە، بۆ ئەوەی بەخراپ لێی تێ نەگەن و بەدحاڵی بوون روونەدات). ئەم دەستەواژە بەناوبانگە دنیای هەژاند هەروەك چۆن ساڵی ***1966*** دەستەواژەکەی "فۆکۆ" هەمان شتی کرد، بەڵام ئەوەی (نیچە) هەرای زیاتری نایەوە (لەبەر ئەوەی وتەزاکەی -فۆکۆ- درێژکراوەی دەربڕینەکەی -نیچە-یە)، دەڵێم ئەم دەستەواژەیەی لە دەقێکی بەناوبانگدا هاتووە بەناونیشانی (دیوانە) (کتێبی زانستی شاد-ی- نیچە-دا برگەی ***125***). دەستەواژەکەی (نیچە) مانای ئەوە نیە کە خودا دەمرێت بەمانای مردن یاخود لە رەهادا دەمرێت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە شێوازێکی تایبەت و دیاریکراو لە تەقدیس کە لە ئارادا بوو (ئەویش شێوازی سەدەکانی ناوەڕاست بوو) مردو هەرەسی هێنا. ئەم وێنە پیرۆزە ژیاری پیشەسازی و پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژی (کە لە سەردەمی نیچەدا گەیشتە دوا ئاستی خۆی -کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە- و هەموو ئەورووپای گرتەوە) سڕییەوەو لەناوی برد. کەواتە (نیچە) هیچ شتێکی لەوانەی وتی لە خۆیەوە داینەهێناوە. بەڵکو تەنها سەرنجی ئەوەی داوە کە لە دەوروبەریدا روودەدات وەکی چۆن زانایەك بەوپەڕی ساردی و بابەتیانەوە سەرنجی دیاردەیەك لە دیاردە گەورەکان دەدات. گرفتی (نیچە) ئەوەیە کە ئەو بەر لە بە ئاگابوونی ئەوانی دی بە ئاگادێت و، ئەو شتانە دەبینێت کە ئەوان توانای بینینیان نەبوو. بینینی ئەوانە (نیچە)یان ترساندو، ئەویش لە بەرامبەردا هاوارە بروسکە ئاساکەی خۆی کرد. پرسیاری (نیچە) بەمجۆرە بوو: چۆن دەکرێت ئەم تەقدیسە دێرینەی بەدرێژایی چەندین سەدە بەسەر ئیماندارە مەسیحیەکانی ئەورووپادا باڵادەست بوو، لەبەریەك

هەڵوەشێ و بەلادا بێت بۆ ئەوەی تەقدیسێکی دیکەی تازە شوێنی بگرێتەوە: تەقدیسی زانست و خواکانی زانست و کۆنترۆلکردنی سروشت و گەردوون و شتەکان. کەواتە (نیچە) ئیعلانی مردنی شێوازێکی دیاریکراوی لە شێوەکانی هیومانستی مەسیحی تەقلیدی کرد، شێوازێك کە (کاتی بەسەرچوو بوو) وەکی پەندێکی فەرەنسی دەڵێت، نەوەك ئیعلانی مردنی تەقدیسی لە رەهادا کردبێت. لێرەوە پێویستە بەخراپ لەمجۆرە دەستەواژە قورسانەی گەورە بیریاران تێنەگەین، چونکە رەنگە مەبەستی شتێکی دیکە بێت، پێچەوانەی ئەوەی زۆربەی خەڵکی تێی گەیشتوون. هەمیشە جۆرێکی دیاریکراو لە مرۆڤ و تەقدیس دەمرێت، بەڵام بەردەوام شێوەی تازە جێگای دەگرێتەوە. مرۆڤ بۆ ئەوە دەمرێت تا سەرلەنوێ زیندووبێتەوە. ئەمەیە کە (جولیا کریستیڤا)ی توێژەری فەرەنسی لە دەستەواژەیەکی توکمەدا بە *(بەرهەم هێنانی مانای روخێنەر La genese destructrice du Suens)* ناوی دەبات. مانا بۆ ئەوە دروست دەکرێت و دەهێنرێتە ئاراوە تا بروخێنرێت و لەبەریەك هەڵبوەشێنرێت. چونکە مانا لە رێگای وێرانکردنی ماناو، لەسەر دارو پەردووی مانایەکی دی دروست دەکرێت. پێویستە مانا کۆنە بەرتەسکەکان (ئەو مانایانەی بەکەڵك نەماون و لەگەڵ سەردەمدا ناگونجێن) لەناوببرێن بۆ ئەوەی مانای نوێتر، مانایەك کە زۆر کراوەترو بەرفراوانتر بێت جێگای بگرێتەوە. دەکرێت لێرەدا لاسایی (جولیا کریستیڤا) بکەینەوەو بڵێین: *بەرهەم هێنانی مرۆڤی روخێنەر*: واتە ئەوەی مرۆڤێکی کۆن و پیرۆزیەکی کۆن رەت دەکاتەوە، بۆ ئەوەیە مرۆڤێکی نوێ لە جێگەی دابنێین. بەردەوام مرۆڤی تازە هەیە کە لەسەر دار وپەردووی مرۆڤی کۆن دروست دەبێت. وتەزایەکی لەمجۆرەم پێ پەسەندە، بەڵام بەدەر لەمە ئەوا قبوڵم نییە.

***هاشم سالح: ناکرێت ئێمە ئەم مەسەلە گەورانەی پەیوەندی بە هیومانیزمی کلاسیکی ئەوروپی و شێوازی مەعریفەی کلاسیکییەوە هەیە بوروژێنین، هەروەها باس لەو شۆڕشەی بیرمەندانی فەرەنسی بکەین بەسەر ئەمجۆرە بیرکردنەوەیەدا کە بە درێژایی قۆناغەکانی پێشوو لە ئارادا بووە، بێ ئەوەی (بەتایبەتی) بیر لەو شۆڕشەی تۆ نەکەینەوە بەسەر لۆریانتالیزمدا کە ئەمەش بۆ خۆی بەشێکە لە هیومانیزمی ئەوروپی کۆن و لێی جیا نابێتەوە. ئەڵبەتە شەڕی تۆ لەگەڵ ئۆریانتالیزمدا شەڕێکی روکەشانەی ئایدیۆلۆژی نییە، بەو شێوەیەی عەرەب و موسڵمانان کە سەردەمانێکی دوورو درێژە شەڕێکی توندی لەگەڵدا دەکەن و هەنووکە بۆتە شتێکی بێتاقەتکەرو دووبارە بووەوە، بەڵکو ئەوەی تۆ ترسناکترو زۆر قوڵترە: لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە جەوهەری سستەمی مەعریفەو، ئەو وەرچەرخانە ئەبستمۆلۆژییەوە هەیە کە ئۆریانتالیزم تا ئێستاش نایەوێت میتۆدەو دەرەنجامەکانی لەبەرچاو بگرێت. دەکرێت لەم رووەوە مەسەلەکەمان هەندێك بەدرێژی بۆ باس بکەی!***

**محەمەد ئەرکۆن:** کێشەی من لەگەڵ ئۆریانتالیزمو میتۆدەکانیدا کۆنترە لەوەی تۆ دەیزانیت. مەسەلەکان لەو کاتەوە دەستیان پێکرد کە لە ساڵی *1950* خوێندکاری کۆلیژی ئاداب بووم لە زانکۆی جەزائیر. ئەوکات مامۆستاکان (هەموویان فەرەنسی بوون) بە هیچ جۆرێك کێشەکانی کۆمەڵگەی جەزائیری یان کێشەکانی کۆمەڵگا عەرەبیەکان یان ئیسلامیەکانیان بەهێند وەرنەدەگرت. واتە مەبەستم ئەوەیە ئەوان بە شێوەیەکی مەعریفی و

ئەبستمۆلۆژی ئەو کێشانەیان نەدەخستەڕوو یان هەوڵی ئەوە بدەن گەر چارەسەریشی نەکەن ئەوا دەست نیشانی بکەن. ئەوان لە دوورەوە، زۆر لە دوورەوە لێیان دەڕوانی. لە دەرەوە سەیری ئەو کێشانەیان دەکرد، وەکی ئەوەی پەیوەندی بەوانەوە نەبێت. پاشان لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە: لە میانەی ڕوانگەیەکی هیومانیزمی بورژوازی فەرەنسیەوە سەیریان دەکرد، ئەو هیومانیزمە رووکەشەی دواتر "فۆکۆ" و کەسانی وەك ئەو بە روویدا وەستانەوە.

ئەوکات کلتووری خۆرئاوا خۆی بە کلتورێکی یۆنیڤێرسالی – جیهانی دەدایە قەڵەم. بۆ ئەوەش هاتبووە جەزائیرەوە تا جەزائیریە دڕندەکان بکاتە کەسانێکی شارستانی (واتە بۆ ئەوەی داخڵ بە شارستانیەتیان بکات)، نەك هاتبێت وەك ئیستعمارێك ولاتەکەیان داگیربکات. واتە کلتووری فەرەنسی شانازی بەوەوە دەکرد کە باڵادەستی بەسەر هەموو کلتورەکانی تردا هەیەو، نایەوێت دان بەو کلتورانەو تەنانەت بە زمانی نەتەوایەتیشیاندا بنێت.

لەو قۆناغەدا ئیسلام لە لایەن ئایینی مەسیحیەوە پەراوێز خرابوو، موبەشیرەکان بەو مەبەستە هاتنە جەزائیر تا خەڵکانی ئەوێ لەسەر دینی خۆیان لادەن و بیانکەنە مەسیحی. من بۆ خۆم لەگەڵ هاوتەمەنەکانمدا هەموو ئەم شتانەمان ئەزموون کرد. پێویستە ئەمانە بزانیت تا لە بنەمای بیرکردنەوەو بایەخی ڕۆشنبیری من حاڵی بیت. پێویستە خەڵکی ئەمانە بزانن تا لە هۆکارەکانی بایەخی بوونی فکری من تێ بگەن و، بزانن من دەمەوێ چی بونیاد بنێم.

من لای خۆمەوە هەر بەوەندە ناوەستم (وەکی هەندێك باسی دەکەن) کە هەر ڕەتبکەمەوە یان بڕوخێنم یاخود رەخنە بگرم. سەردەمانی ئیستعمار من لە فەزایەکی سەرکوتکراو و کەڕو لاڵ و بێ‌دەنگ و نائومێدا ژیاوم. وتم (کەڕو لاڵ) و (بێ دەنگ)، لەبەر ئەوەی تەنانەت نەمدەتوانی قسە بکەم و دەم بکەمەوە تا ناڕەزایی دەربڕم. لە جەزائیردا بەر لە سەربەخۆیی، جەزائیریەك مافی ئەوەی نەبوو ناڕەزایی نیشان بدات، یاخود قسە لەسەر مەسەلەکان بکات. چونکە ئەو کاتە ئیستعمار لە دوارۆژەکانیدا بوو، زۆر لە جاران توندترو دڕندەتر بوو، لەبەر ئەوەی هەستی بەدوادوایی مانەوەی خۆی دەکرد.

ئیستعمار بەم شێوە لووت بەرزیەی خۆیەوە ئامادەییەکی بەهێزی لەناو زانکۆدا هەبوو. ئێمە تەنها پێنج یان شەش خوێندکاری بە ئەسڵ جەزائیری بووین زمان و ئەدەبی عەرەبیمان دەخوێند، بەڵام فەرەنسیەکان کە لە کۆلیژەکانی تر دەیانخوێند ژمارەیان هەزاران کەس دەبوو. ئەڵبەتە فەرەنسیەکان حەزیان بە خوێندنی زمانی عەرەبی نەدەکردو، کەم تا زۆر هەوڵی ئەوەیان دەدا ڕێ بە خوێندنی نەدەن و ئاستەنگی لە بەردەمدا دروست بکەن. لێرەوە بیر لە ڕادەی بارقورسی هەلومەرجێکی وا بکەرەوە، بە نیسبەت گەنجانی جەزائیرەوە.

لەوکاتەوە سەرەتاکانی ڕەتکردنەوەی ئۆریانتالیزم لە ناخمدا چەکەرەی کرد، بە هەموو میتۆدەو ئاقارەکانیەوە. پاشان بایەخی بوونم ئاراستە بوو لە دژی کۆمەڵگەو حاڵەتی کۆمەڵگەو، دژی ئەو زوڵم و ستەمەی دووچاری کۆمەڵگەی جەزائیری بووبوو. ئەوکات سەرنجی ئەوەم دەداو ئەو کەلێنە بەرینەم دەبینی کە لە سەرجەم ئاستەکاندا لە نێوان پێشکەوتن و گەشەسەندنی فەرەنساو، دواکەوتوویی جەزائیردا هەبوو. لەو سەردەمانەدا جەزائیر گیرۆدەی ئاقاری سکولائی قوتابخانەیی دووبارە بووەو نەزۆك بووبوو، ئەمە لە کاتێکدا فەرەنساو شارستانیەتی خۆرئاوا بە شێوەیەکی گشتی شانازیان بەخۆیانەوە دەکردو، پشت ئەستوور بوون بە هێزو تازەگەری خۆیان. لەناو ئەم هەلومەرجەدا یەك شت زەینی منی

داگیرکرد ئەویش: ئیرادەی تێگەیشتن و مەعریفە بووە من دەمویست بزانم بۆچی هەلومەرج وەهایە؟ بۆچی بەمجۆرەیە کە هەیە؟ ئەمە ئەو پرسیارە سەرەتایی و ریشەیی‌یە بوو کە لە پشت تەواوی لێکۆڵینەوەو بیروبۆچوونەکانمەوە بووە، بە درێژایی سی ساڵ و تا ئەمڕۆ. بۆ نمونە با شتێکت بۆ بگێڕمەوە، کە لەو سەردەمانەدا کاتێك خوێندمەوە رایچەڵەکاندم، ئەویش گوتارە بەناوبانگەکەی "ئەمیر شەکیب ئەرسەلان" بوو بە ناوی: (بۆچی موسڵمانان دواکەوتن و ئەوانی تر پێشکەوتن؟). ئەم پرسیارە لێم نەبووەوەو بەردەوام داوای وەڵامی لێ دەکردم. بەمجۆرە داخلّ بە رێگای دۆزینەوەو تێگەیشتن و عیرفان بووم.

رەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بووبێت تێکەڵ بە خەباتی سیاسی یان بە حیزبە سیاسیەکان نەبووم، لەبەرئەوەی ئەمانە دروشم و شیکاریی و لێکدانەوەی خێراو بە پەلەیان پێشکەش دەکرد، کارێك کە تینویەتی نەدەشکان و نەیدەتوانی رازیم بکات.

***هاشم ساڵح: تایبەتمەندی و دەگمەنی ئاراستەی فکری تۆش لێرەدایە، بە بەراورد بەو نەوەیە لە رۆشنبیران و ئایدیۆلۆژیستانی عەرەبی کە بە شێوەیەکی گشتی تێکەڵ بە ژیانی سیاسی و حیزبایەتی بوون، ئەمەش زۆربەی کاتی بردن، بە رادەیەك مەسەلەی کەشفی مەعریفی و توێژینەوەی زانستیان فەرامۆشکرد.***

**محەمەد ئەرکۆن:** رەنگە وابێت. بەهەر حاڵ، زۆربەی لاوانی جەزائیر چونە ریزی بزوتنەوە نیشتمانیەکان لە پێناو بەدەست هێنانی سەربەخۆییدا. ئەم مەسەلەیە گرنگی زۆری هەبوو، لە پێش شتەکانی ترەوە بوو. بەڵام لای خۆمەوە، بە مەبەست رێگای فکریم بۆ رزگاربوون هەڵبژارد. بەڵام یاخی بوونی فکریی من هەمان یاخی بوونی تێکۆشەرێکی سیاسی بوو، بە تەنها ئامرازی کارکردن و بەرنامەمان جیاواز بوو، بەڵام ئەو ئامانجەی مەبەستمان بوو یەك شت بوو: کە بریتی بوو لە ئازادی و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی.

لە حاڵەتی یەکەمدا ئامانج ئازاد کردنی سیاسی نیشتمانی بوو، لە حاڵەتی دووەمدا (حاڵەتی من) رزگاری فکری و ئەقڵی و جەزائیریەکان و، تەواوی موسڵمانان و عەرەب بوو. وەك دەبینیت شەڕی دووەم هیچی لە شەڕی یەکەم کەمتر نییە، بگرە زۆر ئاڵۆز ترو دوورو درێژ ترە لە رووی زەمەنیەوە. بەهۆی تەواوی ئەم هۆکارانەوە رەخنەم لەو شێوازی وانە وتنەوەیە گرت کە لە زانکۆی جەزائیردا مێژوویان پێ دەوتینەوە. ئەوە شتێکی ترسناك بوو کە نە لە زانست و نە لە پەیڕەو و پرۆگرامەکانی خوێندن دەوەشایەوە. سەبارەت بە خوێندنی ئەدەب یان زمانی عەرەبی و.. هتد، هەر بەو جۆرە بوو.

لەو کاتەوەو تا ئێستا ئەو یادەوەریە خراپانەم هەر لاماوە، پاشان بەڵێنی ئەوەم بەخۆم دا کە سەرلەبەر ئەوە بگۆڕم. کاتێك لەسەرەتای شەستەکاندا بوومە مامۆستا لە سۆربۆن، دەست بەجێ ئەو ئاقارو میتۆدانەم پەیڕەو کرد کە تەواو لە پەیڕەو و بەرنامەی ئۆریانتالیزمەکان جیاواز بوو. بۆ نموونە ئەوانەی لە سەرەتاوە (واتە لە ساڵی **1960** وە بەدەست نیشانکراوی) ئامادەی وانەکانم بوون دەزانن رادەی جیاوازی لە نێوان مەنهەجیەت و شێوازی من لە توێژینەوەدا، لەگەڵ مەنهەجیەتی ئۆریانتالیزمەکاندا چەندە. لەکاتی وتنەوەی ئەو وانانەدا چەند دەقێکم لە کتێبی مێژوونووسی فەرەنسی (*Robert Mandrou*) دەربارەی بنەمای فەرەنسای تازە بۆ خوێندکارەکان دەخوێندەوە، ئەم دەقانەم بۆ روندەکردنەوەو لە گەڵیاندا دەکەوتمە

باسکردنی، به مەبەستی ئەوەی ئەو جیاوازییەیان بۆ دەربخەم کە لە نێوان مەنهەجیەتی مێژووی تازەو، مەنهەجیەتی ئۆریانتالیزمیدا هەیە. هاوکات باسی ئەوەیان بۆ بکەم کە چۆن دەکرێت مەنهەجیەتی یەکەمیان بەسەر مێژووی کۆمەڵگا عەرەبیو ئیسلامیەکاندا پراکتیزە بکرێت، بۆ ئەوەی دەرەنجامی چاکترو زۆر سوودمەند ترمان دەسگیر بێت.

تۆ ئەوە دەزانیت کە "رۆبێرماندرۆ" سەر بە گروپی (مێژووی تازەیە) لە فەرەنسادا، واتە لە گروپی قوتابخانەی (بڵاوکراوەی ساڵانە)یە. نەوەك سەر بە قوتابخانەی (مێژووی کۆن) بێت کە مێژوو بە شێوەیەکی فیلۆلۆگیو وەسفی پەتی لێکدەداتەوە.

پاشان لە دواییدا گرفتێکی تازەی تر هاتە بەردەم رەوتی زانستیم، ئەویش پەیوەندی بە تێکستی قورئانی و چۆنیەتی خوێندنەوەو تێگەیشتن لەو دەقە هەبوو. هەر دوای ئەوەی کارنامەی دکتۆراکەم دەربارەی (مرۆگەری عەرەبی لە سەدەی چوارمی کۆچی)دا تەواو کردو، لە لێکۆڵینەوەی فیکری ئیسلامی کلاسیکی بومەوە، هەستمکرد دەبێت زیاد لەوە بۆ دواوە بگەڕێمەوە. واتە بگەڕێمەوە سەر چرکەساتی قورئان، بۆ ئەوەی مەسەلەکان بە شێوەیەکی راست فەهم بکەم. هەروەها بۆ ئەوەی باس و لێکۆڵینەوەکەم سەبارەت بە مێژووی فیکری ئیسلامی لەسەر بنەمایەکی بەهێزو پتەو دامەزرابێت. ئەم مەسەلەیەش وەك دەزانیت بە درێژایی چەندین ساڵ و تا ئێستا بەخۆیەوە خەریکی کردووم.

خاڵی سەرەتاو دەسپێکی ئەم کارەش ئەوە بوو، بە رێکەوت هەندێ شتی گرنگم دەربارەی ئینجیل بەرچاوکەوت. فزوڵی مەعریفی خۆم پەلکێشی کردم بەرەو جێو شوێنی دی و ئاپینی دیکە، بۆ ئەوەی وێنەکە لە چوارچێوەیەکی بەرفراوانتردا ببینم و، لە ڕێی بەراورد کردن و تێبینییەوە سەرنجی بدەم. بەراوردکاریش بۆ خۆی بنەمای زانست و تێگەیشتنە. رۆژێك بەسەر کتێبەکانی "دانییل رۆس"دا کەوتم سەبارەت بە ئینجیل. "رۆس" بۆ خۆی نووسەرێکی مەسیحییەو لە چل و پەنجاکاندا ژمارەیەك کتێبی دەربارەی ئینجیلەکان نووسیووە. بەرهەمەکانی زۆر میللی بوون، لەبەر ئەوەی بەشێوازێکی جوان و سەرنج راکێش نوسرابوون. هاوکات ئەم پیاوە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسی بوو. کاتێك بۆ یەکەمجار کتێبەکانی ئەوم بەرچاوکەوت، لەخۆم پرسی ناکرێت ئێمەش سەبارەت بە قورئان شتێکی لەو جۆرەی ئەو بکەین؟ چ دەرەنجامێکمان دەسگیر دەبێت، گەر بەم شێوەیە بەراوردکاریمان لە نێوان ئینجیل و قورئاندا کرد؟

ئەمە دەسپێك بوون هەر ئەمەش دنەی فزوڵی مەعریفی دام. بەمجۆرەو لە بواری قورئاندا دەستم بەکار کردو، سەرەنجامیش ئەو کتێب و توێژینەوانە بوو کە خۆت دەیزانیت.

***هاشم ساڵح: ئەمە مانای وایە تۆ ئەوەت بەرامبەر قورئان کردووە کە بیریارانی رەخنەی مێژووی ئەوروپی لەگەڵ ئینجیل و تەوراتدا کردویانە.. بە واتایەکی تر تۆ دەقی قورئانیت هێناوەتە ناو چوارچێوەی توێژینەوەی زانستی هاوچەرخەوە، بەمجۆرەش ئیسلامت داخڵ بە (مێژوی ئاپینی بەراوردکاری) کردووە؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** بەڵێ، بێگومان. هەر ئەمەش بو لە لایەن مەنهەجیەتی ئۆریانتالیزمیەوە رەتدەکرایەوە، مەنهەجیەتێك ئیسلامی لەناو تایبەتمەندیەکی بەرتەسکدا کۆدەکردەوە تا پەیوەندی بە هیچ شتێکی ترەوە نەبێت. ئەوان قسە لەمەڕ بەهای (یەهودیەت- مەسیحیەت) دەکەن و،

ئیسلام دەکەنە دەرەوەی گۆڕەپانی دینە (ژیاریەکان) یان دەرەوەی ئایینی کۆمەڵگا شارستانیەکان.

یاخود لە باشترین حاڵەتدا گەر دەست بە بەراوردکردنی نێوان قورئان و تەورات و ئینجیل بکەن، تەنها بۆ ئەوەیە بڵێن: قورئان چییە جگە لە لاساییکردنەوەی ئەوان و وتنەوەی شتەکانی ئەوان.. هەرچۆنێك بێت ئەوان بلیمەتی و وزەو واتای زاتی قورئان دەسڕنەوە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە لە گۆڕەپانی وەحی یەکتاپەرستیدا دووری دەخەنەوە، ئەو بوارە تەنها بە مافی یەهودیەت و مەسیحیەت دەزانن.

بەلام ئێمە دەزانین قورئانیش وەك ئەوان دەچێتە چوارچێوەی هێڵی ئایینی یەکتاپەرستی، تەواو وەك هەریەك لە ئینجیل و تەورات. ناکرێت چارەسەری ئەو کێشە هەڵپەسێردراوانە بکرێت کە بە درێژایی چەندین سەدەیە لە نێوان هەرسێ ئایینە یەکتاپەرستیەکەدا هەیە، تەنها بەزێرەو ژوورکردنی ئەو مەنهەجیەتە تەقلیدی و حەساسیەتە بەرتەسکە نەبێت. لەبەر ئەم هۆیە دەبینیت من کاتێك قسە دەربارەی ئیسلام دەکەم، بەردەوام ئاماژە بۆ یەهودیەت و مەسیحیەت دەکەم. بۆ ئەوەی مەسەلەکان بخەمە ناو دیدگایەکی بەراوردکاری و راست و دروستەوە.

بەلام ئەو هۆکارە راستەقینانە چین کە هانم دەدەن بۆ ئەوەی مەنهەجیەتێکی بەراوردکاری بەرفراوان بگرمە بەر، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابم لەو چوارچێوە بەرتەسکانە بێمە دەرێ کە تیایدا هەر ئایینەو ئەوی دی ئافەرۆز دەکات؟ پێم وابێت سەرەکیترین شتێك لێرەدا پێویست بەوە بکات جەختی لەسەر بکەم، بۆ ڕونکردنەوەی فکری خۆم و ئاراستەی مەعریفیم ئەمەیە: هەرچی پەیوەندی بە مەغریب نشینەکانی وەك جیلی منەوە هەیە، ئەوا ئێمە لەناو فەزایەك لە پێکۆلکردنی فکری و پێکۆلکردنی کلتوریدا ژیاین و گەورە بووین. ئێمە لەو ئامادەیی و زانکۆیانەدا خوێندمان کە شێوازێکی فەرەنسیان هەبوو. لەوێدا هەمان ئەو وانەو بەرنامەی فێرکاریەمان پێ دەوترا کە خوێندکارێکی پاریسی لێرەدا دەیخوێند.

ئەمە شتێکە رەنگە تۆ یاخود ئەوانەی هاوتەمەنی تۆن نەیزانن، بەتایبەتیش تۆ سەر بە وڵاتانی خۆرهەڵاتی عەرەبیت نەك خۆرئاوای عەرەبی. بەلام هاوکات کە وەکی هەر فەرەنسیەك لەوێدا کلتوری فەرەنسیمان پێ دەوترایەوە، ئێمە عەرەب و موسڵمان بووین لای کەس و کارو خزمانمان لە کۆمەڵگای جەزائیریدا. لەبەر ئەم هۆیە دووچاری شۆکێکی فکری بووین، شۆکێکی بە زەبرو پڕاوپڕ.

من هەر لە تەمەنی حەوت ساڵیمەوە دەستم بە فێربوونی زمانی فەرەنسی کرد، ئەویش لە خوێندگایەکی سەرەتایی وەك هەموو ئەو جیلەی وەکی من وابوون، لە جەزائیری و مەغریبی و تونسی. ئەم پرۆسەیەش تەنها دوای سەربەخۆیی کۆتایی هات. کاتێك بەم رادەیە کلتورێکی دیکەو زمانێکی دیکەت دەدرێتێ، پاشان لەناو کلتورو زمانی رەسەنی خۆتدا گەشە دەکەیت و گەورە دەبیت، ئەوا توشی راچڵەکین و شۆکێکی توند دەبیت و، هەست بە هەناسەسواری و دابڕان دەکەیت. بەلام ئەم ئەزموونە (رووی ناکۆکیەکەشی لێرەدایە) ئەنجامی ئیجابی و گەورەشی لێدەکەوێتەوە. یان راستر بڵێین ئەو شتەی لە مندا دروستکرد، سەرەڕای ئێش و ئازارو ئەو شۆکە تاڵەی یەکەمین جاری.

لەبەر ئەوە من هەست بە نائومێدی دەکەم کاتێك دەبینم ئەو خوێندکارانەی ئەمڕۆ لە وڵاتانی عەرەبیەوە دێنە ئێرە، بۆ ئامادەکردنی بڕوانامەی دکتۆرا، ئاستی رۆشنبیریان بە ئەندازەیەکی زۆر لاواز دەبینم. بە داخەوە بۆ ئەو کەلبوونە رۆشنبیریەی

بەرەنجامی ئەوەیە رۆشنبیریەکی بیانی تازەیان نییە، لە پاڵ رۆشنبیریەکی عەرەبی رەسەندا.

ئەمرۆ ئێمە ئەوە دەزانین کە ناکرێت رۆشنبیریەکی مەنهەجی و زانستی راستەقینە دامەزرێنین، گەر بێتو خوێندکار خاوەنی زمانێکی بیانی یان تەنانەت دوو زمان (بۆ نمونە ئینگلیزی و فەرەنسی) نەبێت. ئەمەش زیان بە زمانە ئەسڵیەکەیان ناگەیەنێت یاخود لێی کەم بکاتەوە. بۆ نموونە ئەڵمانیەکان جگە لە زمانی خۆیان قسە بە زمانێکی بیانی دیکە دەکەن (کە زۆر جار زمانی ئینگلیزی)یە. مەسەلەکەش لای هۆڵەندیەکان و تەواری گەلانی باکوری ئەوروپا بەو شێوەیەیە.

بناغەی بڕیاری رەخنەییم و تێکەڵ بوونم بە بواری توێژینەوەی زانستی، ئەوەیە کە من هەرگیز دەست بەرداری رۆشنبیری ئەسڵی خۆم نەبووم و، پەیوەندیم بە کۆمەڵگەو ژینگەی ئەسڵی خۆمەوە نەپچڕاندووە. بە پێچەوانەوە، هەوڵی ئەوەم داوە (ئەگەرچی لە تاراوگەش بووم) بەرپرسیارێتی تەواو سەرشانی خۆم بخەم: مەبەستم لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی کەشفکردنی کێشەی ژینگەی ئەسڵی خۆم و دەست نیشان کردنی گیروگرفتەکانی ناوی بووە، لە پێناو یارمەتیدان لە چارەسەر کردنیاندا. هاوکات بە جدیش (ئەگەرچی بە دیدگایەکی رەخنەییەوە) کەرەستەکانی رۆشنبیری ئەوروپیشم وەرگرت. دوای زمانی فەرەنسی و رۆشنبیری فەرەنسی فێری زمانی ئینگلیزیش بووم، هەنووکە کەم تا زۆر وەکی زمانی فەرەنسی دەستم بەسەر ئەویشدا دەشکێ.

**هاشم ساڵح:** *یانی وەك زمانی فەرەنسی؟!*

**محەممەد ئەرکۆن:** بەڵێ، بەڵێ. ئەو کارەشم بەمەبەست کرد لە پێناو فراوانتر کردنی ئاسۆی مەعریفیمدا. چەندین کتێب و نووسراو هەن دەربارەی ترادسیۆنی ئیسلامی و عەرەبی کە راستەوخۆ بە زمانی ئینگلیزی دەنووسرێن و، مەرج نییە نەك هەر بۆ عەرەبی بەڵکو وەرگێڕدرێنە سەر زمانی فەرەنسیش. هەروەها مەنهەجیاتی نوێ لای ئەنگلۆ- سەکسۆن هەن کە رەنگە لای فەرەنسیەکان نەبێت. سەرەڕای ئەوەش زمانی توێژینەوەی زانستی هاوچەرخ لە ئێستادا ئینگلیزیە، نەك تەنها تایبەت بە زانستە سروشتیەکان بەڵکو سەبارەت بەوەشی کە پەیوەندی بە زانستە مرۆڤایەتیەکانەوە هەیە. هەروەها من بۆ خۆم ناچارم بەوەی زمانی ئینگلیزی بەکاربهێنم بۆ وتنەوەی ئەو لێکچەرانەی ناوبەناو لە هەریەك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەڵمانیاو، وڵاتانی دیکەی وەك ئەواندا پێشکەشی دەکەم.

**پەراوێز:**

*محەمەد ئەرکۆن لە ناوچەی "تاووریرت میمون" لە وڵاتی جەزائیر لە دایك بووە.

*خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری "وەهران" تەواو کردووە.

*پاشان چۆتە جەزائیری پایتەخت و لە زانکۆی ئەوێدا زمانی عەرەبی لەکۆلیژی ئاداب دا خوێندووە.

*لە دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ رووی کردۆتەوە فەرەنساو لە ناوەراستی پەنجاکانەوە (لە پاریس نیشتەجێیە.. ساڵی 1969 لە زانکۆی سۆربۆن" بڕوانامەی دکتۆرای دەوڵەتی وەرگرتووە. کارنامەی دکتۆراکەشی دەربارەی (مەسکویەو ئاقاری مرۆگەری عەرەبی لە سەدەی چوارەمی کۆچی)دا بووە.

*ساڵی 1961 بۆتە مامۆستای یاریدەر لە زانکۆی سۆربۆن، پاشان لە ساڵی 1970دا کورسی مێژووی فیکری ئیسلامی پێدراوە لەهەمان زانکۆدا.

*لە 1976 بۆ 1988 بەڕێوەبەری "پەیمانگای خوێندنی ئیسلامی" بووە لە سۆربۆن.

*سەرنووسەری گۆڤاری ARABICA بووە کە تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوەی عەرەبی و ئیسلامی.

*لە زانکۆکانی ئەمریکاو ئەورووپاو ئاسیاو ئەفریقا وانەبێژ بووە.

*ئەندامی لیژنەی نەتەوایەتی ئاکار بووە لە فەرەنسا.

*خاوەنی چەندین کتێبی گرنگە دەربارەی فیکری ئیسلامی کە بە زمانی فەرەنسی نووسیونی و، "هاشم سالح" لەگەڵ پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسیندا زۆربەی زۆری وەرگێڕاونەتە سەرزمانی عەرەبی، لەوانە:

1- مێژووی فیکری عەرەبی- ئیسلامی، 1986.

2- فیکری ئیسلامی/ خوێندنەوەیەکی زانستی، 1987.

3- ئیسلام: ئاکارو سیاسەت، 1988.

4- ئیسلام: رەخنەو ئیجتیهاد، 1990.

5- ئیسلام، ئەورووپا، خۆرئاوا، 1995.

6- ئاقاری مرۆگەری لە فیکری عەرەبیدا، 1996.

7- چەند مەسەلەیەك دەربارەی رەخنەگرتن لە ئەقڵی ئایینی، 1998.

* * *

**هاشم سالح ساڵی 1950 لە پارێزگای (لاذقیـة) لە سوریا لە دایك بووە.

*ساڵی 1973 لیسانسی لە ئەدەب و زمانی عەرەبیدا لە زانکۆی دیمەشق وەرگرتووە.

*لە هەمان زانکۆ ساڵی 1975 بڕوانامەی ماستەری پێدراوە.

*ساڵی 1981 بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سۆربۆن وەرگرتووە، کارنامەی دکتۆراکەشی لەسەر "رێبازەکانی رەخنەی ئەدەبی نوێ" بووە.

*بە درێژایی ئەم بیست ساڵە لە پاڵ وەرگێڕانی زۆربەی زۆری کارەکانی "محەمەد ئەرکۆن"دا بۆ سەر زمانی عەرەبی، چەندین وتارو لێکۆڵینەوەو کتێبی لەسەر فیکری ئەورووپی تازە پێشکەش بە کتێبخانەی عەرەبی کردووە.

### سەرچاوە:

محمد اركون: الفكر الاسلامي (نقد و اجتهاد) ترجمه تعليق: هاشم صالح- دار الساقي، بيروت- الطبعة الثالثة، 1998.

# گوتاری ڕێنیسانس و ڕۆشنگەری بەدەستەبژێریانە مایەوە

## گفتوگۆیەك لەگەڵ (د. نەسر حامد ئەبو زەید)دا

• و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

لە ساڵی 1995و لە ڕۆژێکی وەك ئەمرۆدا، دادگای (ئیستئناف) لە قاهیرە پابەندبوونی خۆی لەسەر بڕیاری جیاکردنەوەی نێوان (نەسر حامد ئەبو زەید) و هاوسەرەکەی (ئیبتیهال کەمال یونس) دووپات کردەوە، بەمەش پەردە لەسەر دوابەشی کێشەیەکی دەگمەن دادرایەوە کە ناوەندی ڕۆشنبیری عەرەبی لەم نیو سەدەیەی دواییدا نموونەی لەو جۆرەی بەخۆیەوە نەبینیوە.

پێش دوو هەفتە بیرمەندی میسری، بۆ یەکەمین جار دوای دەرچوونی بۆ ئەمستردام، لە پایتەختێکی عەرەبی - عەممانداـ دەرکەوت، تا سەرلەنوێ پابەندبوونی خۆی بە پرنسیپەکانی دین دووبارە بکاتەوە، هەروەها بەرگری لە مافی خۆی بکات سەبارەت بە لێکۆڵینەوەو "إجتهاد" کردن. "الوسط" چاوی کەوت بە خاوەنی "فەلسەفەی هێرمۆنێتیك- فلسفه التأويل-" کە بوونی هۆشیارییەکی ڕەخنەیی بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ سەرجەم گوتارە جیاوازەکان و گونجاندن لە نێوانیاندا بە پێویست دەزانێ، لە هەمانکاتدا بیری خستینەوە کە ئێمە "پێویستیمان بە تەنها تێڕوانینێك نییە کە گوایە تاقە چارەسەری ئەفسوناوییە".

(نەسر حامد ئەبو زەید) توێژەرەوەیەکی ناسراوە، ناوی ئەو بەندە بە کێشەیەکی کارەسات بارەوە، سەرەتا بە تەکفیرکردنی دەستی پێکردو دواجار بە دەرکردنی بڕیارێکی شەرعی بۆ بە زۆر تەڵاق دانی ژنەکەی کۆتایی پێهات.

لە 8ی ئازار "مارس"ی ساڵی 1993 ئەنجومەنی زانکۆی قاهیرە ڕازی نەبوونەسر حامد ئەبو زەید لە پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەرەوە بەرز بکاتەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆر لە بەشی زمان و ئەدەبی عەرەبی (کۆلێژی ئاداب) بە بیانوی ئەوەی گەوا "ناتەواوییەك لە عەقیدەیدا هەیە -خللاً في الاعتقاد-" ڕۆژی 14ی حوزەیران (یونیو)ی ساڵی 1995، دادگای ئیستئنافی قاهیرە بازنەی 14، بە پشت بەستن بەو



سکاڵای "حسبە"یەی کە محمد عبدالصمدی پارێزەر بەرزی کردبووەوە، بڕیاری دا بە جیاکردنەوەی نێوان دکتۆر ئەبو زەید و هاوسەرەکەی ئیبتهال کمال یونس- لە یەکدی.

دوای دەرچوونی ئەو بڕیارە بە دوو رۆژ بیرمەندی میسری "پەیامێکی بۆ گەلی عەرەب" دەرکردو، تێیدا هاتووە کە ئەو "توێژەرەوەیەکی موسڵمانەو ژیانی بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام تەرخان کردووەو" پێسەیربوون و توورەبوونی خۆی بەرامبەر ئەو کەسانە دەربڕی کە لە بری ئەوەی قسەو گفتوگۆ لەسەر بیروڕاکانی بکەن هەوڵی کوشتنی دەدەن.

هەروەها هاوسەرەکەشی کە مامۆستایە لە بەشی زمانی فەرەنسی کۆلیژی ئاداب لە قاهیرە، ئەو بڕیارەی رەت کردەوەو دانی پێدا نەناو وتی "بۆ هەمیشە هاوسەری ئەوم و تا مردن لەگەڵیدام". لە یادی تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر دەرچوونی بڕیاری بە زۆر تەلاق دانەکەدا کە بووە هۆی ئەوەی ئەبو زەید و هاوسەرەکەی بە ناچاری پەنا بەرنە بەر ئاراوگە، ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵ توێژەری ناسراودا ساز کرد، کە تێیدا باس لە کۆمەڵێ کێشەی بەردەم عەقڵی عەرەبی دەکات، لەوانە ئەو دوو فاقیەی لە هەڵوێستی رۆشنبیرانی عەرەبدا هەیە سەبارەت بە کێشەکانی ژنان و، دەستەبژێربوونی گوتاری رۆشنگەری عەرەبی و، ئەو نێرایەتیە لە رادە بەدەرەی کە وای کردووە بزاوتە داهێنەرەکانی ژنان لە سێبەردا گیر بخوات. هەروەها ئەم گفتوگۆیە کۆمەڵێ پرسیار دەخاتەوە دەربارەی چەند بابەتێکی هەنووکەیی فکری عەرەبی ساتەوەختی لە ئێستادا، لەوانە قسە لەسەر تێزەکانی بیرمەندی بەحرێنی (محمد جابر ئەلئەنساری) دەکات و، رایدەگەیەنێت کە پێویستە بۆچوونی "پێکەوە گونجاندن- التوفیقیە-" تێپەڕێنین.

هەروەها ئەبو زەید کە ئێستا لە ئەمستردام دادەنیشێت، ئاماژەی بۆ هەندێ لەو کێشانە کرد کە پەیوەستن بە تێڕوانینی عەرەب سەبارەت بە رۆژئاواو، ململانێ لەگەڵ ئیسرائیل. هیواشی خواست جۆرە رۆشنبیرێکی تازە لە دایک بێت کە خاوەن پەیام بێت، جگە لەوەش بانگهێشتی خسە کەری ئیشە رەخنەیە فکریە سەربەخۆکانی کرد تا بوێرانە رووبەڕووی هەموو قەیرانە جۆراوجۆرەکان بینەوەو، "شێوازێکی لێک دراو- صیغە مرکبە" پەیڕەو بکرێ کە

**خاڵی پێکگەیشتن و کۆکردنەوەی شێوازە فکری و کەرەستە جۆراو جۆرەکسان بێست، بـە ئامـانجی بنیـات نـانی کۆمەڵگایەکی عـەرەبی تـازە. ئەمـەی خـوارەوە دەقـی چاوپێکەوتنەکەیە.**

***دوای سـەدەیەکی تـەواو لـە خسـتنەڕووی مەسـەلەی "ئـازادی ژنـان" بۆچی کێشـەکانی ژن لـە گفتوگـۆو قسـەکردنەکاندا پێگەیـەکی بنچینەیی تەواویان نادرێتێ؟***

–گرفتەکە لەو دووفاقیەی نێوان وتن و کرداردایە.

رۆشـنبیری عـەرەبی قسـە لەسـەر ئازادیـەکان دەکات و، لەگەڵ ژنانیشدا بە شێوەیەك هەڵسوکەوت دەکات وەك ئەوەی شتێك بێت. هەروەها باسکردنی ئازادی ژنـان لـە لایـەن رۆشـنبیرەوە لـەخۆ بـە زل زانینەوە دێت، ئەو –واتە رۆشنبیر– خـۆی وا نیشان دەدات کە "ئازادی دەبەخشێت" نەك داوای بکـات لـە روانگەی ئـەو هاوکێشـەیەوە هەریـەك لـەو دوو لایەنـە بەشێك لە ئازادی خۆیان لەدەسـت دەدەن گـەر بێتـو ئەویتریان ئازاد نەبێت.

***بـۆ نموونـە ئایـا تەماشـای هەڵوێسـتی مێژووی "قاسم ئەمین" ئەکەیت، بەو پێیەی کە رۆڵـی پیـاو کـورت دەکاتـەوە، یـان تەنـها وەك بەشـداری کـەرێك بەشـداری دەکـا لـە شـەڕی ئازادیدا؟***

–کەس لاری لەوە نییە کە بەشداری کردنی قاسم ئەمین بەشداری کردنێکی بنچینەییە. بەڵام پێم وایە بەشـداریکردنی ژنــان لــە پرۆسـەی رزگـاربوونی کۆمەڵایەتی و رزگاربوونی خودی خۆی لـە سـەردەمی قاسم ئـەمیندا بـە شـێوەیەکی بـاش پـەردەی لەسـەر لانەدراوەو باس نەکراوە.

***بۆچی؟***

–ئەوکاتـەی دۆخـی ئـافرەت لـە ئاسـتێکی نزمـدا بێت، ئەمـە یارمـەتی ئـەوە دەدات کـە پلـەو پایـەو ئامادەبوونی بسڕێنەوەو، پێدەچێت مێژووی رەسمی لەسـەر ئاسـتی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و فەرهـەنگی شوێنێکی بنچینەیی بە ئافرەت نەبەخشیبێت تا رۆڵی سەرەکی خۆی ببینێت.

بۆ نموونە زۆرن ئەوانـەی کـە (نظيرة زين الدين) ناناسن، لـە کـاتێکداو لـە کۆتـایی بیسـتەکاندا یەکـەم کتێب کە دەربـارەی رزگـاربوونی ژنـان نووسـراوە بـە پێنووسی ئەم ئافرەتە شامیە بووە، بەڵام لە ئێستادا کتێبەکانی دەست ناکەون. هەروەها لـەو سـەردەمەدا نامەیـەکی دکتـۆرا هەیـە کـە دانەرەکـەی فـهمی منصورە، وەرگێڕراو بڵاویش کرایەوە، لـە پاشـان بـە تەواوەتی دیار نەما.

**دووفاقی قەرەبوودانەوە:**

***بەشـداریکردنی پیـاوانی وەك (عبدالعزيـز السعالبی و طاهر حداد).. ئاچنە هـەمان خانـەی ململانێکـەوە؟ خسـتنەڕووی کێشـەی ژنـان لـە بنەڕەتـەوە بـەبێ بەشداریکردنی پیاوان بە هیچ شێوەیەك سەرناگرێت، چونکە ئەوانیش لایەکی هاوکێشەکەن..***

–ئەمــە راســتە، نموونــەی (طـــاهر حـــداد) نموونەیـەکی گرنگە. بـەپێی ئاقیکردنـەوەی خـۆم کەمـەکێکی زۆر کـەم لـە رۆشـنبیرانی عـەرەبی، چ ئەوانـەی رۆژهـەڵاتی عـەرەبی و چ ئەوانـەی رۆژئـاوای عـەرەبی، ئاگاداری ژیـانی ئـەم پیـاوەن و ئاگـاداری فکرو هەوڵە رۆشـنگەریەکانین هـەروەها کەمـەکێکیان ئاگـاداری ئیـش کردنـی ئـەون لەسـەر دەق و، رۆڵـی گرنگی ئەو لەسەر بەرەوپێش بردنی کۆمەڵگا.

***ئایا پلەو پایەی ژنان لە سیاقی لکری رزگاریخوازی خۆیدا لاواز نەبووە (لەو کاتەوەی کە ئاقاری بیری مارکسی و نەتەوایەتی سەریان هەڵداوە) بەرپرسیاریەتەکەش ناکەوێتە ئەستۆی رێبەرانی ئەو ئاقارە فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتیانە؟***

-ئەو کێشەیەی کە پێی دەوترێت رۆشنگەری، یان گوتاری رێنسانسی عەرەبی لەسەر هەموو ئاستە جوگرافی و مێژووییەکانی تەنها تایبەت بوو بە دەستەیەکی دیاریکراوی خەڵك و هەرگیز نەگەیشتە قولایی، نەگەیشتە ئەو مرۆڤەی کە رۆشنگەری باسی لێوە دەکات. ئەمە جگە لەوەی گوتاری رۆشنگەری بە تەنها لە شارەکاندا مایەوە، کاتێك ئێمە باسی ژن دەکەین ئەوا مەبەستمان ژنانی شارەکانە. بۆ نموونە ژن لە لادێکانی میسردا، ئەو گیروگرفتانەی نییە کە ژنانی شار پێیەوە گیرۆدەن. ژنانی لادێکان لە هەموو بوارەکاندا یارمەتی پیاوان دەدەن، بە تایبەتی لە بواری ئیش کردندا. بۆیە دەتوانین بڵێین گوتاری رێنسانس، بە شێوەیەکی گشتی، دەستەبژێریانە بوو.

ئەمە جگە لەوەی رزگاربوونی ژنان بە شێوەیەکی عەمەلی بەسترابووەوە بە پلانەکانی نوێکردنەوەو پیشەسازی (التحدیث و التصنیع) و پێویست بوونی بەهێزی کار. ئامانجەکانی بە بەردەوام ئامانجێکی پراگماتی بوون، بۆیە هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتی لەناو کۆمەڵگادا رووی نەدا، بە دیاریکراوی لەناو چینی ناوەڕاستدا کە هەڵگری ئاڵای رێنسانس بوو، چینی ناوەڕاست چینێکە پێکهاتەیەکی ئابووری سیاسی کۆمەڵایەتی شلۆقی هەیە. ئەم چینە لە دوو جەنگدا بەشداریکرد کە لە هەردووکیاندا سەرکەوتنێکی زۆر کەمی بەدەست هێنا: یەکێکیان دژی دەرەبەگ، ئەویتریان دژی کۆلۆنیالیزم بوو. ئەمەش وایلێکرد ببێتە چینێکی شەکەت و ماندوو، ئەم ماندووبوون و شەکەتیەش رەنگدانەوەی لەسەر بیرمەندەکانی هەبوو. بۆیە گوتاری هەر یەکێك لەو بیرمەندانە لە بوارە مەعریفیە هەمەجۆرەکاندا پەرش و بڵاو بوویبوونەوە، ئەمەش وایکرد لە هەموو بوارەکاندا جۆرێك لە دەست تێوەردان و تێکەڵی رەنگ بداتەوە. بۆ نموونە بیرمەندێکی دیاریکراویان قسە لەسەر "ئیسلامیات" دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا خۆی بە پرۆسەی رۆشنگەری و، بەرەنگاربوونەوەی رۆژهەڵات ناسان و بەرگری کردن لە ئیسلام.. سەرقاڵ کردووە، بە شێوەیەك کە زۆرجار تووشی تێکەڵی و بەدحاڵی بوونێکی گەورە دەبێت. بیرمەند هەمیشە لە حاڵەتی بەرگری کردندایە، پەرش و بڵاوە، ئەمەش لە توانای هەوڵە رۆشنگەریە راستەقینەکان کەم دەکاتەوە کە پێویستیان بە خۆ تەرخان کردنێکی تەواو دروست هەیە.

ئێمە تا ئێستاش بە جۆرێك لە جۆرەکان لە حاڵەتی بەرگری کردنداین، کێشەی ئافرەتیش بەشێکە لەم کەش و هەوایە. من لەو بڕوایەدام زۆربەی ئەوانەی لەسەر ئازادی ژنان دەنووسن گرفتەکەیان لە خۆش باوەڕیاندایەو، زۆربەی ئەوانەی بانگهێشتی ئازادی بوونی ژنان دەکەن دەڵێن: حەرامە ژن ئازادی نەدرێتێ. لە کاتێکدا پێویستە ئەم لۆژیکە (المنطق) هەڵگێڕینەوە، حەرام ئەوەیە کە ئێمە هەموومان، ژن و پیاو، ئازاد نەبین. چونکە تۆ چۆن ئازاد دەبیت لە کاتێکدا ئەویتر بچەوسێنیتەوە؟ پیاو ژن دەچەوسێنێتەوە، دەسەڵاتیش پیاو دەچەوسێنێتەوە، لەبەر ئەوە پیاو لەناو دووفاقیەکی گەورەدا دەژی کە ئەویش دووفاقی قەرەبوودانەوەیە. بە داخێکی گرانەوە زۆربەی هەرە زۆری رۆشنبیرانی عەرەب لەناو ئەم دووفاقییە قەرەبوودانەوەیەدا دەژی.

***محمد جابر ئەلئەنساری لێکۆڵینەوەی لەسەر حاڵەتی "خۆگونجاندن- التوفیقە" کردووە کە فکری عەرەبی لە ناویدا دەژی، حاڵەتی یەکلایی نەکردنەوە لە نێوان ئەگەرە ناکۆکەکاندا..***

-من ئەم "خۆگونجاندنە" ناو دەنێم "ساختەیی- التلفیقیە" چونکە خۆگونجاندن مانای ئەوەیە لە ململانێی نێوان دژەکاندا بە کەڵاڵەکردنی پوختەیەکی تازەوە بێیتە دەرەوە. بەڵام ساختەیی- التلفیق- ئەوەیە کە ئێمە لە رێگای ئاشت کردنەوەوە دژەکان هەروەکو خۆیان بهێڵینەوە. ئەم دیاردەیەش لە ژیانی عەرەبیدا بووەتە شتێکی نەگۆڕ، خۆی بەسەر رێڕەوی فکری عەرەبیدا سەپاندووە لە هەموو وەرچەخانەکانیدا.

***ئایا دەرك کردنی هوشیاریانەی ئەم حاڵەتە دەبێتە یەکەم هەنگاو بۆ دەرباز بوون لێی!***

-لەمێژە تێبینی ئەم رەگەزەم -واتە هۆشیاری- کردووە، لە زۆر لێکۆڵینەوەدا لە بارەیەوە دواوم و، من زۆر دڵخۆش بووم بەو لێکۆڵینەوەیەی (ئەلئەنساری) چونکە فکرەکەی فراوان تر کرد، لە چوارچێوەی کەلەپورەوە گواستیەوە بۆ پرۆژە تازەگەریەکان. ئەمە جگە لەوەی لێکدانەوەو شیکردنەوەکانی راستیەکی هێجگار زۆریان تیا بەدی ئەکرێت.

بەڵام ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە، چۆن بتوانین ئەم شێوازی ساختەیی‌یە تێپەڕێنین؟ بۆ نموونە ئایا تێپەڕاندنەکەمان تێڕامانێکی عەقڵیانە بێت، یان تێپەڕاندنەکە دەبێت بە گۆڕینی پێکهاتەی واقع بێت؟

بێگومان سەرکەوتنی تەواوەتی لە ململانێی گۆڕینی کۆمەڵایەتی‌دا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەم قەیرانە دەرچین. لێرەدا دەبێت ئەو راستیەش بزانین کە رۆڵی فکر بەشێکی سەرەکی‌و جەوهەریە لە پرۆسەی گۆڕینی کۆمەڵایەتی. لانی کەم لە سنوری خوێندنەوەی من بۆ واقعی میسری، لەو بڕوایەدام، کە هاش و هۆشی جەنگ و رژاندنی خوێنەکان، نیشاندەری ئەوەن کە ئێمە ئازاری لە دایك بوونی قۆناغێکی تازە دەچێژین، قۆناغێك کە بە شێوەیەکی تەواو دابڕاوە لەگەڵ ئەو حاڵەتی ساختەیی‌یە - التلفیقی- ئەم هاش و هوش و دەنگە دەنگە گوزارشت لەو روناکیە دەکات کە دەیەوێت لەو حاڵەتی داتەپین و چەق بەستنە بێتەدەرێ. کەواتە هۆشیاری هەنگاوێکی سەرەکی و بنچینەیی‌یە، بۆ ئەوەی بجووڵێین، پێش ئەوەی ئەم هەلەشمان لەدەست بچێت و سەرلەنوێ پەنجەرەکان دابخرێنەوەو، دیسانەوە لە رێگای ساختەیی‌یەوە جۆرێك لە ئاشت بوونەوە بەدەست بێنینەوە کە چارەکە سەدەیەکی تریش بخایەنێت.

**ئەیاری دەرەکی**

***"ئەیاری دەرەکی" کە لە ئیسرائیل‌و رۆژئاوای کۆلۆنیالیزمدا خۆی دەنوێنێت، تا چەندی تر وەك رەگەزێکی گوشار لەسەر ژیانی عەرەبی دەمێنێتەوە، بۆ هێشتنەوەی حاڵەتی "خۆگونجاندن" یان "ساختەیی" لە فکرو هەڵسوکەوتی عەرەبیدا؟!***

-رۆڵی ئەیاری دەرەکی لەم مەسەلەیەدا زۆر ترسناکە. لە ئارادابوونی ئەم رۆڵەش بە شێوەیەکی عەمەلی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدە، بگرە لە سەردەمی شەڕی خاچ پەرستەکانەوە دە ت پێدەکات. بەڵام با واز لەو جەنگانەو دیمەنەکانی بێنین، چونکە ئەمەیان هەڵسەنگاندنێکی جیاوازی هەیە، ئەمە جگە لەوەی کە جیهانی ئیسلامی لەو شەڕانەدا نەدۆڕاوە، بەڵکو لە کۆتایی سەدەی هەژدەو

سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دۆڕاوە. لە ئەنجامی ئەم دۆڕاندنانەش کاردانەوەیەك دروست بووە، کە بە مەزەندەی من تا ئێستاش هۆشیاری عەرەبی لەناو ئەو کاردانەوەیەدا گیری خواردووە.

ئەگەر تەماشای پەیوەندی جیهانی عەرەبی بە رۆژئاواوە بکەین، کە بووە هۆی هاتنەئارای گوتارەکانی "دابڕان-القطیعة"، و "رەسەنایەتی" و "بەرگری کردن لە شوناس" و.. هەروەها هەندێ گوتاری دیکەش کە هەر هەموویان خزمەتی جوودابوونەوەیەکی تەواو دەکەن، وا تێدەگەین کە ئەم رۆژئاوایە تەنها لە سەدەی هەژدەدا ئاشکرا بووە بۆمان. لە بونیادی فکری عەرەبی خۆیدا، لەسەر ئاستی فیقهو، لەسەر ئاستی فەلسەفی و لەسەر ئاستی "علمی کەلام".. هتد حاڵەتێك هەیە ئەویش دەرك نەکردنە بە ماهیەتی رۆژئاواو حەقیقەتی رۆژئاوا.

کیشەکە لێرەدا ئاڵۆزو پێکداچووە، چونکە رۆژئاوا لە میانەی دوژمنایەتییەکی سیاسییەوە هەڵدەسەنگێنرێت، ئەوەی جێگای گومان نییە هەر لێپرسینەوەیەکی سیاسیانەی رۆژئاوا، دەبێتە هۆی چەسپاندنی دابڕان، ئەمەش لەلای خۆیەوە رۆڵێکی ترسناك دەگێڕێت لە مانەوەی ئەم هەڵوێست و چەق بەستنەی هۆشیاری عەرەبی.

رۆشنبیری عەرەبی لە زۆر کاتدا دەرك بەوە ناکات کەوا رۆژئاوا، تەنها رۆژئاوای سیاسی نییە.

رۆژئاوا وەك وتەزایەکی هەمەکی "کمقولة کلیة" تەنها وشەیەکی سەرتاپاگیرە. هەروەها شکست هێنانی سیاسی مانای ئەوە نییە کە دوژمنایەتی کردنی "ئەویدی" گوزارشت لە نیشتمانپەروەری بکات.

بۆ نموونە لە زۆر کاتدا، هاوسۆزی خۆمان لەگەڵ رێکخراوێك یان حیزبێکی ئوسوڵی دەردەبڕین کە ئەندامەکانی هەڵدەستن بە ئەنجامدانی چالاکیەکی سەربازی لە شوێنە داگیرکراوەکاندا. ئەمە جگە لەوەی تێکۆشان لە دژی ئیسرائیل خۆی لە خۆیدا کارێکی گرنگە، بەڵام ئەو پرسیارەی کە دەبێ بیخەینە روو ئەوەیە: ئەو ئایدۆلۆجیایە چییە کەلە بنچینەدا لە پشتی ئەم چالاکیانەوە وەستاوە؟ ئەمە وات لێدەکات تۆ دوودڵ بیت، لە لایەکەوە تۆ سیاسییەن لەگەڵیدای، بەڵام لە لایەکی ترەوە تەحەفوزت لەسەر پێشینەی ئایدۆلۆژی ئەو کەسانە هەیە کە بەو چالاکیانە هەڵدەسن. گرفتەکەش سەبارەت بە هەڵوێست وەرگرتن لەسەر رۆژئاوا هەمان شتە.

**هەندێ هەن وای لێك دەدەنەوە کە عەرەب لە تراژیدیای نەمانی سەرسامیان بەرامبەر بە خۆرئاوا دەژین، بە تایبەتی لەو چرکەساتەی کە وەك نەیارێك و دوژمنێك بیر لە رۆژئاوا دەکەنەوە. ئەگەر وای دابنێین کە بیری نەتەوایەتی -عەلمانیمان لە رۆژئاواوە بۆ هاتووە، ئەوا ئێمە کاتێ وەك عەلمانیەکان و سەلەفیەکان لەگەڵ یەکتردا بەشەڕدێین، ئەوە رۆژئاوایە کە لە خۆماندا دەیکوژین، کاتێ کە دەمانەوێ رۆژئاوا بکوژین ئەوا لە خۆماندا دەیکوژین..*

-بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە ئەمە بەبێ پێزانینێکی هوشیارانە جێبەجێ دەکرێ. تەنانەت ئەوانەی کە خاوەنی تیۆرەیەکی چارەسەری ژیاریانەی بێلایەنن، دێن و تێڕوانینەکانی "پۆست مۆدێرنە" بەکاردەهێنن -کە ئەمە خۆی بەرهەمێکی رۆژئاواییە بۆ تاوتوێکردنی قەیرانی مۆدێرنە- بەکاری دەهێنن بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رۆژئاوادا. لێرەوە هەموو چەك و چۆڵ رۆژئاواییە. ئەگەرچی ئەم قسەیەش کەم تا زۆرێك هەڵەی تێدایە، چونکە

هیچ شتێك نییه ناوی "چەك و چۆڵی ڕۆژئاوا" بێت. بەڵام لەبەر ئەوەی وشەی ڕۆژئاوا لە بەرامبەر كۆمەڵگای ئیسلامی بەكاردەهێنین و، ئێمە لێرەدا بە ناچاری بەكاریدەهێنین، ئەمەش دەبێتە هۆی زیاتر ئاڵۆزبوونی هەڵویست و ئاڵۆزبوونی كێشەكە.

## گوتاری "پۆست كۆلۆنیالیزم"

***ئایا فكری عەرەبی ئەمڕۆ دەتوانێت گوتاری "پۆست كۆلۆنیالیزم" بەرهەم بهێنێت، بۆ نموونە لەسەر هەمان ئەو سیاقەی (ئیدوارد سەعید) لەسەری ڕۆیشتووە؟ یان جیهانی عەرەبی هێشتا لە قۆناغی كۆلۆنیالیزم نەهاتووەتە دەرێ؟***

–لە ئێستادا جیهانی عەرەبی لەژێر كاریگەری هەموو ئاراستە فكریەكانداییە، لە یەكەیەكی زەمەنی دیاریكراودا هەموو ئەو گوتارانەی كە لە قۆناغە مێژووییە جیاجیاكاندا بەرهەم هاتوون پێكەوە گرێ دەدا. ئەگەر تەماشای پانتایی ژیانی ڕۆشنبیری عەرەبی ئەمڕۆ بكەین، دەبینین پێشوازی و هەڵسوكەوت لەگەڵ هەموو ئەو گوتارە فكریە جیاوازانە دەكات كە لەسەدەی چواردەوە بەرهەمهاتوون تا دەگاتە سەر ئەوەی كە پێی دەوترێت قوتابخانەی پۆست مۆدێرنە. ڕەنگە ڕەخنەی ئەدەبی لەسەر تازەترین وێستگەكانی فكر بوەستێت، بەڵام گەر سەیری هەندێ لەو لێكۆڵینەوە فكریانە بكەین دەبینین بەشێوەیەكی عەمەلی گەڕاونەتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی كۆچی.

هەندێ تێزو تاقیكردنەوە لەسەر ئاستی شیعری تازە لە ئارادا هەیە، كە شان لە شانی تێزو تاقیكردنەوە زۆر پێش كەوتەوەكانی ڕۆژئاوا دەدات، ئەمە لە كاتێكدایە هۆشیاری شیعری لای هاوڵاتی عەرەبی تەنانەت نەگەیشتووەتە ئاستی ڕۆمانسییەت. ئیدی چۆن داوای لێدەكەیت لەگەڵ تازەگەری لەناكاو لەگەڵ ئەزموونگەریدا یەكانگیر بێت؟ كۆمەڵگای عەرەبی تۆپۆگرافیایەكی فكری جۆراوجۆر هەیە، بە شێوەیەك ئەوەی كە دەگەڕێتەوە بۆ پێش مێژوو لەگەڵ ئەوەی كە دەگەڕێتەوە بۆ پۆست مۆدێرنە كۆدەكاتەوە. گرفتەكەش ئەوە نییە تۆ لەگەڵ ئەمەیاندا بیت یان لەگەڵ ئەوی تریان، بەڵكو لەوەدایە كە پێویستە خاوەنی هۆشیاریەكی ڕەخنەیی بیت بۆ سەرجەم ئەم گوتارانە. ئەم هۆشیاریەش دەبێت لە پێویستییە هەنووكەییەكانی ئێستاوەو ڕووناك كردنەوەی دواڕۆژەوە سەرچاوە بگرێ. نیشتمانی عەرەبی لەناو چركەساتی مێژوویی خۆیدا دەژی، هەندێ گرفتی هەیە كە پەیوەستە بە كەلەپوورەوە، هەندێكی تریان پەیوەستە بە ڕۆژئاواوە، سێیەمیشیان پەیوەستە بە دەسەڵاتەوە، هەموو ئەمانەش لە دیدگایەكی ڕەخنەییەوە پێویستیان بە شیكردنەوە هەیە. لەم سیاقەدا، هەموو دەست كەوتە فكریەكان دەكرێ فاكتەری گرنگ بن بەو پێیەی هەموویان كەرەستەی بیركردنەوەن.

(ئیدوارد سەعید یان محەمەد عابد جابری و تەیب تیزینی، یاخود محەمەد جابر ئەلئەنساری)و ئەوانی تریش.. ئاساییە كە جۆرێك لە ناكۆكی لە نێوان تێڕوانینەكانیاندا هەبێت، چونكە هەموو كاتێ ڕێگایەك هەیە بۆ دۆزینەوەی ڕەگەزە لێك چووەكان و لێك دابڕاوەكان.

ئێمە پێویستیمان بە یەك تێڕوانین نییە. بەو پێودانگەی كە گوایە تاقە چارەسەری ئەفسوناو پێیە.

***ئایا گرفتەكەمان لەوەدایە كە ئێمە هەمیشە پێویستیمان بەراچێتەیەكی ئەفسوناوی بووە؟***

*یان ئێمە ناتوانین (دەستەوستنین) لە بەردەم ئەوەی کەوا گفتوگۆیەک لە نێوان "راچێتەکان" یان بیرورا و چارەسەرە جیاوازەکاندا ساز بکەین؟*

—هەست دەکەم زۆربەمان ماندووین و، حەز بە چارەسەرێکی خێراو سەخت دەکەین. بەلام ئەم جۆرە چارەسەرانە دەست ناکەون، چونکە هیچ جۆرە راچێتیەکی ئەفسوناوی لەگۆرێدا نییە. پێویستە لە سەرمان لە هەموو ئەو "راچێتانە"ی کە لە ئارادایە وردبینەوە، بۆ ئەوەی هەندێکیان دووربخەینەوە، هەندێکی تریان وازلێبێنین و، هەندێکیشیان جێگیر بکەین.. ئا لێرەدا پێویستە هۆشیاریەکی رەخنەیی هەبێت کە لە پلەیەکی یەکجار بەرزدا بێت، جا چ بۆ خوێندنەوەی کەلەپور بێت یان بۆ بەرەنگاربوونەوەی گیروگرفتە هاوچەرخەکان. لە نیشانەکانی نەخۆشی ئەوەیە کە تەنها بۆ یەک شێوە چارەسەر بگەڕێین، لە کاتێکدا ئێمە پێویستیمان بە شێوەیەکی ئاوێتەیی "الصيغة المركبة" هەیە، گرفتەکە لەوەدا نییە کە ئەم شێوەیە هەڵ بژێرین یان ئەویتریان، بەلکو گرفتەکە لە گەیشتندایە بەوەی بگەینە شێوەیەکی ئاوێتەیی کە کورتەی هەموو ئەگەرەکانی ناو گۆرەپانی دەوروبەرمانی تێدابێت.

**سەرچاوە:**

*گۆڤاری "الوسط" ژمارە 333 بەرواری 1998/6/15*



# مارکس.. بۆ؟

دواجار مارکس! ئەو فەیلەسوفەی بەرلەوەی کتێبێکی بخوێنینەوە، ناویمان لە ناوی ئەندامەکانی خێزانەکانمان زیاتر بەرگوێ دەکەوت. ئەو فەیلەسوفەی هێشتا لە چەند وتارێکی کەم و چەند قسەیەکی سەرپێی زیاتر نەبێت، کتێبێکی گرنگی لە کتێبخانەی کوردیدا نیە، ئەمەش لە کاتێکدا دەیان ساڵە خاوەن کۆمەڵێ بزوتنەوەین کە رەگوریشەیان دەبەنەوە سەر مارکس. دەیان ساڵە ناوی وێردی زمانی ئەمو ئەوەو کەچی کەسیش جگە لە کۆمەڵێ مێڵی گشتی کە تەنها بەکەڵکی رۆشنبیریە تەسك و تروسکەکەی ناو شانە حیزبیەکان دێت، هیچیدی لەبارەوە نازانن. ئەو تەنها وەك فەیلەسوفێك ناسرا کە دەڵێ دوو چین هەیەو سەرمایەداری شەیتانەو ژێرخان گرنگترە لە سەرخان و رەنگدانەوەی ئەوە. نەیارە دینیەکانی وەك وتەبێژی ئیلحادو کوفر و فەساد ناسیان، ناسیۆنالیزمەکان وەك فەیلەسوفی داگیرکردن کە لە ژێر ناوی جیاوازی چینایەتیدا، نەتەوە لە بەردەم هەڕەشەی دەرەوەدا کەرت دەکات. لایەنگرانی وەك پێغەمبەرێك کە ئەو شتەی لە سەدەی نۆزدەدا گوتی، بۆ هەمیشە کۆتایی بە وتوێژی فکری و فەلسەفی هێناو رێگەچارەی هەمیشەیی بۆ کۆی مرۆڤایەتی دەستنیشان کرد. هەموو شتێك وایکرد بۆ ئەوەی ئێمە مارکس نەناسین لە رێی نێوانکارێکەوە (وسیط) نەبێت. هەندێکجار ئەو نێوانکارە ئەندامگەلێکی دۆگمای و داخراوی ئەو بزوتنەوە بەناو چەپانە بوون کە تاکە زانستێکیان وتنەوەی سرودی ئەنتەرناسیۆنالیزم و چەند وانەیەکی ناو شانە حیزبیەکان بوو، هەندێکجاری دیش ئەو نەیارە نەخوێندەوارانە بوون کە هێشتا کتێبێکی مارکسیان بەرچاو نەکەوتبوو، بەڵام لە دەمی ئەم و ئەوەوە هەندێك شتیان بیستبوو کە وەك زانیاریەکی پڕ گەوهەر بە ئێمەیان دەگوتەوە. یەکێك لە گاڵتەجارپەکانی مێژووش ئەوەیە ئەو فەیلەسوفەی کە ریجس دوبرێ گوتەنی دژی نێوانکارەکان بوو[1]، چارەنوسی خۆی وابوو زۆرتر لە رێی نێوانکارێکەوە، نەك لە رێی خۆیەوە بناسرێ. ئەو فەیلەسوفەی کە دەیگوت لە نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگادا چەند نێوانکارێك هەیە کە دابەشیکردووەو دەبێ ئەو نێوانکارە لەناو بچێ، لەهەر فەیلەسوفێکی دی زیاتر لە رێی نێوانکارانەوە ناسرا نەك لە رێی خۆیەوە. ئەو هەرگیز وەك خۆی نەناسرا، جارێك ناوی ئەنگلزو جارێك ناوی لینین و جارێك ناوی ماوتیسۆنگی لەگەڵدا دەهات. هەموو وایاندەزانی مارکس دەناسین، غافل لەوەی ئەوە جارێك ئەنگلز و جارێك لینین و جارێك ماوتیسۆنگە کە لە زاری ئەوەوە قسە دەکەن. تازە کە ئاوڕ لەناوی ئەوانەش دەدەینەوە هێشتا کتێبخانەی کوردی لە نووسین و وتارەکانیان خاڵیە. کۆمنیستەکانی کوردستان دێرینترین هێزی سیاسین کە بۆ یەکەمجار نەریتی حیزبایەتیان بۆ واقعی ئێمە هێنا، کەچی بێدەنگترین و بێهودەترین هێز بوون بەرامبەر بە وەرگێڕانی کارەکانی مارکس. ئەمڕۆ کە ئاوڕ لە کتێبخانەی کوردی دەدەینەوە، دەبینین لەگەڵ ئەوەشدا کە لە مێژە ناوی ئەم فەیلەسوفە وێردی سەر زمانی ئەم و ئەوە، بەڵام لە نوسین و وتارو کتێبی ئەم فەیلەسوفە دەست کورت و هەژارە. بە راستی مارکسیەکانی کوردستان خەریکی چی بوون؟ بۆ پاش ئەم هەموو ساڵە کتێبێکی ئەم فەیلەسوفەمان



لەناو کتێبخانەکانی کوردستاندا نەبینی، بۆ کەس دەستنوسەکان و گروندریسەو سەرمایەو ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی نەکردە کوردی؟ بۆ هەموو مارکسییەکان بەمانیفێست و هەندێك زانیاری سەرپێی کە نەخوێندەوارەکانیش بە شێوەیەك لە شێوەکان بیستبوویان، وازیانهێنا و بێدەنگ بوون؟ نهێنی شاردنەوەی دەقەکانی مارکس و کتێبەکانی لە چیدایە؟ ئەم پرسیارە ئەو کاتە رووە تراژیدیەکەی پتر ئاشکرا دەبێت کە ئەو راستیە بزانین کە کەم کتێبخانەی دنیاو بەدیاریکراوی دەوروبەرمان هەیە کەم تا زۆر زۆریەی نوسینەکانی مارکسی نەکردبێتە زمانی خۆی ئەگەر هەمووی نەکردبێت و گفتوگۆی لەسەر نەکرابێت و بە هەردوو باری پۆزەتیف و نێگەتیفدا هەڵنەسەنگێنرابێت. ئایا وەرنەگێڕانی کارەکانی ئەم فەیلەسوفە لەلایەن خەڵکانێکەوە کە تا هەنوکەش زوربەیان لە شان و شەوکەتی خودادا دایدەنێن، رێکەوتێکی بێ هۆیە، یان سیاسەتێکی هوشیارانەیە کە بەرژەوەندی دەسەڵاتی کۆمەڵێ دۆگماو مرۆڤی داخراو پێویستی بە ناسینی راستەقینەی مارکس هەیە؟ ئایا رێکەوتە لە پاش دەیان ساڵ بوونی چەندان باڵی جیاوازی مارکسی، کتێبێکی ئەوتۆ لەم بیریارە ناودارە نەکراوەتە کوردی؟ یان خودی ئەم رێکەوتە بۆ بەرژەوەندی پاراستنی دەسەڵاتی کۆمەڵێ خوێندەواری دەرچووی پەروەردە تەسکبین و فەقیرەکەی ناو شانە حیزبیەکان هاتووە کە بەرژەوەندیان لەوەدایە شتێکی ئەوتۆی لە بارەوە نەزانین..

بۆ ئەوەی دواجار خۆیان دوا قسەکەر و لێزانی فەیلەسوفێك بن کە ئەفسونی ناوی لە کتێبەکانی گەورەترو ناودارترو بەربڵاوترە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە هەرچۆنێك بن، یەك شت بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە رۆشنبیری، و کتێبخانەی ئێمە هێشتا مارکسی باش نەناسیوە نەك هەر راستەوخۆ لە دەمی و دەقی خۆیەوە، بەڵکو تەنانەت لە رێی بیریارگەلێکی دیەوە کە لەسەریان نوسی و تێزو بۆچونەکانیان تاوتوێ کرد. هەموو ئەمانە وای لێکردین وەك لە ژمارەی پێشوودا بەڵێنمان دا پەروەندە (فایل)ی ئەمجارە بۆ فەیلەسوفێك تەرخان بکەین کە نەیارەکانی لە دۆستەکانی زیاتر دان بە گرنگی و زیندوییدا دەنێن. ئێمە پێمان وابوو لەگەڵ راگەیاندنی ئەوەدا کە گۆڤاری سەردەم دەیەوێت پەروەندەیەك لەسەر مارکس بکاتەوە لایەنی کەم لە لایەن ئەو بزوتنەوە بەناو چەپانەی خۆیان بە میراتگری مارکس دەزانن هێندە نوسین و وەرگێڕانمان بۆ بێت کە لە توانای پەڕەکانی گۆڤارەکەمان تێپەڕ بکات، وەلێ رۆژەکان رۆیشتن و جگە لە کۆمەڵێ رۆشنبیری سەربەخۆ کە زوربەشیان خۆیان بە مارکسی نازانن کەس لەو بەناو مارکسیانە بە دەنگ پەروەندەکەوە نەهاتن و وەك نەریتی هەمیشەییان لە بەردەم وەرگێڕانی وتار یان نوسینێکدا لەسەری، قرووقەپیان لێکرد. ئایا ئیدی لە بەردەم ئـ ، دراوە واقعیەدا مافی خۆمان نیە گومان بکەین کە ئەو بزوتنەوە بەناو مارکسیانە هێندەی بزوتنەوە راستەکان لە ناسینی مارکس دەترسن؟ ئایا مافی خۆمان نیە گومان بکەین ئەوان لە هێنانە سەرپەڕەی وتوێژ لە بارەی مارکسەوە، لەوە دەترسن نەخوێندەواری و بێئاگایی خۆیان ئاشکرا بێت؟ لەوە دەترسن چیدی ئەو مارکسەی ئەوان لەناو کۆمەڵێ تێزی دۆگمایدا زیندانیان کردووە، وەك خۆی نەمێنێتەوەو بگۆڕێت؟ چونکە گومانی تیا نیە ئەوکاتەی مارکس هاتە ناو نوسین و لێکۆڵینەوەوە چیدی وەك خۆی نامێنێتەوەو رەهەندی جیاواز لە رێی خوێندنەوەی جیاوازەوە وەردەگرێت؟ ئێمە نازانین! بەڵام هیواداریـن ئەم پەروەندەیە بە بچوکی خۆیەوە سەرنجی هەموومان بۆ ئەو راستیە تاڵە راکێشێتەوە کە ئێمە لەگەڵ ئەوەشدا کە لەناو سەدەی بیست و یەکداین بەڵام هێشتا مارکسمان نەناسیوەو پێویستمان بە وەرگێڕان و زانیاری زیاتر هەیە لەسەری.

رەنگە بگوترێت بەڵام ئەمڕۆ رۆژی مارکس نیە.. رۆژی ئەو فەیلەسوفە نیە کە بە درێژایی سەدەیەك لەمەوپێش هەموو دنیای بەخۆیەوە خەریك کردبوو تا ئێستاش هەر کاریگەرەو جێگای چەندو چوون لەسەرکردن و تێڕامانە. هەندێك تەنانەت باس لە مردنی دەکەن، هەندێك دەڵێن چیرۆکی گەورەترین و



ترسناکترین تۆتالیتارەکانی مێژوی هاوچەرخ لە تێزەکانی ئەو هاتنە دەرێ، هەندێک دەڵێن نەخۆشیەکی گشتگیر بوو کە توشی خەڵکێکی زۆر بوو.. دیکتاتۆرێکی ئەم ناوچەیەو ئەوکاتەی لە لوتکەی دەسەڵاتی خۆیدا بوو گوتبووی ئەوەی لە لاویدا مارکسی نەبێت واتە دڵی نیە، بەڵام ئەوەی گەورە بێت و بە مارکسی بمێنێتەوە واتە عەقڵی نیە. واتە لە دیدی ئەم دیکتاتۆرە بچوکەوە کە چەند ساڵێک دوای ئەوە بە چەپڵە رێزان لە وڵاتی خۆی دەرکرا، مارکس فەیلەسوفی هەرزەکاران و عاشقان و خەیاڵبازی سەردەمی لاوەکان بوو، نەک فەیلەسوفی مرۆڤە عاقڵ و گەورەکان. ئەمڕۆ رۆژی مارکس نیە، رۆژی ئەو فەیلەسوفە نیە کە تا چەند دەیەیەک پێش ئێستا گرتنی کتێبێکی لەناو کتێبخانەی ماڵەکەتدا بەس بوو بۆ ئەوەی لە زۆربەی وڵاتانی ئەم ناوچەیەدا رەوانەی زیندان و بگرە پەتی سێدارەت بکات (هەر ئەو دیکتاتۆرە بچوکەی بە فەیلەسوفی هەرزەکارانی دەزانی، خەڵکانێکی زۆری لەسەر کتێب یان وتار یان تەنانەت وێنەیەکی رەوانەی زیندانی ترسناکی نێڤین کرد). رەنگە لە مێژوی دورو نزیکدا هیچ فەیلەسوفێک نەدۆزینەوە هێندەی ئەو ناوبانگی دەرکردبێ و ناوی بە گوێی نەخوێندەوارەکان بەر لە خوێندەوارەکان ئاشنا بێت، ناوی ئەو لە هەموو فەیلەسوفێکی دی زیاتر دلەرزی بوو بۆ ناو زمانی زوربەی گروپەکانی کۆمەڵگای بەشەری. کتێبەکانی بە دزیەوە دەهاتن و دەچون، ناوی بە دزیەوە و لە ناو کۆبوونەوە تایبەتیەکانی هاورێیاندا دەهات، ئەوەی کتێبێکی نەخوێندبێوە لەوەی هەموو کتێبەکانی خوێندبێوە زیاتر لافی ناسینی مارکسی لێدەدا، تەنانەت دوژمن و نەیارەکانیشی هەمیشە بەدوایەوە بوون: دینیەکان هەرگیز ئەو قسەیەی مارکسیان نەبەخشی کە لە چەند رستەیەکی پێشەکی "هەنگاوێک بەرەو رەخنە لە فەلسەفەی هەقی هیگڵ"دا نوسیبووی: "دین ئەفیونی گەلانە"[2].. لیبراڵەکان دژایەتی ئەویان بۆ بازاڕی ئازاد هەرگیز نەبەخشی کە لای مارکس بریتی بوو لە بازاڕی چەوساندنەوەی گروپێک بەدەستی گروپێکی دیەوە، ناسیۆنالیزمەکان هەرگیز فەرامۆشکردنی مەسەلەی ناسیۆنالیزمیان لە لایەن ئەوەوە نەبەخشی کە دەیگوت پرۆلیتاریا وڵاتی نیە. بەڵام سەیر ئەوەیە هەموو قسەی نەیارەکانی مارکس لە بری ئەوەی لە لایەن مارکسیەکانەوە وەڵام بدرێتەوە، بە راستی بوو بە شوناسی زۆرێک لە مارکسیەکان. بە راستی زۆرێک لە مارکسیەکان نەک لە مارکسەوە، بەڵکو لە نەیارەکانی مارکسەوە قبوڵیان کرد کە دین ئەفیونی گەلانەو بگرە بەرگریشیان لێکرد بێئەوەی حساب بۆ ئەو سیاقی شیکردنەوانە بکەن کە مارکس ئەو لێکۆڵینەوەیەی تیا پێشکەش کردووە (نوسەرێک بەناوی میشل لووی دەڵێ لە بنەڕەتدا ئەم نووسینە بەر لە مارکسیەتەو ئەو کاتە نووسراوە کە مارکس فویرباخی بووە)[3]، بڕوایانکرد کە لای مارکس هەموو بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیزمی چ لە رۆژهەڵات بێت، چ لە رۆژئاوا، دژی بزوتنەوەی چینایەتیە، بە راستی بڕوایانکرد بەوەی مارکس دژایەتی بازاڕی ئازاد لەبەر خۆی دەکات و بەدوای بازاڕێکی دیسپلیندا دەگەڕێ، نەک مارکس بیر لە دۆخێکی ئازاد بۆ هەمووان دەکاتەوە کە کەس تیایدا نەچەوسێتەوە. ئەو ئەزمونەشی کە بە ناوی جێبەجێکردنی بەرنامەکەی ئەوەوە لە زیاد لە دەوڵەت و جێگەیەکدا سەریهەڵدا، ریجێس دوبرێ گوتەنی هەموو ئەو شتانەی ئەنجامدا کە تیۆرەکە قەدەغەی کردبوو[4].

درێژیشە چیرۆکی تاوانی جێبەجێکەرانی خەونی مارکس، هێندەی درێژی چیرۆکی ئەو کەسانەی دژایەتیان کرد. کەوابوو ئایا کە دەڵێین ئەمڕۆ رۆژی مارکس نیە بە مانای ئەوەیە رۆژێک هەبووە لە دوامانەوە کە رۆژی ئەو بێت؟ ئایا بە راستی رۆژێک هەبووە رۆژی مارکس بوبێت و دوای لە دەست چوبێت؟ ئایا هیچ رۆژێک، رۆژی مارکس بووە؟ تا ئەو دەمەی گوێ بۆ ئەو لایەنگرە دۆگماییانە شل ناکەین کە تەنها لە رۆشنبیریە کلۆڵ و فەقیرەکەی شانە حزبیەکانەوە مارکسیان ناسیوەو گوێ بۆ ئەو نەیارە نەخوێندەوارانە ناگرین کە رستەیەکی مارکسیان نەخوێندۆتەوە، ئەوا دەتوانین بڵێین لە راستیدا هیچکات رۆژی مارکس نەبووەو هێشتا رۆژی ئەو



نەهاتووە. فەیلەسوفێکی هاوچەرخ کە تا ماوەیەکی زۆریش بە قوتابی هایدگەرو دوژمنی مارکسیەت دەناسرا دەڵێ سەدەی بیست و یەك سەدەی مارکس دەبێت. واتە مارکس لە پێشمانەوەیە، نەك لە دوامانەوە. لە ئاسۆی ئایندەدایە نەك لە رۆژژمێری روداوەکانی رابردودا، لە گەڵماندا دەژی، نەك یادەوەریەکی رابردوو بێت. بێگومان ئەم لەگەڵ بونەش نەك وەك فەیلەسوفێکی خودا ئاسا کە بۆ یەکجار و هەمیشە لە سەدەی نۆزدەدا راستیەکی موتڵەقی لە بارەی هەموو شتەکانەوە گوت و هەر ئەوەندەی بۆ هێشتینەوە کە بە حەرفی قسەو تێزو بیرۆکەکانی جێبەجێ بکەین، نەك وەك کەسێك کە لە هەموو شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەو پێشبینیەکانیدا راستی پێکا، نەك وەك پێغەمبەرێکی خودا کە لە هەڵەو کەموکوڕی مەعسوم بوو، بەڵکو وەك وەسوەسەو خەونێك کە بۆ هەمیشە خەون و ئاواتەکانی دەبێت رێنوێنی ژیان و رەفتارو ئایندەمان بکات.. خەون بە جیهانێکی دوور لە چەوساندنەوەو هاودەنگ لەگەڵ ستەملێکراواندا و خاڵی لە نامۆبوون. خەون بە ئازادی هەموو بەنی بەشەرێکەوە کە چ لە ئەمەریکا یان ئەفەریقا یان لە کوردستاندا بژین، شایستەی ئەوەن ئازادو بەختەوەرو خۆشبەخت ژیان بەرنە سەر. دەبێ مارکس بناسین، نەك لەبەر ئەوەی توتیوار تێزو شیکردنەوەکانی بڵێینەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی شەرەفی ئەو خەونە بپارێزین کە رۆژێکی سەدەی نۆزدە مرۆڤێکی بە راستی ئازادیخواز، بە ئەمانی چەوساندنەوەو بەختەوەری و ئازادی مرۆڤەوە بینی. ئەم پەروەندەیە هەوڵێکی بچوکە بۆ ناسین و نزیکبوونەوە لە جیهانی فەیلەسوفێك کە نەیارێکی سەرسەختی کە بە دوژمنی کۆمەڵگای کراوەی دەزانی و لە کتێبێکی قەبارە گەورەدا بەناوی "کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی"دا رەخنەی زۆربەی تێزەکانی کردبوو، لە بارەیەوە دەیگوت هەرگیز کۆمەڵناسی ناتوانێ بگەڕێتەوە بۆ دوای ئەو[5]. فەیلەسوفێك کە هەرگیز تازە ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ دوای ئەو بەڵام هەرگیزیش ناتوانین بۆ هەمیشە لە حەرفو رستە بەڕستەیدا چەقبگرین و رابوەستین.

**پەراوێزەکان:**

*1)ریجیس دوبریە: نقد العقل السیاسی. ت: د. عفیف دمشقیە. منشورات دار الاداب- بیروت. الطبعة الاولی 1986 ص 342-343.*

*2)کارل مارکس: گامی در نقد "فلسفه حق" هگل. ت: فریدون فاطمی. لە کتێبی: هگلیهای جوان. گزیده اثار. لارنس ستیپلویچ. نشر مرکز. چاپ اول 1373. ص 320.*

*3)میشل لوی: مقالاتی درباره فلسفه سیاسی از کارل مرکس تا ڤالتر بنیامین/ درباره تغیر جهان. ت: حسن مرتضوی. انتشارات روشنگران و مطالعات زنان. چاپ اول 1376. ص 51.*

*4)ریجیس دوبریە: نقد العقل السیاسی.. ص 43.*

*5)بگەڕێوە بۆ: کارل پوپەر: جامعه باز و دشمنان ان. ت: عزت الله فولادوند. انتشارات خوارزمی. چاپ دوم: شهریور ماه 1377/ تهران. ص 858.*



# مێژووی ژیان و بەرهەمی کارل مارکس

• ئا.وەرگێڕانی: ڕەووف بێگەرد

• کارل هینریش مارکس لە پێنجی ئایاری ساڵی *1818* لە شاری "تریر"ی ناوچەی "موسلە" لە پروسیا لە دایك بووە. ژمارەی دانیشتوانی "تریر" نزیکەی دوانزە هەزار کەسێ بوەو لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا دروست کراوە، بە درێژایی چەندان سەدە بارەگای سەرۆکی گەورە قەشەکان بوە و هەر ئەویش سەرۆکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی هەڵبژاردوە، باوکی مارکس (هینریش مارکس) پارێزەر بوەو لە جوولەکەییەوە بوەتە پروتستانتی، دایکیشی هەروا بووە. ژیانی خێزانی مارکس خۆش و بە شێوازێکی لیبرالی پەروەردە بوە. دایکی مارکس (هنریتا) لە نێوان ساڵانی *1815– 1826*دا چوار کوڕو پێنج کچی بوە کە مارکس سێیەم منداڵیانە. دایك و باوکی مارکسیان زۆر خۆش ویستوە. باوکی ویستویەتی مارکس لە ئایندەدا ببێتە یاساناس و بەرگری لە عەقڵ و مرۆڤایەتی بکات .

• ساڵی *1830* کارل خراوەتە دواناوەندی "فردریك فلهیلم" کە بە قۆناغێکی تازە دادەنرێت لە ژیانیدا، هەر لەو ساڵەدا شۆڕشی تەموز لە فەرەنسادا ڕوویدا. هاوڕێکانی ئەم قوتابخانەیەی، منداڵانی خێزانە بورجوازی و کارمەندەکان بوون. هەندێکیش لە منداڵانی جوتیارو پیشەکاریان تیابوو کە دەیانویست ببن بە قەشە. هاوڕێکانی هەندێك جار مارکسیان خۆش دەویست چونکە گیانێکی گەنجانەی قۆشمەی هەبوو، جاری تریش لێی دەترسان چونکە شیعری داشۆرینی پیا دەوتن.

• لە ئەیلولی ساڵی *1835*دا دواناوەندی تەواوکردو لیژنەی تاقیکردنەوە بەم شێوەیە توانای بەهرەمەندیەکەی هەڵسەنگاند: (مارکس بەهرەمەند، توانای زۆری لە زمانەکانی کۆن و ئەڵمانی و مێژودا هەیە، هەروەها لە ماتماتیکیشدا شایانی شانازیە).

• لە تشرینی یەکەمی ساڵی *1835*دا چوە (بۆن) تا لەسەر ئارەزووی باوکی یاسا بخوێنێت. بۆن لە (تریر) گەورەترو سیمای زانکۆو ژمارەی خوێندکارانی نزیکەی حەوت سەد کەس بوون. بۆیە بۆن مەڵبەندێکی روناکبیری بوو لە ناوچەی راینی بروسیادا.



• سالّی **1836** کە مارکس لە تەمەنی هەژدە سالّیدا بوو هەر لە (تریر) حەزی لە "جینی" کرد کە لە خێزانێکی ئۆرۆستوکراتی بوو، جینی زۆر جوان و داواکاری گەلێك زۆر بوون، دەبوو حەوت سالّیش چاوەڕوانیان بکردایە تا دەبوونە هاوسەری یەکدی.

هەر لە هەمان سالّدا مارکس بۆ کارو تەواوکردنی خوێندن چوو بۆ (بەرلین) لەو کاتەدا بەرلین لە بۆن گەورەترو ژمارەی دانیشوانی لە سێ سەد هەزار کەس زیاتر بوو.

کە مارکسی لاو گەیشتە بەرلین دەمێك بوو "کانت" و "فیختە" مردبوون و "هیگڵ"یش نەمابوو، بەلام بیروباوەڕەکانیان، بە تایبەتی "هیگلّیەت" دەستی بەسەر عەقلّی ڕووناکبیرانی ئەلّمانیدا گرتبوو، مەلبەندی ململانێ فیکریەکانیش زانکۆی بەرلین بوو. چونکە "هیگڵ" لە سالّی **1818**ەوە تا **1831** دەرسی تیا وتبۆوەو گەلێك لە قوتابیەکانی ببوونەوە بە مامۆستای ئەوێ.

• لە **22**ی تشرینی یەکی سالّی **1836**دا کارل مارکس لە کۆلیژی حقوق قبوڵ کراو، لە سێ رشتەدا ناونووسی خۆی کرد کە یاسای جینایەت و مێژووی یاسای رۆمانی و ئەنترۆپولوجیا بوو. هەروەها سەروساختی لەگەڵ فەلسەفەدا پەیدا کردو پاشان لەم بارەیەوە دەنووسێت: "دەبوو قانوون بخوێنم، بەلام هەستم کرد ئەنگێزەیەکی لەو زیاتر هانم دەدا بۆ زۆران بازی کردن لەگەڵ فەلسەفەدا" لەگەڵ ئەمانەشدا مارکس دلّەڕاوکێیەکی زۆر تاوی بۆ هێنابوو کە دووری بوو لە "موسلە" و لە "جینی" دەزگیران و خۆشەویستی. بۆیە لەو ماوەیەدا هەندێك شیعری پڕ لە سۆزی نووسی کە زۆربەیان تاسەی دیداری "جینی" بوون.

لەم قۆناغەدا کاریگەری "کانت" و "فیختە" و بیروباوەڕی رۆشنگەری فەرەنسی لەسەر بوو. بەتایبەتی بیری "ڤولتێر" و "رۆسۆ". ئەگەرچی مارکس لە سەرەتادا فەلسەفەی هیگلّی بە دڵ نەبوو، بەلام لە تەمەنی نۆزدە سالّیدا بوو بە شاگردی بیری هیگڵ و گەوهەری فەلسەفەکەی نۆزیەوە کە شێوازی دیالەکتیکە، خۆیشی ئەم گەیشتنەی بە فەلسەفەی هیگلّە بە خالّی وەرچەرخان دەزانێت لە ژیانیدا. لە بەرلین لەگەڵ هیگلّیە لاوەکاندا کە بیری تازەیان دەربارەی رەخنەگرتن لە مەسیحیەت هەبوو، بوو بە هاوڕێ.

• سالّی **1838** "هینریش مارکس"ی باوکی لە تەمەنی شەست و یەك سالّیدا مرد، ئەمە کارێکی زۆری کردە سەر مارکس بە تایبەت لە رووی مادیەوە، چونکە دایکی نەی دەتوانی ئەرکی حەوت منداڵی تر هەلّبگرێت و مارکسیش خووی دابووە فەلسەفە کە چ دەستکەوتێکی نەبوو. بێجگە لەوەی کە مارکس پەیوەندی زۆر توندی لەگەڵ باوکیدا هەبوو کە بەردەوام لە خەم و گرفتەکانی خۆی ئاگاداری دەکردو هەوالّی تایبەتی و دەنگ و باسی زانکۆو بیروباوەڕی خۆی بۆ دەنووسی. تا کۆتایی تەمەنی وێنەیەکی فۆتۆگرافی باوکی هەر لا بوو.

• سالّی **1839** مارکس دەستی بە تێزی دکتۆراکەی کرد بەناوی "جیاوازیەکانی نێوان فەلسەفەی سروشتیی دیموکریتی و ئەبیقور" کە بە وردی باس لە راوبۆچونی هەردوو فەیلەسوفی یۆنانی "دیموکرتیس" و "ئەبیقور" دەکات کە هەردووکیا نوێنەرایەتی چەمکی مادیان بۆ جیهان کردبوو ب تایبەتیش بەرگری لە گومڕایی (الحاد)ی ئەبیقور کردبوو کە رۆشنگەرو بیرمەندێکی گەورەی سەدەکانی کۆن و یەکێك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی بڕوا بوون بە خواکان. م کم بەم هەلّوێستەی، کە دان نان بوو بە گومڕاییدا، ناڕاستەوخۆ شەڕی لەگەڵ دەولّەتی بروسی "مەسیحیەت" و سیستمی دەرەبەگایەتیدا ئاشکرا کرد.



لە ساڵی 1841دا مارکس تێزی دکتۆراکەی تەواو کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا ئایدیولۆژیستە کۆنەپەرستەکان دەسەڵاتیان لەدەست گرتبوو مارکس بۆ خۆی بە سووکی زانی کە تێزەکەی بداتە زانکۆی بەرلین و دای بە زانکۆی "یینا" مامۆستای سەرپەرشتیکاری دکتۆراکەی گەلێک کارەکەی بە گەورە گرت و وتی: "ئەم کارە ئەوەندەی عەقڵ و هۆشیاری دەردەخات ئەوەندەیش لایەنی زانستی پێوە دیارە".

لە پایزەی نیسانی ساڵی 1841دا مارکس بێ دووبارە کردنەوەی تاقی کردنەوەکەی پلەی دکتۆرای وەرگرت.

یەکێك لە هیگڵیە لاوەکان کە هاوڕێی مارکس بوو لە ساڵی 1841دا نامەیەك بۆ هاوڕێیەکی خۆی دەنووسی تیایدا دەڵێت: "دەبێت خۆت ئامادە بکەی بۆ ناسینی گەورەترین فەیلەسوفی راستەقینە، رەنگە تاقە فەیلەسوفێکی راستی بێت کە ئێستا لە ژیاندایەو زۆر نابات، لەهەر کوێیەك بێت (بەهۆی چاپەمەنیەوە بێت یان لە رێگای موحازەرەوە) سەرنجی هەموو ئەڵمانیا رادەکێشێت. دکتۆر مارکس– ئەمە ناوی ئەو کەسەیە کە دەیپەرستم– هێشتا منداڵە (تەمەنی لە دەوری بیست و چوار ساڵیدایە) دوا زەبری خۆی لە دین و سیاسەتی سەدەکانی ناوەڕاست دەوەشێنێت، گەلێك زیرەکەو بە قووڵی چۆتە ناو فەلسەفەوە، وای وێنا بکە کە رۆسۆو ڤۆلتێرو هولباخ و لیسینگ و هاینەو هیگڵت لە کەسێکدا کۆکردبێتەوەو دکتۆر مارکسی لێ پێك هاتبێت"

هەر لەم ساڵەدا مارکس گەڕایەوە زێدی باوانی "ترێر" و لای "جینی ڤون ڤیستفالن"، کە چەند ساڵێك بوو لە یەکدی دوور بوون و دەبوو ئیدی بە یەکجاری یەك بگرنەوە.

• لە سەرەتای ساڵی 1842 دا شای پروسیا سانسۆری لەسەر چاپەمەنیەکان دانا، مارکس وتارێکی بەناوی "چەند سەرنجێك دەربارەی نوێترین سیستمی پروسی سانسۆری چاپەمەنیەوە" نووسی و زۆر دەستی لەسەر یاسای تازەی چاپەمەنی داگرت و گاڵتەی پێ کرد، فەرمانی شایشی وا دایە قەڵەم کە بڕیارێکی ترسنۆکانەو گەلۆرانەو نەزانانەو دووڕوییە، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت سانسۆری دواکەوتوو بە تەواوی نەمێنێت نەك بگۆڕێت یان سووکتر بکرێت. لە نووسینەکەیدا دەڵێت: "تەنیا چاری راستەقینەی سانسۆر نەهێشتنیەتی".

بەم وتارە مارکس راستەوخۆ کەوتە نێو خەباتی سیاسییەوە، چونکە ئەمە یەکەمجاری بوو هەڵوێستێکی ئاشکرا لە دژی دواکەوتویی وەربگرێت و وەك دیموکراتیەکی شۆڕشگێڕ دەربکەوێت کە مەبەستی گۆڕینی دەوروبەرە کۆنە خوازەکەی بێت.

ئەوەی لەو ساڵانەدا کاریگەریەکی زۆری بەسەر بەرەو پێشەوەچوونی مارکس و بایەخی زیاتری بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی و ئەوەوە بوو، ناسینی بەرهەم و بیروڕا فەلسەفیەکانی فەیلەسوفی ئەڵمانی "لودفیگ فویرباخ" بوو. بە تایبەتی کتێبی "جەوهەری مەسیحیەت"ەکەی. فویرباخ لەو کتێبەیدا بە ئاشکرا بانگەشەی ئەوە دەکات کە نە دنیاو نە مرۆڤ پێویستیان نە بەخوا هەیە نە بە "بیری رەها" و مرۆڤ دەستکەوتی سروشتەو بەرهەمی گۆڕانەکانیەتی، هیچ شتێکیش لە دەرەوەی سروشت و مرۆڤدا نیە، دین بەرهەمی مرۆڤە و خوایش مرۆڤی دروست نەکردوە.

• نیسانی 1842 مارکس لە رۆژنامەی (Rheinsche Zeitung)دا دەست بەکاربوو.

لە 15ی تشرینی یەکەمدا مارکس بوو بە سەرنووسەری رۆژنامەکە لە شاری کولن.

• لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی 1843دا مارکس و جینی هاوسەری گەیشتنە پاریس. کۆچی مارکس و بەجێهێشتنی ئەڵمانیای لە ئەنجامی ئەو



بەریەست و گوشارەوە بوو کە رژێمی ئەڵمانی لەو کاتەدا بەرانبەر بە ئازادی رۆژنامەنووسی و چینە هەژارەکانی کۆمەڵەوە لە بەری گرتبوو. بە تایبەتی دوای داخستنی رۆژنامەی "ییشە زایتونگ" کە خودی مارکس سەرنووسەری بوو.

فەرەنسا بۆ مارکس دنیایەکی تازە بوو، بە تایبەتی کە سەرمایەداری دەستی بەسەر کەناڵە بەرهەمهێنەکانی ئابوریدا گرتبوو، دەرەبەگایەتی لە باری ئابوورییەوە تەواو لە پاشەکشێ و لەناوچووندا بوو، چونکە شۆڕشی بورجوازی ساڵانی 1789-1794 تەرازووی هێزی بە تەواوی گۆڕیبوو، رژێمی دەرەبەگایەتی شکستی سیاسیی خواردبوو، ئەمەش نەك تەنیا لە فەرەنسادا بەڵکو لە سەرانسەری ئەوروپایشدا، شۆڕشی تەموزی ساڵی 1830یش بە تەواوی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپادا هەرەس پێ هێنا.

ئەو دنیا سەرمایەداریە نوێیە، بە هەموو پێشکەوتویی و دژواریەوە بوە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ دەوڵەمەند کردنی بیرو بۆچوونەکانیمارکس، بۆ ئەو باس و خواسانەی کە بە شێوازی دیالەکتیکی هیگڵی کەوتە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیان.

• ساڵی 1844 ژمارەی یەکەمی ساڵنامەی ئەڵمانی- فەرەنسی دەرکرد کە دوو وتاری مارکسی تیا بوو: "دەربارەی مەسەلەی جولەکە" و "سەرەتایەك بۆ رەخنەی فەلسەفەی یاسای هیگڵی".

هەر لەو سەروبەندەدا و لە رێی بڵاوکردنەوەی چەند وتارێکەوە پشتی لە میسالیەتی هیگڵ کردو هەڵوێستی مادیانەی خۆی راگەیاند. بەڵام عەقڵە رەخنەگریەکەی تەنیا بەوەندە قایل نەبوو کە مادیەتی "فویرباخ"یش بە رەهایی وەربگرێت ئەگەرچی زۆر سەرسام بوو بەم فەیلەسوفە گەورەیە. وەلێ ئەو راستیەی دەزانی کە فویرباخ پراکتیزەی مادیەتی کردوە "زیاد لە پێویست بەسەر سروشتدا کەمتر بەسەر سیاسەتدا" واتە بەسەر کۆمەڵگادا. ئەم لای وابوو کە باری ژیانی مادی و ململانێی چینە جیاوازەکان فاکتەری سەرەکی بەرەو پێش بردنی مێژوون.

هەر لە مانگی ئاياری ئەو ساڵەدا، مارکس بوو بە باوك و "جینی" خێزانی کچێکی بوو لەسەر داوای مارکس و هەر بە ناوی جینی هاوسەریەوە ناویان لێ نا "جینی".

هەر لە پاریس بوو بە هاورێی شاعیری گەورەی ئەڵمانی "هاینریش هاینە". هاینە لە ساڵی 1831ەوە لە ئەنجامی گوشارو بەرهەڵست کردنی لەلایەن چاودێرەکانی چاپەمەنی و پۆلیسی ئەڵمانیەوە لەوێ هەڵاتبوو. هاینە بەردەوام دیدەنی کارل و جینی دەکردو شیعرەکانی خۆی بۆ دەخوێندنەوە.

• لە مانگی ئابی ساڵی 1844 دا "فردریك ئنگلز" لە لەندەنەوە هاتە پاریس، پێش ئەوە لە رێی هەندێك لە نووسینەکانیەوە مارکس دەیناسی، ئەوکاتە بوو کە مارکس دەستی کردبو بە نووسینی "خێزانی پیرۆز" کە پاشان بوە کاری هاوبەشیان و ئنگلزیش بەشداری لە نووسینیدا کرد، ئەمە یەکەم کتێبیان بوو پێکەوە بینووسن، کتێبەکە دژی هیگڵیە لاوەکان بوو. ئیتر هەر لەوساوە بوونە هاورێی هەموو دەمی یەکدی و تا مردن لە یەکدی جیا نەبوونەوە. ئنگلز ساڵی 1820 لە بارمن لە دایك ببوو کوڕی سەرمایەدارێکی ئینگلیزی بوو.

• مارکس لە مانگی ئابدا لە رۆژنامەی "پێشکەوتن"دا دەستی بەکار کرد کە لە پاریس دەردەچوو.

• لە مانگی شوباتی ساڵی 1845دا حکومەتی پروسیای کۆنەپەرست و دەست و پێوەندەکەی لە فەرەنسادا مارکسیان بەرەو بروکسل لە پاریس دەرکرد. دوای ماوەیەکی کەم ژنەکەی و کچە تەمەن نۆ مانگەکەیشی گەیشتن. باری ئابووریان زۆر خراپ و



پۆلیسی بروکسلیش رێگایان لە مارکس گرت لە بڵاو کردنەوەی هەر شتێکی سیاسیدا. بەم جۆرە مارکس بە بێ کاری مایەوە. تا ئەنگلزی هاوڕێی فریای کەوت و لەنێو هاوڕێ و دۆستە سیاسیەکانیاندا پیتاکی بۆ کردو قازانجی کتێبەکەیشی "باری چینی کرێکار لە ئینگلتەرادا"ی دایەو لە نەبوونی و هەژاری رزگاری کرد. بەڵام لەوێش حکومەتی پروسی وازی لێ نەهێنا، گوشاری خستە سەر بەلیجکا بۆ ئەوەی مارکس دەربکات، بۆیە بە ناچاری وازی لە رەگەزنامەی پروسی خۆی هێنا کە بێجگە لە دەربەدەری وڵاتان چ سودێکی بۆی نەبوو.

• *26* ئەیلول لە دایك بوونی لاورای کچی مارکس.

• ساڵی *1846* مارکس و ئەنگلز لە نووسینی کتێبی "ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی" بوونەوە کە لە دیدی فەلسەفیەوە بە بنەمای جەوهەری شیوعیەتی زانستی دادەنرێت.

هەر لەم ساڵەدا مارکس و ئەنگلز بە هاوکاری کۆمەڵێك لە هاوڕێکانیان لە بروکسل لیژنەی پەیوەندی شیوعیان دامەزراند، ئامانجی مارکس ئەوە بوو کە: "پەیوەندی لە نێوان سۆشیالیستەکانی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزیدا دروست بکات".

• کۆتایی مانگی نیسان مارکس و ئەنگلز ڤلهیلم ڤولفیان ناسی.

• ساڵی *1847* حیزبی کارگەری شۆڕشگێڕی دامەزراندو لە مانگی حوزەیراندا لە لەندەن یەکەم کۆنگرەی بەست. ئەگەرچی مارکس لەبەر نەبوونی و دەست کورتی نەیتوانی بچێت بۆ لەندەن بۆ بەشداری کردنی کۆنگرەکە، بەڵام ئەنگلز وەك نوێنەری رێکخراوی پاریس و ڤلهیلم ڤولف وەك نوێنەری لقی بروکسل بەشداریان تێدا کرد.

• لە دوا مانگەکانی ساڵی *1847*دا دووەم کۆنگرەی حیزب لە لەندەن بەسترایەوەو، مارکس وەك نوێنەری ئەڵقەی برۆکسل بەشداری تیا کرد، لەم کۆنگرەیەدا مارکس و ئەنگلز بەرنامەی حیزبیان خستە بەردەم کۆنگرە کە بنەماکانی کۆمۆنیستی زانستی بوو. هەروەها بڕیار لەسەر دەستوور درا. بەم جۆرە یەکەمین حیزبی شۆڕشگێڕی چینی کرێکار لە دایك بوو. پاشان مارکس گەڕایەوە بروکسل و ئەنگلز بۆ پاریس. هەر لەم ساڵەدا مارکس کوڕێکی بوو ناوی لێنا "ئیدگار".

• لە مانگی شوباتی ساڵی *1848*دا یەکەمین بەیانی حیزبی شیوعی -مانیفێست- لە نامیلکەیەکی بیست و سێ لاپەڕەییدا دەرچوو کە لە رووی مێژووییەوە تا ئێستایش بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە، چونکە لەم نامیلکەیەدا مارکس و ئەنگلز بە زمانێکی پاك و رەوان هەموو ئەزموون و زانستی خۆیان بە پوختی داڕشت و تیۆرەی مادی دیالەکتیکی و مێژوویی ئابوریان خستە روو. ئەم نامیلکەیە پیاچوونەوەیەکی زانستیانەیە بۆ هەموو ئەو کێشەو ململانێیانەی کە لە ئەنجامی خەباتی چینی کرێکاردا بەدەردەکەون و لە پراکتیزە کردنی سوشیالیستی زانستیدا خۆیان دەنوێنن. هەروەها ئەرکی مێژوویی چینی کرێکارو ئەو ئامانج و رێبازانەی کە بۆ بەدیهێنانی دنیایەکی خۆشتر بۆ چینە چەوساوەکان لەبەر دەگیرێن و، دەست نیشان کردنی ئەو قۆناغانەی کە خەباتی چینایەتی خۆی شۆڕش دژی سەرمایەداری دەکات و پرولیتاری دەبێتە براوێکو کاریگەرو دەسەڵاتی سیاسی لەدەست دەگرێت. هەروەها بەیانەکە ئەرکی سەرەکی چینی کرێکاری لە گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتی و روناکبیری و بنیات نانی سوشیالیستیدا دیاری کرد.

• هەر لەم ساڵەدا (*1848*) شۆڕش لە فەرەنسادا هەڵگیرسا.

• لە سێی مارتی هەمان ساڵدا لە پۆلیسی بەلجیکیەوە مارکس ئاگادار کرا کە دەبێت لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا لە وڵات بڕواتە دەرەوە،



پاشان دایان بەسەرماڵەکەیداو مارکسیان گرت، دوای بەربوونی خۆی و جینی ژنی هاتن بۆ پاریس کە حکومەتە کۆمارییە کاتییەکەی ئەوسای فەرەنسا خۆی داوای هاتنی مارکسی کردبوو بۆ ئەوێ.

• *13* مارت شۆڕش لە ڤیەنا.

• *21—29* مارت مارکس و ئنگلز "داواکارییەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیی"یان نووسی.

• *6*ی نیسان مارکس و ئنگلیز پاریسیان بەرەو کولن بەجێهێشت.

• *31* مایس رۆژنامەی "نیو راینشە زایتونگ" یەکەم ژمارەی دەرچوو کە مارکس سەرنووسەری بوو. ئنگلزیش یەکێك بوو لە ئەندامی دەستەی نووسەران.

هەروەها دو شاعیری گەورە و شۆڕشگێڕی ئەلمانیا چوونە دەستەی نووسەرانەوە کە جورج فیرت و فردیناند فرایلیشرات بوون.

ئەگەرچی رۆژنامەکە بەردەوام لە ژێر گوشاری پۆلیس و کزی داراییدا بوو بەڵام ببوە ئۆرگانی مارکسیەکان و تەژی بوو بە وتاری تیوری و بیری دیموکراتی ویستی و ئازادی خوازی و دنەی راپەڕین و شۆڕش کردن.

• ئایاری *1849* رۆژنامەی "نیو راینشە زایتونگ" لە لایەن دەسەڵاتی بروسیەوە بە بیانووی هاندان بۆ شۆڕشکردن و بەکارهێنانی توندوتیژیو دامەزراندنی حکومەتێکی سوشیالیستی داخرا. ئەمە یەکەم رۆژنامەی ئۆرگانی پرولیتاریای شۆڕشگێڕی ئەڵمانی بوو کە لە دەرچوون خرا، هەر لەم ساڵەدا مارکس چوو بۆ لەندەن.

• لە سەرەتای مارتی ساڵی *1850*دا جارێکی تر رۆژمانەی "نیو راینشە زایتونگ"ی دەرکردەوە، بەڵام نەك وەك رۆژنامەیەکی رۆژانە بەڵکو وەك "گۆڤارێکی سیاسی ئابوری"ی کۆمۆنیستی.

• کۆتایی مارتی *1850* مارکس و ئنگلز "گوتاری لیژنەی مەرکەزی بۆ عوسبەی کۆمۆنیستی"یان نووسی.

• *19* تشرینی دووەم مردنی گویدوی کوری مارکس.

• مانگی ئازاری ساڵی *1851* لە دایك بوونی کچێکی مارکس بەناوی: فرنسیسکا

• *4*ی تشرینی یەکەم تا *17*ی تشرینی دووەمی ساڵی *1851* عوسبەی کۆمۆنیستی کە کەوتبوونە چالاکیەکی زۆر بە تایبەت لە شاری "کولن"ی ئەڵمانیادا کەوتنە بەر هێرشی و راوەدونانی حکومەتی پروسی. دەیان ویست سەرەکانی عوسبە بگرن و لە رەگەوە هەڵیان بکێشن و بیری مارکس و ئنگلز لە ئەڵمانیادا بنەبڕ بکەن. بۆ ئەم مەبەستە تەنانەت پۆلیسی خۆیان نارد بۆ لەندەن بۆ چاودێری کردنی مارکس و گرتنی بەڵگەنامەو بلاوکراوەکانیان کە بە هۆیانەوە تاوانباری مارکس و هاوڕێکانیان بکەن و لەوێیش نەیان هێڵن. بەڵام گرتن و دادگایی کردنیان [illegible] ئەنجامێکی ئەوتۆیان نەگەیاند کە تۆمەتی "پیلان گێڕی" یان بەسەردا بسەپێت. بەڵام حکومەت دەیویست بەهەر نرخێك بێت تۆمەتی "پیلان گێڕی کۆمۆنیستەکان" بکاتە بەڵگەیەکی بەردەمی خەڵك و دادگاکان. بۆیە کەوتنە دروست کردنی بەڵگەنا[illegible] ساختەو بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك گیراوەکان دادگا[illegible] نەکران تا تشرینی یەکەمی ساڵی *1852* کە [illegible] هۆیەوە توانیان چالاکی کۆمۆنیستەکان پەك [illegible]ن.

• ساڵی *1852* مارکس بەردەوام لە هەڵدانەوەو دەرخستنی نهێنیەکانی دادگایی [illegible]وسیداو دەسیسەکانی پۆلیسدا [illegible] کە دادگایی [illegible]کەیان بۆ ئەو ماوە زۆرە دواخستبوو، مارکس دەیزانی کۆنەپەرستە پروسیەکان دەیانەوێت بەو کارە زەبری کوشندە لە بزوتنەوەی دیموکراتیەت بدەن لە ئەڵمانیادا. بۆ ئەو مەبەستە نامیلکەیەکی بلاوکردەوە



بەناوی "دەرخستنی نهێنی دادگایی کردنی شیوعیەکان لە کولن" کە هەموو درۆو دەلەسەو هەرەشەکانی پۆلیسی تیابوو.

• 14 نیسان 1852 مردنی فرنسیسکای کچی مارکس.

• سەرەتای ئازاری 1853 پۆلیس دەستی بەسەر هەموو نوسخەکانی نامیلکەی "دەرخستنی نهێنییەکانی دادگایی کردنی شیوعیەکان لە کولن"دا گرت کە لە سویسرا چاپ کرابوو. بەڵام نامیلکەکە هەر لەو کاتەدا لە یەکێک لە رۆژنامەکانی ئەڵمانی و ئەمریکیدا بڵاوکرابوەوە. ئەم ساڵە یەکێکە لە ساڵە هەرە ناخۆشی و نەبوونیەکانی ژیانی خێزانی مارکس.

• لە کۆتایی ئەیلولی 1854ەوە تا تشرینی یەکەمی 1855 مارکس بەشداری لە نووسینی رۆژنامەی "نیو ئودرزایتونگ" دادەکات.

• 16ی کانونی دوەم 1855 لە دایك بوونی "یا نور"ی کچی مارکس.

• ساڵی 1856 روسیا بانگەشەی شەری لەگەڵ تورکیادا کرد (شەری قرم)

• 1857 تەنگژەی باری ئابوری جیهانی.

• لە مانگی مایسەوە تا ئابی 1859 مارکس و ئنگلز هاوکاریان کرد لە دەرکردنی رۆژنامەی "گەل"دا کە لە لەندەن دەردەچو، لە سەرەتای مانگی تەموزدا مارکس بوو بە سەرنووسەری رۆژنامەکە.

• تەموزی 1859 مارکس "بەشداریەك لە رەخنەی ئابوری سیاسیدا، ژمارەیەك"ی نووسی و لە بەرلین دەرچوو.

• یەکی کانوونی یەکەمی 1860 نامیلکەیەکی مارکس دەرچوو بە ناوی "فوگتی بەرێز".

• لە مانگی شوباتەوە تا نیسانی 1861 مارکس سەفەری هۆڵەندای کردو بەناوی خوازراوەوە چوە بەرلین و لەوێ فردیناند لاسالی ناسی و بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ یەکتردا کاریان کرد، پاشان گەرایەوە لەندەن و کولن و ترێر، لە بەرلین چەند شانۆگەریەکی بینی "رای مارکس لە باری سیاسی ئەوسای پایتەختی پروسیاوە وا بوو کە: "بەگشتی کاروباری دەوڵەت لە نشوستیە، خەڵکی، بە جیاوازیانەوە چاوەرێی رووداني کارەساتن. هەروەها سەرنجی ئەوەی دابوو کە لە هەموو شوێنێکی پایتەختدا بەرگی سەربازی لەبەردەکرێت و ئەمەیش مایەی "بێز" کردنەوەیە.

• 26 تشرینی یەکەمی 1862 مارکس بەشداری کرد لە نوسینی رۆژنامەی "بریسە"دا کە رۆژنامەیەکی هونەری بوو.

• مارکس چوو بۆ تسالمت بول و بەرێگای کولن و تریردا گەرایەوە لەندەن.

• لە 24ی ئەیلول ساڵی 1862ەوە تا نیسانی 1864 لە پۆلۆنیا دژی دەسەڵاتی قەیسەر، خەڵکی راپەری. مارکس لە بەیانێکدا کە لە لەندەن دەری کرد داوای لە رابیتەی روناکبیرانی کۆمۆنیست کرد پشتی راپەرینەکە بگرن. هەر لەم ساڵەدا بەشی یەکەمی یاداشتە ئابوریەکانی نووسی و بۆ چاپی ئامادە کرد.

• 30 تشرینی 2ی 1864 مردنی دایکی مارکس لە ترێر.

• 1864 پروسیا و نەمسا دژی دانیمارك بانگی شەریان دا.

• 28 ئەیلولی 1864 مارکس لە لیژنەکانی یەکێتیی کرێکارانی جیهانی هەڵبژێرا کە لە هۆڵی سینت مارتین لە لەندەن بەسترا.

• لە 24 تشرینی دووەمدا بەرنامەی ناوخۆی کرێکارانی یەك گرتوی جیهان دەرچوو کە مارکس نوسیبووی.



• کۆتایی *1864* تا شوباتی *1865* مارکس و ئنگلز هاوکاری دەرکردنی رۆژنامەی "سوشیالیستی دیموکراتی"یان کرد.

• نیسان *1865* شەڕی ناوخۆی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

• *16* حوزەیران تا *26* تەمموزی *1866* هەلگیرسانی شەڕی نێوان بروسیاو نەمسا.

• *3* تا *8*ی ئەیلول لە جنیف کۆنگرەی کرێکارانی یەک گرتووی جیهانی بەسترا، مارکس راو بۆچوونی خۆی دایە نوێنەرانی ئەنجومەنی مەرکەزی کاتی.

• *10*ی نیسان تا *19*ی مایس *1867* مارکس دەچێت بۆ هامبورگ و بەشی یەکەمی دەست نووسی کتێبی "سەرمایە" دەداتە "مایسنەر"ی بلاوکەری بەرهەمەکانی. لە هانوفەریش دەبێتە میوانی لودفیج کوجلمان.

• *2* تا *8* ئەیلول کۆنگرەی کرێکارانی جیهان لە لۆزان، بەرگی یەکەمی "سەرمایە"ی مارکس چاپکرا؛ ئەم کتێبە تا ئێستاش بە نرخترین تیوری فەلسەفەی مارکسیەتە.

• پاییزی سالی *1867* مارکس بەهۆی کرێکارانی ئینگلیزەوە پالپشتی لە بزوتنەوەی ئازادی نیشتمانی ئیرلەندا کرد.

• *12*ی نیسانی *1868* لاورتی کچی مارکس شووی بە پاول لافارجە کرد.

• *6* تا *13* ئەیلول کۆنگرەی یەکێتی کرێکارانی جیهان لە بروکسل.

• *6* تا *9* ئاب کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبی کرێکارانی سوشیالیستی دیموکراتی لە ئایزناخ.

• *10* ئەیلول تا *11* تشرینی یەکەم مارکس لەگەل جینی کچیدا، لە رێگای ئاگن، مایننتس و زیجبرجەوە چوو بۆ هانوفەر بۆ لای لودفیج کوجلمان.

• *2*ی تشرینی یەک لە لایبزک ژمارە یەکی رۆژنامەی "حکومەتی گەل" دەرچوو کە ئۆرگانی حیزبی کرێکارانی سوشیالیستی دیموکراتی بوو، مارکس و ئنگلز بەشداریان لە نوسینیا کرد.

• *19*ی تەموزی *1870* بە رەسمی فەرەنسا بانگەشەی شەڕی دژی یەکێتی ئەلمانیای باکور کرد.

• *19* تا *23* تەموز مارکس "بەیانی یەکەمی ئەنجومەنی گشتی یەکێتی کرێکارانی دەرکرد لە بارەی شەڕی ئەلمانیاو فەرەنساوە.

• *9*ی ئەیلول ئەنجومەنی گشتی یەکێتی کرێکارانی جیهان بڕیاری لەسەر "بەیانی دووەمی ئەنجومەنی گشتی لە بارەی شەڕی ئەلمانیاو فەرەنساوە" دا کە مارکس نوسیبووی.

• *18*ی کانونی دووەم *1871* لە فرسای ئیعلانی ئیمپراتۆریەتی ئەلمانی کرا.

• *18* تا *28* مارت کۆمۆونەی پاریس رویدا کە مارکس بەرگریەکی سەختی لە ئامانجەکانی کرد.

• *17* تا *23* ئەیلول بە سەرۆکایەتی مارکس و ئنگلز لە لەندەن کۆنگرەی یەکێتی کرێکارانی جیهان بەسترا.

• ئەیلولی *1872* مارکس و ئنگلز بەشداری کۆنگرەی یەکێتی کرێکارانی جیهانیان لە لاهای کرد هەر لەم سالەدا دەقی "سەرمایە" وەرگێڕرایە سەر زمانی فەرەنسی و لە *1875*دا بلاوبوەوە، مارکس لە بارەی وەرگێڕانەکەوە وتی کە: زیاد لە د... ئەسلیەکە نرخی زانستیانەی خۆی پاراستوە.

• *10*ی تشرینی یەکەم: جینی، کچی مارکس... بە شارلس لونگوی دەکات.

• *19* ئاب تا *3* تشرینی یەکەمی *1874* مارکس و یانوری‌کچی بۆ چارەی نەخۆشی لە کارلسباد دەمێننەوە. لە گەڕانەوەدا بۆلەندەن دید... بیزیک و بەرلین و هامبورگ دەکات.

• *5* مایسی *1875* مارکس "لێکۆلینەوەو راڤەی بەرنامەی حیزبی کرێکارانی ئەلمانی" دەنێرێت بۆ فلهیلم بەراکە بۆ توێژینەوە، پاشان دەیداتە ئەنگلس



*ئاور و ئوجوس بیبل و ئوجوستانایب و فلهیلم لیبکنیشت.*

• 15ی ئاب تا 15ی ئەیلوول ماركس بۆ چارەسەری نەخۆشی دەڕواتە كالسباد.

• سەرەتای 1877 تا 8 ی ئابی 1877 ماركس فەسڵی دەیەمی بەشی دووی كتێبی ئنگلز "بەڕێز ئویجن دورینگ دنیا وەردەگێڕێت" دەنووسێت.

• 8ی ئاب تا نزیكەی 27ی ئەیلولی 1878 ماركس لەگەڵ ژنەكەی و یانوری كچی دەچنە ئوینارو شفارتسفالد بۆ چارەسەری نەخۆشی.

• 24 نیسان تا 3ی مارس 1878 شەڕی روسی و توركی.

• 17—18 ئەیلول 1879 ئەو بڵاوكراوە وەرزیەی كە ماركس نوسیویەتی ئەنگلز دەینێرێت بۆ ئوجست بیبل، فلهیلم لیبكنیشت و فلهیلم بەراكە.

• 28ی ئەیلول دەرچوونی یەكەم ژمارەی رۆژنامەی "دیموكراتی سوشیالیست" كە ئۆرگانی بزوتنەوەی دیموكراتی سوشیالیستی ئەڵمانی نهێنی بو لە زوریخ، ماركس و ئنگلز بەشداری نووسینیان تیا كرد.

• سەرەتای ئایاری 1880 ماركس سەرەتایەكی تیوری بۆ بەرنامەی حیزبی كرێكارانی فەرەنسی دەنووسێت كە ئینگلزو هاوڕێكانی پێشنیاریان كردوە.

• 26ی تەموز تا 16ی ئابی 1881: ماركس لەگەڵ ژنەكەی و جینی كچیدا دەچن بۆ ئارجنتویلی نزیك پاریس.

• 2ی ئەیلولی 1881 مردنی جینی ژنی ماركس لە لەندەن.

• 9ی شوبات تا سەرەتای تشرینی یەكەمی 1882 ماركس سەفەری جەزائیر دەكات. هەروەها دەچێتە باشوری فەرەنساو سویسراو سەر لە هەردوو كچەكەی جینی و لاورا دەدات.

• 11 ی كانونی دووەمی 1883 مردنی جینی كچی ماركس لە پاریس.

• 14ی مارتی 1883 مردنی ماركس.

• 17ی مارتی 1883 ماركس لە گۆڕستانی های گیت دەنێژرێت.

## زەمینەی مێژوویی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەكانی ماركس و ئنگلز:

ماركس بە درێژایی چل ساڵ نووسی، بە بەراورد لەگەڵ نووسینی زۆریدا ئەوەی لە سەردەمی ژیانی خۆیدا بڵاوبوەوە زۆر كەم بوو، زۆریەی زۆری نوسینەكانی هی خۆی و كەمێكیش لەگەڵ ئینگلزدا بەهاوبەشی نووسیویانە، دەست نووسی ماركس، كە بە خەتی وردو ناڕێك و پێك نوسراونەتەوە كە خوێندنەوەیان ئاسان نیە گەلێك زۆرە، دەربارەی خەتی نووسینی ئەو بەرهەمانەو كەشف كردنی رەمزەكانی، ئنگلز قۆشمەچیانە بەراوردی دەكات بە كەشف كردنی خەتی هیروگلیفیەوە. زۆریەی ئەو دەست نووسانەو یەكەمین چاپی بەرهەمەكانی ماركس ئێستا یان لە ئەنجومەنی نێودەوڵەتی دیراساتی كۆمەڵایەتی لە ئەمستردام پارێزراون، یان لە ئارشیفێك كە لە یەكێتی سۆڤیەتی كۆن لە مۆسكۆ هەڵگیرابوو ئێستا لە زانكۆی مۆسكۆدایە. لە چەند شوێنێكی تریشدا ئەو بەرهەمانە هەن لەوانە كتێبخانەی ماركس لە لەندەن.

تا ئێستایش هەموو بەرهەمی ماركس لە چەند بەرگێكدا بە تەواوی بۆ بڵاوكردنەوە كۆ نەكراوەتەوە. فرانتس مرینگ بۆ یەكەمجار هەوڵیدا بەشێك لە بەرهەمەكانی ماركس، ئنگلز و لاسال بەم ناونیشانەی خوارەوە بڵاوبكاتەوە:



*Arus dem Literarichen nach Von K. Marx. F. Engels. F. Lassale, Stuttgart. 1902.*

سێ بەرگ لەم کۆمەڵەیە لە شاری شتوتگارت ساڵی 1902 بەم تەرتیبە 504، 490، 497 لاپەڕە بڵاویوەوە. گەلێك لە بەرهەمەکانی مارکسی نێوان ساڵانی 1841– 1850ی تیا بوو.

دوای ئەمە هەوڵێکی تر لە ساڵی 1927 لە مۆسکۆو فرانکفۆرت درا تا بەشێکی تری بەرهەمی مارکس بڵاوبێتەوە، بەڵام بە ناتەواوی مایەوە.

–دایڤید ریازانف–ی لێکۆڵەرەوەی نووسراوەکانی مارکس، لە سەردەمی ژیانی لینینەوە سەرقاڵی کۆکردنەوەو رەخنەلێگرتنی نووسراوەکانی مارکس و ئنگلز بوو، بۆ ئەم کارەی لە لایەن پارتی کۆمۆنیستەوە چاودێری دەکرا، ریازانف لە سەردەمی کوشتن و تۆقاندنی ستالیندا گیراو ئیعدام کرا ئەو بەشەی ریازانف بە ناونیشانی *Marx – Engels Gesamtasgabe* چاپ کراو پاشان ناوی لەو بەرهەمە بۆ ئەم پیتانە کورت کرایەوە *MEGA* سیانزە بەرگی لێ بڵاوبیبوەوە کە بەرهەمی مارکسی تا کۆتایی ساڵی 1848ی دەگرتەوە ئەم کارە ساڵی 1970 جارێکی تر لە بەرلین بڵاوکرایەوە. ریازانف بێجگە لەمە کۆمەڵێکی تری بە ناونیشانی *Marx-Engles Archiv* لە پێنج بەرگدا لە نێوان ساڵانی 1925– 1927 دا بە زمانی ئەڵمانی و روسی لە مۆسکۆو لینینگراد و فرانکفۆرت بڵاوکردبوەوە. دوای کوشتنی ریازانف ئادوراتسکی و هاوکارانی توانیان پێنج بەرگی تر لە "ئارشیف" بڵاویکەنەوەو پاشان کارەکەیان وەستا. لە لایەکی ترەوە، ریازانف لە سیانزە ژمارەی یەك بە دوایەکی بڵاوکراوەی *Letopisi Marxizsma*دا هەندێك لە نووسراوە کورتەکانی مارکس لە ساڵانی 1926– 1930دا بە چاپ گەیاندبوو. هەر بە هۆی هەوڵی ئەو و هاوکارەکانیەوە، هەندێك لە بەرهەمەکانی مارکس وەك دەست نووسەکانی ئابوری و فەلسەفی 1844، ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی، گروندیسە بۆ چاپ ئامادەکران.

لە دوای شەڕی دووەمی جیهانیەوە، لە بەرلینی خۆرهەڵات و مۆسکۆ، بۆ بڵاوکردنەوەی بەشێکی تری بەرهەمی مارکس و ئنگلز هەوڵدرا، لە نێوان ساڵانی 1956 تا 1970 کۆمەڵێکی تری لەژێر ئەم ناونیشانەدا چاپ کرا *K. Marx and. F. Engels, Werke. Berlin 1956- 1968, 39 Vols, 2 vols supplmets, 1967-1969*

ئەم کۆمەڵە بەرهەمە کە زیاتر بەناونیشانی *MEW* ناوی دەرکردووە، لە 39 بەرگ و دوو بەرگی پاشکۆو پێرستێك پێك هاتوە. ئەم بەرهەمە تەواو نیە، چونکە بەشێك لە دەست نووسە ئابوریەکانی مارکس کە لە دەیەی 1860دا ئامادەکراوە تیا نیە. هەروەها ئەو بەرهەمانەی کە مارکس بە زمانی تر نوسیونی لەم کۆمەڵەیەدا بە زمانی ئەڵمانی بڵاوکراونەتەوە.

لە ساڵانی 1924 تا 1954 لە فەرەنسەو بە زمانی فەرەنسی چەند هەوڵێکی تری سەرنەکەوتو بۆ بڵاوکردنەوەی هەموو کارەکانی مارکس و ئنگلز درا. وەرگێڕانەکانی ژ. مولیتور کە بەرئەنجامەکەی نۆ بەرگی بەرهەمی فەلسەفی، سیانزە بەرگی بەرهەمی سیاسی، هەشت بەرگی بەرهەمی ئابوری، چوار بەرگی سەرمایە، هەشت بەرگی بەرهەمی [illegible] بەرگێکی هەژاری فەلسەفە بەرگێکی رەخنە[illegible] ئابوری سیاسی، یانزە بەرگی نامەکا[illegible] کەوتەوە، وەرگێڕانێکی سەرنەکەوتو[illegible]ساری دەقەکانیش بێ رەخنە بون. ئەم کۆمەڵەیە، ئێستا، خۆشبەختانە لە یاد کراون. بە پێچەوانەوە ئەوەی لە ئینگلتەرەو ولاتە [illegible]کگرتوەکان بەناو "کتێبخانەی مارکس لە بڵاوکراوەی پلیکان"دا [illegible] کاری جیدین. وەرگێڕانەکانی وردو ئەمینن و [illegible]مارەکانیش رەخنەیین، ئەم کۆمەڵەیە بریتیە لە [illegible]شت بەرگ، سێ بەرگی سەرمایە، بەرگێکی گروندیسە، سێ



*بەرگی هەڵبژاردە نوسراوی سیاسی، بەرگێکی بەرهەمە بەراییەکانی مارکسن.* هەر یەکێك لەم بەرهەمانە پێشەکیەکی گرنگی بۆ نوسراوە، بۆ نموونە پێشەکی کارە بەراییەکانی نووسینی *لوچوکولتیە*، پێشەکی بەرگەکانی سەرمایە نووسینی *ئێرنست مەندلە.*

هەوڵەکانی تر لە لایەن *ماکسیمیلین و بلاوکەرەوەی گالیمار* لە فەرەنسادا کراوە، بەرهەمەکانی مارکسیان لە کۆمەڵە کتێبی *پلپادا* بڵاوکردەوە، تا ئێستا چوار بەرگ کە هەریەکەیان زیاد لە هەزار لاپەڕەیە، دەق و یاداشت و شەرحیان لەسەر کراوە بڵاوبونەتەوە. لە دوو بەرگدا بەرهەمە ئابووریەکانی مارکس و لە بەرگێکیاندا بەرهەمە فەلسەفیەکانیەتی، بەرگی یەکەمی بەرهەمە سیاسیەکانیشی چاپ کراوە کە لە سالآنی ***1848*** تا ***1854*** نووسیویەتی بڕیارە دوو بەرگی تریشی لێ بڵاوبکرێتەوە.

وەرگێڕانی ئینگلیزی بەرهەمەکانی مارکس و ئنگلز لە ساڵی ***1975***دا لە بەرلین، مۆسکۆ، لەندن و نیویورك بڵاوبوەوە. لە دەیەی ***1990***دا لە پەنجا بەرگدا کۆتایی هات. ئەم کۆمەڵەیە لە چواربەشدایە:

*1*-هەموو کتێب و وتارەکانی مارکس و ئنگلز بێجگە لە سەرمایەو یاداشتە ئابوریەکانی مارکس.

**2**-سەرمایەو هەموو یاداشتە ئابوریەکان.

**3**-هەموو نامەکانیان.

**4**-یاداشتە پەراگەندەو دەفتەری لێکۆڵینەوەکانیان.

ئەوەی لەم کۆمەڵە بەرهەمەدا مایەی ئازارو ناخۆشیە ئەو یاداشتانەن کە بۆ روون کردنەوە بەهەمان لێکدانەوەی دوگماتیکیو ئایدیۆلۆژێکی واتا لە دیدو بۆچوونی لینین و ستالینەوە ئامادە کراون. پێش ئەم کۆمەڵەیە، هەڵبژاردەیەکی سێ بەرگی لە گرنگترین نووسینی مارکس و ئنگلز لە مۆسکۆ، بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی بڵاوکرایەوە کە بەشی خۆی رێنماییەکی چاکە، هەڵبەتە بە هەمان ئەو یاداشتە ئازاراویانەوە کە باسمان کرد.

**سەرچاوەکان:**

*1-سیرة حیاة کارل مارکس- دار الفارابي.*

*2-مارکس و سیاست مدرن: بابك احمدی.*



# کارل مارکس

## (1818–1883)

■ سەمیر یوسف

● و. لە عەرەبییەوە: لاوکۆ

لانی کەم بەهۆی سستی و تەمبەڵیەوە نەك هەستکردن بە هەڵخەڵەتاندن و نائومێدی، تا ئێستا سەردانی گۆڕی "کارل مارکس"م نەکردووە. ئەگەرچی بۆ ماوەی شەش ساڵ دەچێت لە ناوچەیەکی نزیك بە گۆڕستانی "های گیت" نیشتەجێم و، تەرمی ئەویش لەوێدایە.

بەڵام هەر دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی ئەم ژیاننامە تازەیەی بوومەوە کە نووسەری ئینگلیزی "فرانسیس وین" نووسیویەتی، بۆم دەرکەوت دواجار ئەم پیاوە لە زۆربەی ئێمەومانان بەدترو خراپتر نەبووە. هەنووکە چەند ئارەزووی ئەوە دەکەم چەپکێك گوڵ هەڵگرم و رووەو دیاری بکەومە رێ.

وەك هەموو خەڵکی، ژیانی شەخسی "کارل مارکس" دابەشە لە نێوان ساتە خۆش و ناخۆشەکاندا. یەکەمین شتێ لە ژیانی ئەودا جێی سەرنج بێت ئەوەیە لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی یەهودی چاوی بەدنیا هەڵهێناوەو، باوکی ئومێدەوار بووە منداڵەکانی بە جۆرێك پێ بگەیەنێت، لە بارگرانی ژیان بە دوور بن و وەك هاوڵاتی پلە دوو نەگوزەرێنن. هەر بۆیە دەست بەجێ پەیرەوی ئاینی رەسمی دەوڵەتی ئەڵمانی دەکات، واتە دەبێتە پرۆتستانتی مەزهەب. شایەنی باسە تەواری هاوڵاتیانی ئەو شارەی "مارکس"ی تێدا لە دایك بوو کاتۆلیك مەزهەب بوون. گەر بێینە سەر چیرۆکی خۆشەویستی "مارکس"، دەبینین بەو حیکایەتە کلاسیکیانە دەچێت کە تیایدا لاوێکی دەست کورت و هەژار عاشقی کچێکی دەوڵەمەند دەبێت.. قسەی گفتە شیرینەکانی مارکس شازادەی پروسی "جوانا برتا جینی فۆن و سیستڤاڵن" لە خشتە دەبەن، ئەو شازادەیەی لە دوای حەوت ساڵ پەیوەندی رۆمانسی



به خاتوو "جینی مارکس" ناو دەردەکات و، دەبێتە یەکەمین و دوایەمین هاوسەری ئەو پیاوە بەناوبانگە.

بێگومان ئەم لاوە بەپێی ئەو وەسفەی "موسا هیس"ی هاوڕێی دەیکات، لە کەسایەتی خۆیدا "رۆسۆ" تا "ڤۆلتێر" تا "هولباخ" بۆ "لیسینگ" تا "هیگڵ" و "هاینە" کۆدەکاتەوە. ئەمەو سەرباری ئەو خەونە سادەیەی بۆ گۆڕینی جیهان هەیبوو، توانی سەرنج و ئارەزووی شازادە "جینی" بەلای خۆیدا راکێشێت بۆ ئەوەی لەگەڵیدابێت تەنانەت "جینی" جارێکیان بۆ ئەوەی پێکەوە بمێننەوە ئارەزووی ئەوەی کردبوو: "مارکس" نەخۆشی سەر جێگا بێت، بۆ ئەوەی ئەم بتوانێت چاودێری بکات و شەوانە بەدیاریەوە دابنیشێت. لە راستیشدا "جینی" بە درێژایی ژیانی لەگەڵیدا مایەوەو جێی نەهێشت. هێندەش بەدەست نەهامەتی و بارگرانی ژیانەوە چەشتی، هێندە بە خۆشی نەژیا.. ئەوەی "جینی" کردی تەنها ئەوانە دەیانتوانی هەڵکەن لەگەڵیدا کە زۆر دڵسۆزو لە خۆ بووردەن.

تەنانەت ئەم خانمە خانەدان و خواپێداوە ناچار بوو فێری ژیانی کۆچ و کۆڵ بە کۆڵ بێت و، لە ئەڵمانیاوە بچێت بەرەو فەرەنساو لەوێشەوە بەرەو بەلجیکاو بەریتانیا بکەوێتە رێ. لەو ماوەیەشدا دێوەزمەی هەژاری و نەداری و بێ پارەیی زیاتر بەرۆکی پێ گرتن، بە تایبەت کاتێك ناچار بوون بەوەی لەگەڵ منداڵەکانیاندا ژیانی پەناهەندەیی بژین لە گەڕەکی "سوهو"ی شاری لەندەندا.

ئەم شۆڕشگێڕە رادیکاڵە وازی لەوە هێنابوو پیشەو کارێکی بەکەڵك بکات تا خۆی و خانەوادەکەی لەو هەژاریە قوتار بکات و، تەواوی کاتی خۆی بۆ نووسینەوەی کتێبە سەرەکیەکەی (سەرمایە) تەرخان کردبوو کە زیاتر لە تەلیسمێك دەچوو. لە پای ئەمەدا "مارکس" جارێکیان ناچار بوو بە زۆر خانوەکەی چۆڵ بکات و، پەنابەرێتە بەر ماڵە دراوسێیەکی نزیکیان. چەند جارێکیش خۆیان لەناو ئەو خاوەن قەرزە توڕانەدا بینیوەتەوە کە چواردەوریان داون. تەنانەت کار گەیشتە ئەو ئاستە نزمەی "جینی" ناچار بوو بچێتە هۆڵەنداو، بەسەر هەردوو قاچی خاڵی "مارکس" "لیۆن فلیبس"ی سەرمایەداردا بکەوێ و داوای یارمەتی لیٚ بکات.

بەڵام ئاخۆ دەبێت "مارکس" لەو ماوەیەدا کە هاوسەرەکەی لە ماڵ نەبووە چی کردبێ؟

بەڵێ، ئەو کارەی کرد کە زۆربەی پیاوان دەیکەن، کاتێك تەنها دوو بە دوو لەگەڵ خزمەتکارێکی شۆخ و شەنگی وەك "هلن دلموث"دا دەمێنێتەوە. لە کاتێکدا هاوسەرەکەی بەردەوام دانو بێ دادی بوو لە دەست ئێش و ئازاری سك کردن و منداڵ بوون، "هلن دلموث" توانی "مارکس" فریو بدات و سکی لێی پڕ ببێت. ئاکامی ئەو پەیوەندیەش منداڵێکی ناشەرعی لێکەوتەوە کە لە گەڕەکە میللیەکانی شاری لەندەندا ژیاو هەر لەوێشدا مرد.

بێگومان ئەم کارە بووە مایەی توڕەیی "جینی"، بەڵام بەهۆی ئەوەی بە تەنگ ناوبانگی "مەسەلەی" چینی کرێکارانەوە بوو کە مێردەکەی رێبەرایەتی دەکرد گوێ بیستی ئامۆژگاری "مارکس" و هاوەڵەکانی بوو، بەوەی پێویستە بێدەنگی لەو کارە بکات و باسی نەکات.

مادامەکی لە سەروبەندی باسکردنی ئەو خزمەتکارەداین، ئەوەی زۆر جێگای سەرسوڕمانمە ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی "مارکس" بەدەست هەژاریەوە گیرۆدە بوو، بەڵام توانیویەتی وەکی خەڵکانێکی حاڵ و گوزەران باش خزمەتکارێك لە ماڵەکەیدا راگرێت. بەڵام بەو جۆرەی "فرانسیس وین" بۆمانی دەگێڕێتەوە، مەسەلەکە جێی سەرسوڕمان نیە. چونکە هەژاری مارکس ئەو هەژاریە نەبووە کە هەژاران بەدەستیەوە گرفتار بوون بەڵکو هەژاری دەوڵەمەندەکان بووە. جیاوازیەکی



زۆریش لە نێوان ئەم دوانەدا هەیە. بەپێی ئەو ژمارانەی "وین" لەم کتێبەدا باسی دەکات ئەو پارەیەی بە "مارکس" بووە تەنانەت لە ناخۆشترین ساڵدا، ئەوەندە بووە کە ژیانێکی ئاسوودە بۆ خێزانێکی چینی ناوەند مسۆگەر بکات.

کێشەکە لەوەدایە کە "مارکس" زۆر بە تەنگ ڕواڵەتەوە بووە، بۆیە نەیتوانیوە دەست بەرداری ئەو شێوە ژیانە بێت کە خۆی و هاوسەرەکەی لە سەری ڕاهاتوون و، ڕێگر بووە لەوەی بتوانن وەک ئەوانەی لە خوار خۆیانەوەن بگوزەرێنن. هەر ئەمەش ناچاری کردن هەرچی شتی بەنرخ و گرانیان هەیە بیخەنە ڕەهنەوە.

سەرەڕای ژیانی شۆڕشگێڕی و پەناهەندەیی بوەیهمی کە تیایدا ژیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "مارکس" بە تەنگ دوارۆژی کچەکانیەوە بوو. بۆیە دەیویست بە شێوەی چینە خانەدانەکان پەروەردەیان بکات، تا شایستەی ئەوەبن بە شێوەیەکی گونجاو و لەبار شوو بکەن و خێزان دروست بکەن. کەچی بۆ بەدبەختی ئەو، ئەوانیش هاوسەرەکانیان لەو شۆڕشگێڕە لێهاتوانە هەڵبژارد کە لە شێوەی "مارکس" بوون.

گەر بێینە سەر هاوڕێیەتی، ئەوا بێگومان "مارکس" لەم ڕووەوە زۆر خۆش بەخت بوو. لەبەر ئەوەی "فردریک ئینگلز" باشترین هاوڕێیەکە کە مرۆڤ تووشی ببێت، ئیتر لەکاتی خۆشیدا بێت یان لەکاتی ناخۆشیدا.

"ئینگلز" لە پاڵ ئەوەی پشت و پەنای "مارکس" بوو لە شۆڕشدا، هاوکات دەست بەرداری کاری ڕۆژنامەنووسی و ژیانی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووی خۆشی بوو لە لەندەنداو ڕوویکردە مانچستەر، بۆ ئەوەی لە پشت مێزەکانی دوژمنەوە (واتە لە کۆمپانیاکەی باوکیدا) دەست بەکار بێت و، لەوێوە زانیاری نهێنی دەربارەی بازرگانی لۆکەو ڕاو بۆچوونی شارەزایان لە بازاڕەکانی جیهاندا بگەیەنێتە هاوڕێکەی. لەوەش گرنگتر ڕەوانە کردنی پارەی پێویست بوو بۆ خۆی و خاو و خێزانەکەی. تەنانەت لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بڕی ئەو پارەیە کە "ئینگلز" توانیویەتی ڕەوانەی کات بۆ "مارکس"ی هاوڕێی، بێ ئەوەی بەرپرسانی کۆمپانیاکە پێی بزان. لەیەکێک لە نامەکانیدا "ئینگلز" شانازی بەوەوە دەکات کە ساڵێک توانیویەتی بدات لە نیوەی قازانجی باوکی. بەڵام لە خۆبوردویی "ئینگلز و دەست و دڵفراوانی بەردەوامی ئەو، بەس نەبوون بۆ ئەوەی "مارکس" لەو تەنگانە مادیەی ڕزگار بکەن کە تێی کەوتبوو. جارێک لە جاران "مارکس" دەیەوێت زیوی خێزانەکەی بخاتە ڕەهنەوە، کارێک کە بووە مایەی گومان لێکردنی لە لایەن پیاوانی پۆلیسەوە. چونکە بڕوایان نەدەکرد پەناهەندەیەکی دەست کورتی وەک ئەو، خاوەنی شتێکی بەنرخی لەو جۆرە بێت. بۆیە ناچار بوو شەوێک لە زینداندا بەسەر بەرێت، تا ئەو وەختەی بێ تاوانیی خۆی سەلماند.. جارێکی تر کاتێک قەرزی لەسەر کەڵەکە بوو بوو، داوایەکی پێشکەش بە کۆمپانیایەکی گواستنەوە کرد تاوەک کاتبێک لەوێدا کار بکات. بەڵام بەهۆی خەت ناخۆشیەوە سەرکەوتوو نەبوو. زۆری نەخایاند قەدەر بەدەم ئەم تێکۆشەرەی خەباتی چینایەتی و خێزانەکەیەوە پێکەنی.

ئەو میراتیەی دەمێک بوو چاوەڕێی بوو بێ ئەوەی دەستی بکەوێت، لەبەر ئەوەی دایکی زیاد لە پێویست ژیا، کارێک کە بووە مایەی بێزاری "مارکس" هەر نەگەیشت. بەڵام لە جێگەیەکی ترەوە و بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ و شتێکی چاوەڕوان کراوبێت، دەستی کەوت. ئەویش لەلایەن یەکێک لە هاوڕێ دڵسۆزەکانیەوە بوو بە ناوی "ڤلیهلم ڤۆڵف"ەوە. "ڤۆڵف" لە دوای مردنی بڕێک پارەی وای



بۆ "مارکس" بەجێهێشت ڕۆژێك لە ڕۆژان بە بیریدا نەدەهات کە لە نووسینەکانی چنگی بکەوێت.

"مارکس"یش لەلای خۆیەوە ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی هاوڕێ کۆچکردووەکەی لە یاد نەکردو، بەشی یەکەمی کتێبی (سەرمایە)ی پێشکەش کرد: (پێشکەشە بە هاوڕێی لە یاد نەچووم فلیهلم ۆڵف. پێشڕەو و دڵسۆزو سەرپەرشتیاری خانەدانی پرۆلیتاریا). چۆن نابێتە سەرپەرشتیاری پرۆلیتاریا لە کاتێکدا ئەو بڕێك پارەی وای بە میراتی بۆ بانگخوازی یەکەمی ئەو ڕێبازە جێهێشتبێ کە بەس بێت بۆ چاککردنی ماڵەکەیی و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی بە کەلوپەلی تازەو، سەرەڕای کڕینی چەند ئاژەڵێکی ماڵی بۆ منداڵەکانی: سێ سەگ و دوو پشیلەو، دوو باڵندە؟ بێگومان ژیاننامەیەکی لەمجۆرە دەربارەی ژیانی "مارکس" نە ئەوانە ڕازی دەکات کە خۆشیان دەوێت، نە ئەوانەشی ڕقیان لێیەتی. لەبەر ئەوەی ئەوانەی خۆشیان دەوێت یاخود لەسەر خۆشەویستنی ئەو ماون، ئەم ژیاننامەیەی وەها دەخوێننەوە وەك ئەوەی هەوڵێکی (بورژوازی) بێت بە مەبەستی بچووککردنەوەی فەلسەفەی "مارکس" و دەستکەوتەکانی. هەرچی ئەوانەشە خۆشیان ناوێت و ڕقیان لێیەتی، ئەوانەی دەست لەوە ناکێشنەوە کە بەرپرسیاری کەن لەو تاوانانەی بەناوی فەلسەفەکەیەوە کراوە، حەزیان بەوە نییە "مارکس" وەکی پیاوێك لە گۆشت و خوێن نیشان بدرێت. ڕاستە نووسەری ئەم کتێبە ئەو هەلە لە دەست خوێنەران نادات تا بە فەلسەفەی "مارکس"و، ئەو مێژووە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریە ئاشنا بن کە تیایدا لەدایك بووە. بەڵام لەوەدا کە تەنها هێڵە گشتیەکانی ئەو مەسەلەیەی باسکردووەو، لە لایەکی ترەوە خۆی بە دوور گرتووە لەوەی بەڵگەی ڕەخنەیی دوورو درێژ لە بەرژەوەندی یان لە دژی "مارکس" بهێنێتەوە، بەم کارەی خزمەتێکی گەورەی کردووین. چونکە لەمڕۆدا چیرۆکی سەرنج ڕاکێشی ژیانی "مارکس" شتێکی ئەوەندە گەورە ناگەیەنێت، گەر بێت و بە سەلماندن و ساغ کردنەوەی دروستی و نادروستی تێزەکانی بارگاوی بکرێت. جێی خۆیەتی بڵێین گەر لەمڕۆدا پاساوێك بۆ سەرلەنوێ نووسینەوەی ژیاننامەی "مارکس" هەبێت، ئەوا دەبێت بەو جۆرە بێت کە وەك پیاوێك لە گۆشت و خوێن وێنەی بکێشێت. ئەو بۆچوونە مێژوو بەجێی هێشت کە دەڵێت: ئەو خانەدانترین کەسێك بووە پێی خستۆتە سەرزەمین، وەك هەندێك لە شوێن کەوتوانی دەیانوت. یاخود ئەو بۆچونەی پێی وایە ئاژاوە دروستکەری ناو خەڵك و بانگەشەکەری پشێوی و ماڵوێرانی بووە، وەکی نەیارەکانی باسیان کرد.

هەرچیش پەیوەندی بە فەلسەفەکەیەوە هەیە ئەوەندە بەسە کە بەم دوایانە ئەوانەی لەسەر میراتی ئەو ناکۆکن جارێکی تر هێنایانەوە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئیتر ئەمە بەو شێوەیە بێت کە "فۆکویاما"ی خاوەنی (کۆتایی مێژوو) پێی گەیشت، یان بەو چەشنە بێت کە "ژاك دێریدا" پەی پێ برد لە موناجاتکردنی تارمایی ئەو فەیلەسوفەی بەر لە سەدو ئەوەندە ساڵ ئەم جیهانەی جێهێشتووە.

**سەرچاوە:**

*سمیر الیوسف: سیرة کارل مارکس کرجل من لحم و دم*

*جریدة (الحیاة)- العدد (13287)- تشرین الاول/ 1999*



# مارکس ڕێبازێك پێشکەش دەکات

● وەرگێڕانی: ئەکرەم قەرەداخی

مارکس پیاوێك بوو، هەرگیز ڕەچاوی ئەوەی لێ نەدەکرا شۆڕشێك بەرپا بکات، ریشێکی درێژ، جل و بەرگێکی شڕ، لە گەڕەکێکی هەژاری لەندەندا دەژیا، بە دورخراوەیی لە وڵاتەکەی خۆیەوە (ئەڵەمانیا) هاتبوە ئەوێ بە کوێرەوەری لەسەر ئەو وتارانەی بژی کە لە ڕۆژنامە بەریتانیە ئازادەکاندا دەربارەی کاروبارەکانی دەرەوە بڵاوی دەکردنەوە.

ڕۆژانە دەچوو بۆ مۆزەخانەی بەریتانی و لەوێ کتێب و بڵاوکراوەکانی دەپشکنی و بەناویاندا دەگەڕا و زۆر بە وردی و بەردەوامییەوە وردە وردە نهۆمەکانی تیۆریە شۆڕشگێڕیەکانی بینا دەکرد.

کارل مارکس شۆڕشگێڕ بوو. نەك تەنها لەبەر ئەوەی بانگی خەڵکی دەکرد و ریزەکانیانی بۆ شۆڕشێکی توندوتیژ ڕێك دەخستن. یا لەبەر ئەوەی شۆڕشەکان بەناوی ئەوەوە بەرپا دەبوون و سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە لە پاشتردا نوسینەکانی کاریگەرییەکی قوڵیان کردە سەر هەموو هزرێکی رامیاری و ئابوری.

مارکس بیری بەهێز بوو چونکە بە زیری و زیرەکی ڕوانینەوە پشتی بە سەرنجدانی ئەو ژیانەی دەوروبەری دەبەست، بیریشی سنور دابوو لەبەر ئەوەی هەر ئەوەندە ڕاستیەکانی دەدی کە کات و شوێن و ئارەزوەکانی ڕێگای بینینیانی دەدا.

ئەو ڕاستیانە بارودۆخە پڕ لە ئازارەکانی ژیان بوو لە ڕۆژە قێزەوەنە هەرە ناخۆشەکانی شۆڕشی پیشەسازی. مارکس دراوسێکانی خۆی لە گەڕەکە هەژارەکانی لەندەندا دەدی کە چۆن لە بێ دەرەتانی و کوێرەوەریدا دەژین، و لە کولان و کوخە پیسەکاندا بەسەر یەکدا دەترشێن و تا بێ هۆشیش دەبن کاردەکەن.

مارکس ئاگاداری ترس و بێ چارەیی و دەستەوسانی کرێکاران بوو وەك قوربانیانی ئابورییەك کە بە هەنگاوی توندوتیژ تا دەهات فراوان دەبو، ئابورییەك کە خاوەن کارگەکان بە هۆیەوە بەسەر ئەو حکومەتەی ئەوان لە سایەیدا دەژیان، زاڵ بوون.

لە پاشتردا بە نیو سەدە، بارودۆخ لە ڕوسیادا وەك ئەو بارودۆخە بوو، بەڵکو ئەو بارودۆخە بە پلەیەك زیاتر یا کەمتر لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی ماوەی



گواستنەوەیان لە ئابوری کشتوکاڵیەوە بۆ ئابوری پیشەسازی دەبری، وابوو.

مارکس؛ پاش ئەوەی بە لێهاتویی و سۆزەوە ئەو ئازارە مرۆڤیانەی لێکدایەوە، بنچینەیەکی پتەوی بۆ بانگەوازەکەی دانا، و رای گەیاند کە رێبازێکی نۆزیوەتەوە بەهۆیەوە سەردەکەون و کوێرەوەری لەناو دەبەن.

لەگەڵ ئەوەشدا مارکسیزم شتێکی زۆر لەوە گەورەتر بوو کە تەنها بانگەوازێك بێت بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بەو زۆردارییە توندوتیژەی سیستمی کارگەکان پەیڕەوییان دەکرد، تەنانەت لەوەش گەورەتر بوو کە تەنها بانگەوازێك بێت بەرەو سوشیالیزم.

"روبرت ئۆین" و زۆربەی فەیلەسوفە ئینگلیزی و فەرەنسیەکان چارەسەری ئەمەیان کردبوو، بەڵام مارکس ئەوانەی بە خەیاڵی و ئایدیاڵی دادەنا چونکە ئەوان بانگی خاوەن کارگە بە دەستەڵاتەکانیان دەکرد کە توانای داراییان لەگەڵ خەڵکیدا بەش بکەن، لەم بارەیەوە مارکس وتی: لەوانەیە هەندێك کەس هەبن تا ئەم رادەیە قوربانی بدەن. بەڵام سەرتاپا چینێك ئامادە نیە ئەم کارە بکات.

هەروەك چۆن "داروین" شێوازی پەرەسەندنی لە رەوتی ژیاندا دەدی، هەر بەو شێوەیە مارکس هێزێکی وەك ئەوەی دەدی کە لە مێژوی ئابوریدا کاردەکات، ئەو وای دەدی کە ئەم هێزە تا رادەیەکی زۆر رووداوەکانی داهاتو دەستەبەر دەکات.

مارکس بڕوای بە راستی تیۆرەکانی فەیلەسوفی ئەڵمانی "هیگڵ" هێنابوو. کە بڕوای وابوو هەموو بیرۆکەیەکی مەزن لە مێژودا بیرۆکەیەکی نەیار بۆ خۆی پەیدا دەکات و لە کاتێکدا هەردوو بیرۆکەکە کێ بەرکێی یەکەمی دەکەن، بیرۆکەیەکی سێیەمی ئاوێتەیان لێ پەیدا دەبێت کە راستیەکانی هەردوکیان لە ئامێز دەگرێت، ئەم بیرۆکە ئاوێتەیەش بە دەوری خۆی دەبێتە بیرۆکەیەکی نوێ، و کردارەکە سەرلەنوێ دووبارە دەبێتەوەو لە هەموو جارێکیشدا بیرۆکەیەکی پاکژتر و تەواتر لەوەی پێشو لە دایك دەبێت. هیگڵ ئەمەی ناونا "دیالێکتیکی لۆژیکی".

لە پاشتردا مارکس وای راگەیاند کە "هیگڵی لە تەوقە سەرەوە هەڵگەڕاتۆتەوە". چونکە ئەو بڕوای وابوو کە هۆکاری زاڵ بەسەر پەرەسەندنی مێژوی کۆمەڵدا گواستنەوەی هێزە ئابورییەکانە نەك کارلێکی بیرۆکەکان. چونکە جۆرێك لە جۆرەکانی رێکخستنی ئابوری چینێکی کۆمەلایەتی بۆ سەرچاوەی دەستەڵات و هێز بەرز دەکاتەوە کە هەموو ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی تایبەت بەو هێزەیانەوە بە دەستەوە دەبێت. مارکس وتی ئەم چینە بەهۆی هێزە ئابورییەکەیەوە بەسەر هۆکارە سیاسیەکانی کۆمەڵدا زاڵ دەبێت، ئەم چینە سیاسیەش هیچ عەیبەیەك لەوەدا نابینێت کە هێزە سیاسیەکەی بۆ پتەوکردنی دەستەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت. هەرچی چۆنێك بێت سنوری ئەو دیموکراسیەی دانراوە و هەموو هونەرەکانی کۆمەڵ و رۆشنبیری و رەفتاریشی بە شێوەیەکی گشتی دەبنە ئاوێتەی حەزو ئارەزوو و پێداویستیەکانی چینی دەستەڵاتدار و هەموشیان بەندن بەو رێچکە ئابوریەی کە دەستەڵاتی بەو چینە بەخشیوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا، هەموو سیستمێکی ئابوری لەو جۆرە "ناکۆکیە ناوەکیەکان" هەروەك مارکس ناوی ناوە، لە ناوخۆیدا هەڵدەگرێت و بەهۆی گۆڕانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و چاککردنی هۆیە هونەریەکانەوە، بەردەوام گەشە دەدات بە چینێکی ئابوری نوێ، کاتێك ئەم چینە نوێیە لە هێزو ژمارەدا گەشە دەکات، داوای بەشێکی زیاتر لەو قازانجانە دەکات کە لە چاککردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە دەست دەکەون، ئەوکاتە چینە دەستەڵاتدارە کۆنەکە بەرهەڵستی دەکات. لە سەرەتادا سەپاندنی



دەستەڵاتەکانی دەوڵەت بەسەریاندا، لە پاشتردا ئەگەر زانی ئەم ڕێبازە سودی نیە ڕوودەکاتە توندوتیژی و سەرکوتکردن.

مارکس دەڵێت ئەمە کارێکە سوشیالیستە ئایدیالییەکان هەرگیز لەوەپێش درکیان پێ نەکردووە.

لە بەرامبەریشدا توندوتیژیش ڕێبازێکی سەرەکی دەبێت بۆ ئەوەی چینە ئابوریە پەیدابوە نوێیەکە بەرژەوەندییەکانی خۆی پێ بپارێزێت و هەوڵ بدات ئەو پایە بەمێزە بەدەست بهێنێت کە خۆی بۆ ئامادە کردوە، لەمەوە شۆڕش بەرپا دەبێت، ئەوکاتە ئەو شۆڕشە توندوتیژە وەك ئەو مامانە وایە کە لە دایکبوونی هەموو ڕژێمێکی نوێ ئاسان دەکات، بەم شێوەیە سورەکە، پاش داکوتاندنی بناغەی ڕژێمە نوێیەکە سەرلەنوێ دووبارەو دووبارە دەبێتەوە..

مارکس لە مێژووی خۆرئاوادا نمونەیەکی تەقلیدی ئەم شێوازەی لە گواستنەوەی کۆمەڵگەی دەرەبەگی بۆ کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا دەدی.

مارکس هەمیشە رای وابوو کە ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی دەرەبەگی هەمیشە بە ئاراستەی ئامانجێکی سەرەکیدا هەنگاو دەنێت، ئەویش بەستنەوەی جوتیارە بە زەویەوە بۆ ئەوەی لە پێناوی بەرژەوەندی ئەو کەمایەتیەی خاوەنیەتی بەکاربێت.

لە پاشتردا چینێکی نوێ لە بازرگان و خاوەن پیشە دێنە ئاراوە کە دەست بەسەر هۆیە نوێیەکانی بەرهەمهێناندا دەگرن (سەرمایەو کارگەکان). گومان لەوەشدا نیە کە بەرژەوەندییەکانی ئەمانیش بەرەنگاری بەرژەوەندی دەستەڵاتە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان دەبێتەوە کە لەسەر خاوەندارییەتی زەوی دامەزراون.

هەمیشە خاوەن زەوی بایەخ بە ڕژێم و سەقامگیری دەدات، ئەو ڕژێمە دەرەبەگیە ئۆرۆستوکراتیەی ئەو بارودۆخەی بۆ دەپارێزێت و پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کۆیلەکانیەوە بۆ دەستەبەر دەکات، هەرچی بۆرژوازییەکەشە لەسەر ئەوە سور بوو کە مافی خۆیەتی لە هەر کوێیەك بێت کرێکار بە کرێ بگرێت و بازرگانی خۆی گەشە پێ بدات، و بۆ ئەوەی ئەم مەبەستانەی بهێنێتە دی لە پێشدا پشتی پادشای دەگرت بەرامبەر بە ئۆبڵەکان، لە پاشتردا داوای دەکرد کە پێویستە دەنگێکی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا هەبێت و لەمەدا دژایەتی پادشای دەکرد، و لەبەر ئەوەی دانیشتوانی شارەکان لە ژمارەدا لە چینی ئۆرستۆکراتی زیاتر بوون بۆیە بەرژەوەندییان لەوەدا بوو کە داواکارییە سیاسیەکانیان ڕێك بخەن، داوای حکومەتێکی دیموکراسی بکەن کە نوێنەری گەل بێت، بەوەش سۆزی چینەکانی دیکەشیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا.

بەرئەنجامی کێشەکە لای مارکس هەمیشە ئەوە بوو کە بۆرژوازییەت بە ڕێبازە توندوتیژەکان ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئۆرۆستوکراتی دەخات، دەیوت کە شۆڕشی فەرەنسی باشترین نمونەی ئەمەیە.

بەڵام "بیرۆکە نوێیەکە" بەپێی لێکدانەوە شیکارییەکەی مارکس بە وەستاوی و نەگۆڕی نامێنێتەوە، بەڵکو دەستبەجێ، بیرۆکەی دژ بەخۆی دەهێنێتە کایەوە و ئا بەم شێوەیە بەردەوام دوبارە دەبێتەوە، هۆکارە ئابوریە چالاکەکان لە شۆڕشی پیشەسازیدا پێویستی بەوە بوو بۆ نمونە: بەردەوام سەرمایە زیاد بێت بۆ دروستکردنی کارگای فراوانتر و گەورەتر بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی باشتر بێت، لەبەر ئەوە وای لێ دێت ئەو کەسە کەمانەی کە ئەو سەرمایە زۆرەیان هەیە دەبنە چینی فەرمانڕەوای نوێو لەبەردەم ئەم جۆرە ئابورییە نوێیەی



کۆمەڵیشدا هیچیان بۆ ناکرێت، ئەوەندە نەبێت کە "گۆڕ هەڵکەنی" خۆیان دروست بکەن، ئەویش چینی نەیارەکانیانە، کە لە کرێکاری کارگەکان پێکدێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکات.

مارکس سەیری کرێکارانی دەکرد کە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان بە هۆی زۆری منداڵبون و زۆری ئەو گوندنیشنانەی دەچونە پاڵیان زیادی دەکرد، وا سەیری دەکردن کە بە لێشاو هەموو بەرەو "ورگە" برسیەکەی دەستەڵاتە پیشەسازییەکانی خۆرئاوا لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەبرێن. ئەو هەمیشە رای وابوو کە چینە سەرمایەدارە نوێیەکان –خاوەن کارگەکان – هیچ ئامانجێکیان نیە جگە لە قازانجی خۆیان نەبێت، ئەو "مەزانە" واتە کرێکارەکان کە هیچ زەوییەکیان نیە بەکاردەهێنن.

هەروەها رای وابو کە پیشەسازیە گەشەکردوەکان وردە وردە دەگۆڕێن بۆ دەست بەسەراگرتن و قۆرغ کردنی دەستکەوتەکان. موچەش ژیانێکی کولەمەرگی زیاتر بۆ کرێکارەکان دابین ناکات.

مارکس رای وابور کە پیاوانی کارە بچوکەکان ناچاردەبن کە کارەکانی خۆیان بپێچنەوەو پاڵبدەن بە چینی کرێکارەوە، لەبەر ئەوە ناتوانن بەرەنگاری ئەو هێزە ئابوریە بە توانایە بکەن کە خاوەن سەرمایە هەیەتی. ئیتر وردە وردە کۆمەڵگەش دابەش دەبێت بۆ دوو چینی ناکۆکی نوێ، ئەوانەش چینی کرێکاری قوربانی دەرو چینی خاوەن سەرمایەکانە کە دەیان چەوسێننەوە و ئازاریان دەدەن.

مارکس راشی وابوو کە بەهۆی ئەو گۆڕانکاریە ئابوریانە روودەدەن و لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە ئاشکرا دیاربوون کۆمەڵێك ناکۆکی لەناو چینی سەرمایەداریدا هەیەو دەیوت ئەو ڕێبازە پیشەسازیە نوێیانە دەتوانن ئەوەندە بەرهەم بهێنن کە لە بەکارهێنانی چینی سەرمایەدار خۆی زیاتر بێت، و زۆر زیاتریش لەوەی توانای کڕینیان هەبێت، و دەیوت "دەردی بەرهەمهێنانی زیاتر لە پێویستی" دەبێتە ناڕەواجی لە بازاڕدا، لە پاشدا ئەمەش دەبێتە هۆی بێکارییەکی زۆر و پەیداکردنی زۆرانبازی چینایەتی نوێی نێوان کرێکارو سەرمایەدار بە شێوەیەکی خێراتر و دەبێتە زۆرانبازییەکی تفت و تاڵ.

کاتێك بەرەنگاربوونەوە لەناو ریزەکانی کرێکاراندا بەهێز دەبوو، مارکس پێشبینی ئەوەی دەکرد کە سەرمایەداران دەزگای سیاسی بەکاردەهێنن بۆ لەناوبردنی ئەو بەرەنگاربونەوەیە. کاتێك بۆیان دەردەکەوێت کە ئەم ڕێبازە ئاشتیانە بەس نین بۆ ئەوەی ئەو کرێکارانە بخەنە ناو سنورەکانی خۆیانەوە ئەوسا سەرمایەداران روو دەکەنە بەکارهێنانی ئامرازەکانی ئەو هێزەی کە لەبەردەستیاندایە.. لەشکر و پۆلیس ئەوکاتە کرێکاران بە توندو تیژی هاواری روخاندنی رژێم دەکەن و داوای دروستکردنی "دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا" دەکەن کە هۆیەکانی بەرهەمهێنان بەناوی کرێکارانەوە بەدەست دەوڵەتەوە دەبێت.

مارکس بڕوای وابور کە ئەم شۆڕشە تەنها بەدەست چینێکەوە دەمێنێتەوە، ئەویش چینی کرێکارە، کە هەرگیز لە هیچ شۆڕشێکی لەوە پێشتردا رووی نەداوە، و هەموو چینەکانی دیکەش وردو خاش دەبن. ئەو بڕوای وابوو کە ئیتر پێدوایستی بۆ دەوڵەت خۆشی نامێنێت چونکە دەوڵەت ئامرازێکە بۆ زاڵ بوونی چینێك بەسەر چینێکی دیکەدا، ئەوەندەی پێناچێت– بەپێی قسەی لینین لەوە پاشتر– کە وردە وردە بچوك دەبێتەوە، شیدەبێتەوە، لە پاش خۆشی –وەك بیرۆکەیەك کە لە دوو بیرۆکەی دژ بەیەك پەیدا بوە– کۆمەڵێکی کۆمۆنیستی دروست دەبێت کە هیچ شوێنەواری چینایەتی تێدا نیەو سەرکەوتنی بەردەوامی رەوتی مێژوو دەنوێنێت.



لە شوباتی **1848**دا لە فەرەنساو ئەڵمانیا یەکەمین ئەو شۆڕشانە بەرپا بوو کە لە هەمان ساڵدا هەموو ئەوروپای گرتەوە، هەر لەو مانگەدا "بەیانی کۆمۆنیست" بڵاوبۆوە کە کارل مارکس دایناوبوو، لە راستیدا گرنگترین بڵاوکراوەی شۆڕشگێڕیە کە تا ئێستا لە جیهاندا دەرچوبێت. مارکس لەم بڵاوکراوەیەدا راڤەیەکی دوورودرێژی بۆ تیۆرەکەی خۆی نوسیوەو بەم گوزارشتەش کۆتایی پێ هێنا "کۆمۆنیستەکان ئەوە رادەگەیەنن بە ئاشکرا کە ئامانجەکانیان تەنها بە هەڵگەڕاندنەوەی بارە کۆمەڵایەتیە دامەزراوەکان بە هێز دێتە دی، بۆ ئەوەی سنگی چینە فەرمانڕەواکان بە هەڵگیرساندنی شۆڕشی کۆمۆنیست بێتە لەرزین. لەم شۆڕشەشدا کرێکاران هیچ نادۆڕێنن ئەو زنجیرانە نەبێت کە پێوەی بەستراونەتەوە.. ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن!!"

ئەمە بانگەشەیەکی ئاشکرا و دیاریوو بۆ شۆڕشێکی کرێکاری.. هەروەها لە بەیانەکەدا هاتبوو: "بێگومان لەسەر کرێکاران پێویستە، لە هەموو وڵاتێکدا کە کاروبارەکانیان لەگەڵ بۆرژوازیەکاندا یەکالا بکەنەوە!!" ئەم قسانە وا دەردەکەون هەروەک بانگەشەی زۆرانبازییەکی نیشتمانی بن، بەڵام لە راستیدا، بانگەشەی زۆرانبازییەکی جیهانی بوون.

لە پاشدا بڵاوکراوەکە دەڵێت: "کرێکاران نیشتمانیان نیە". ئەمە مانای ئەوەیە مارکس بانگەشەی بۆ ئەو بیروڕایە دەکرد کە حکومەتی دەوڵەتەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا تەنها ئامرازی سەرکوتکردن بوون بەدەست سەرمایەداریەوە.. و بزوتنەوەی کرێکاری نوێ سەر بۆ هیچ یەکێك لەو حکومەتانە دانانەوێنێت.

لەمەوە (بە پێی رای مارکس) هاریکاری لە نێوان کرێکارانی هەموو وڵاتەکاندا دروست دەبێت و گەشە دەکات، هەروەها بەشداریشیان لە دژایەتی کردنی حکومەتە نیشتمانیە سەرمایەدارەکانیشدا.

مارکس بڕوای وابو کە سەرکەوتنی ئەم شۆڕشە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی هێنانە کایەی کۆمەڵگایەکی جیهانی بێ چین و ئابورییەکی ئاراستەکراو.

چارەسەرەکانی مارکسیەت بۆ ئەو کێشانەی نیشتمانیەت و نەتەوایەتی دروستیان کردبوو بانگەشەیان بۆ ئەم رێبازە بەهێز دەکەن.

ئەو بڵاوکراوەیە لە لایەن کۆمەڵێکی جیهانیەوە کە نوێنەری فەرەنساو بەلجیکاو ئەڵمانیاو بەریتانیایان تێدا بو بڕیاریان لەسەردا، لە پاش پانزە ساڵ دوای ئەو،ش مارکس خۆی "کۆمەڵەی جیهانی بۆ کرێکاران" -جیهانی دووەم- دروست کرد. بەپێی قسەی یاریدەدەرەکەی ئنگلز مەبەستی لەوە بوو کە "لەشکرێکی یەکگرتووی توندوتۆڵ لە چینی کرێکارانی ئەوروپاو ئەمەریکا" دروست بکات.

واتە مارکس نەك هەر تیۆرەکەی بڵاوکردەوە بەڵکو پلانێکی بۆ شۆڕشێکی سپی جیهانیش راگەیاند، لەم بارەیەوە دەڵێت: "لێکدانەوەی کاروبارەکانی جیهان، تا ئێستاش، هەر فەیلەسوفەکان کردویانە ئێستا ئیتر پێویستە رووی جیهان بگۆڕین"

**سەرچاوە:**


*تشستر بولز، "قضية السلام"، ترجمە: جورج عزيز. دار المعارف بمصر، ص 44- 53.*



# مارکس پاش مارکسیزم

■ بابەك ئەحمەدی

● و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

"کاری هەر فەیلەسووفێك چەند گەورەتر بێت (کە بە هیچ جۆرێك بە گوێرەی فراوانی و ژمارەی نووسینەکانی ناپێورێ) شتە بیرلێنەکراوەکان لە کاری ئەودا زیاتر دەمێننەوە. مەبەست لە هەموو ئەو شتانەیە کە لە سای کارەکەی ئەوەوە بۆ یەکەمجار هاتوونەتە ئاراوە، بەڵام هێشتا شێوەی بیرلێنەکراوەیان بەخۆیانەوە گرتووە".

**مارتن هایدیگەر**

## 1-ئایا کارل مارکس زیندووە؟

یۆنسکۆ لە ساڵی *1964*دا و لە پاریس کۆنگرەیەکی لەژێر ناوی "کێرکیگاردی زیندوو"دا سازدا، یەکێك لە بەشداربووەکانی ئەم کۆنگرەیە ژان پۆڵ سارتەر بوو. ئەو لە سەرەتای وتارەکەی خۆیدا رایگەیاند کە ناونیشانی کۆنگرەکە نەدەبووایە بۆ فەیلەسووفێکی بە راستی زیندوو بەکار ببرێ. ئەم حوکمە مەجازییە کە کێرکیگارد زیندووە، واتە ئەو بە مانا جەستەییەکە مردووە بەڵام بیری زیندووە. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە حوکمدانی لەمجۆرە خۆی لە خۆیدا ئەوە پیشان دەدات کە کەسانێك سەبارەت زیندوویێتی واتە کاریگەری و کارایی بیری ئەو فەیلەسووفە گوماندارن و، جەخت کردنەوە لەسەر وشەی زیندوو لە راستیدا وەڵامێکە بۆ ئەو گومانە. خاڵێکی تریش ئەوەیە کە ئەمە سەبارەت بە حوکمدان لەسەر "مارکس زیندووە"ش تەواو راستە.

بە هەرەسی کۆمۆنیزم لە یەکێتیی سۆڤێت و ئەورووپای خۆرهەڵات و، لە نێوچوونی ئەو رژێمانەی کە خۆیان بە "حکومەتی زەحمەتکێشان" و "دەسەڵاتی شووراکان" و "دیموکراسیی خەڵك"ی تۆتالیتاری دەزانی و، لافی ئەوەیان لێدەدا کە توانیویانە سیستمێکی سۆسیالیستیی راستەقینە دابمەزرێنن، رەخنەگرانی ئەم رژێمانە وای بۆچوون کە ئەو تیۆرە کۆمەڵایەتی و سیاسیەی ئەم سیستمە بە دەربڕی راستیی بوونی خۆی و هۆی سەرەکیی رەوایەتیی خۆی دەزانی، بۆ هەتا هەتایە لەناوچوو و نەما. سەرچاوەی سەرەکیی ئەم تیۆرەیەش، کار و بیروبۆچوونەکانی بیرمەندێکی ئەڵمانی بوو کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا دەژیا و زۆرترین ساڵانی کاری



فیکریی خۆیشی لە تارلوگەو لە لەندەندا بەسەر بردبوو و، بە پێی دەقی نووسینەکانیشی دەتوانین بڵێین کە تەنانەت تەسەوری پەیدابوون و مانەوەی ئەمجۆرە ڕژێمانەشی نەدەکرد. لە هەشتاکانیشدا کە ئاسۆی هەرەسی کۆمۆنیزمی ڕووسی هاتبووە بەرچاوان و، بەرەنگاریی خەڵك تەنانەت لە شێوەی یەکێتیی سەربەخۆی کرێکاریدا بەرامبەر بە ستەمی ستالینی لە ڕووسیاو ئەورووپای خۆرهەڵاتدا خۆی بینییەوەو تەشەنەی کرد، گەلێ لە نووسەران و ڕۆشنبیران مەرگی فیکری کارل مارکسیان ڕاگەیاند. بە بۆچوونی ئەم نووسەرو ڕۆشنبیرانە شکستی ئەو ئەزموونەی کە لە نۆڤەمبەری *1917*ەوە لە ڕووسیادا دەستی پێکردو لە ڕێی سەرکوتکردنی خوێناویی نەیارانییەوە درێژەی بەخۆی داو، دروستکەری ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێ، سیستمی تاکحیزبی لە حکومەتداو، ڕێکخراوی پۆلیسی و ئەمنی بوو کە لە دەسەڵاتدا بێهاوتا بوون و، هەموو جۆرە ئازادییەکی بیرو پێکهێنانی حیزب و سەندیکایان قەدەغە کردبوو، یەکسان بوو بە مەرگی تیۆرە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی کارل مارکس. ئەوانەی باوەڕیان بە مەرگی ئەم فیکرە هێناوە ئێستا لە سای دەسەڵاتی ڕژێمێکی سیاسی و ئابووریی نوێی لیبراڵدا دەژین و، دەبینن کە حیزبە سۆسیالیست و سۆسیال دیموکراتەکانی ئەورووپا پەیڕەوی لە سیاسەتە لیبراڵیەکان دەکەن و، دڵنیابوون کە گۆڕانکارییە پێویستەکان لەناو ئەم سیستمە ئابوورییەو ئەم ژیانە کۆمەڵایەتی و سیاسیە نوێیەدا بە شێوەیەکی ئۆتوماتیکیانە لەناو دڵی سیستمەکە خۆیدا ڕوودەداتو، بە هیچ جۆرێك پێویستی بە هێزی سەرکوتکەرانەو نادیموکراتیکی وەکو سۆسیالیزمی مارکسی نییە.

ئایا ئەمانە لەسەر هەقن؟ ئایا فیکری مارکس لە هەموو ڕەهەندەکانیدا سەرکوتکەرانەیە؟ ئایا بە ڕاستی ئەو فیکرە هیچ کاریگەرییەکی نەماوەو مردووە؟ واتە هیچ پەیامێکی بۆ ئەم سەدەیە پێ نییە کە تازە پێمان تێناوە؟

ئەوانەی کە مەرگی تیۆرەکانی مارکس ڕادەگەیەنن[1] لە خاڵێکی گرنگدا لەگەڵ دەسەڵاتداران و بیرۆکراتە سەرکوتکەرەکان و تیۆرەسازە حیزبیەکاندا هاوبۆچوونن: ئەوەی بە درێژایی دەیەکانی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان ڕووی دا، ئەنجامی مەنتیقی یان دەرکەوتەی مێژوویی فیکری مارکس بوو. ئەو تیۆرەسازەی کە بە ڕای ئەوان کاری خۆی بە ئازادیی بێ سنوور دەست پێکردو بە ستەمی بێ سنوور کۆتایی هات. بەڵێنی بەهەشتی دەداو دۆزەخی دەخولقاند، باسی ئازادیی مرۆڤی دەکردو خولقێنەری دیکتاتۆری بوو. بەناوی یەکسانیی خەڵکەوە بەرگریی لە کۆڵەکەکانی کۆمەڵگایەك دەکرد کە لە لووتکەکەیدا کۆمەڵێك کەسانی هەڵبژاردەو ڕابەرانی حیزب لە هەموو شتێکی تایبەت و خۆشگوزەرانیی ئابووری بەهرەمەند بوونو، لە بنکەکەشیدا خەڵکی ڕەش و ڕووتی بێ پەناو داڵدە هەبوون.

ئایا مارکس بە ڕاستی ئەمەی دەویست؟ ئایا پاساوی بۆ ڕژێمی تاکحیزبی دەهێنایەوە؟ ئایا تێگەیشتنی ئەو بۆ سۆسیالیزم ئەم دۆزەخە بوو؟ ئایا ئەو بەرگریی لە پیشەسازیبوونی خێرا دەکرد بەهەر نرخێك بووایە، بەرگریی لە سەرمایەگوزاریی درێژخایەن دەکرد لە کەرتی بەرهەمهێنانی کاڵای سەرمایەیی، یان لە پەرەسەندنی پیشەسازیی عەسکەری و سەرکوتکردنی خواستەکانی خەڵکی عەوام بۆ خەرجی و خۆشگوزەرانی؟ زۆر کەس لەو باوەڕەدان کە تەنانەت گەر مارکس خۆیشی ئەمانەی نەویستبێت، یان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بانگەشەی بۆ نەکردبن، بەڵام ئەنجامی مەنتیقیانەی تۆژینەوەو تیۆرەکانی جگە لەمانە هیچی تریان لێ نەکەوتەوە.



ئەوانە دەڵێن مارکس لە باشترین حاڵەتیدا، ڕێك بە پێچەوانەی مافیستۆوە کە لە سەرەتای شانۆنامەی "فاوست"دا بەمجۆرە خۆی ناساندبوو: "بەشێك لەو هێزەی کە بەردەوام شەیتانی دەوێت و بەردەوام چاکە دەخولقێنێت"، ئەو چاکەی دەویست، بەڵام بەردەوام خراپەی دەخولقاند.

فیکری مارکس لە سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی ناکۆکانە هەم ئامرازی ئازادی بوو و هەم ئامرازی ستەم. خەڵکانێکی زۆر هەر لەبەر ئەوەی وەفایان بۆ جۆرە تێگەیشتنێك و لێکدانەوەیەکی بیروباوەڕەکانی مارکس بووە؛ لە زیندان و شوێنەکانی ئەشکەنجەداندا پێشوازییان لە مەرگ کردووە. زۆر کەس دوورخرانەوە، بۆ هەمیشە لە مافە کۆمەڵایەتییەکان بێبەش کران، بیرو کارەکانیان سانسۆر کرا، تەنها لەبەرئەوەی پێیان لەسەر بیروباوەڕی مارکسیستیانەی خۆیان دادەگرت. بەرامبەر بەمەش لە هەمان سەدەدا چیەها زیندان و ئۆردوگاو جێی ئەشکەنجەدان دروستکران تا نەیارانی ڕژێمە لینینیو ستالینی و ماوییەکان و هتد.. بەناوی دژایەتیکردنی مارکسیزمەوە تیایاندا لەناو ببرێن. لە سەرێکەوە ڤیتکۆنگەکان بۆ سەربەخۆیی و تێگەیشتنی خۆیان لە ئازادی و لە ڕێی لێکدانەوەی خۆیانەوە بۆ هزری مارکس لەگەڵ گەورەترین هێزی سەربازی و هێرشکەری مێژوودا جەنگان، لە سەرێکی تریشەوە خەمیرە سوورەکان بەناوی هەمان مارکسەوەو لە سای لێکدانەوەی هەندێ بیروبۆچوونی ئەو کە لە لێکدانەوەی ڤیتکۆنگەکانیش زۆر جیاواز نەبوو، ملیۆنەها مرۆڤیان کوشت.

هیگل کاتی خۆی باسی فێڵی ئەقڵ و گاڵتەپێکردنی مێژووی دەکرد، چ فێڵ و گاڵتە پێکردنێك بووە هۆی ئەوەی ئەم بەڵایە بەسەر فیکری مارکسدا بێت؟

بە بڕوای من لە ڕێی لێکۆڵینەوەوە لە بەشداریکردنی مارکس لە فۆرمەلەی چەمکی مۆدێرنی سیاسەتداو، بە تایبەتیش لێکۆڵینەوە لە کەموکورتیەکانی ڕوانگەی تیۆرەیی ئەو سەبارەت بە دیموکراسی و دەوڵەتی دیموکراتیکی بۆرژوایی، دەکرێ تا ڕادەیەك ئاسۆی ئەو مەسەلانە ڕوونبکەینەوە کە لەم پرسیارەوە پەیدا دەبن.

بەهەرحاڵ، هەر ئەم ڕاستییە کە هێشتا ئێمە بە شێوەیەکی فراوان سەبارەت بە ڕۆڵی مارکس لە پێکهاتەی سیاسەتی مۆدێرندا بیردەکەینەوەو، هەروەها کاتی خۆمان بۆ خوێندنەوەی کارە دژوارەکانی تەرخاندەکەین و، باس و لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرەکانی کەسانی دی لەم بارەیەوە بەهەند وەردەگرین و، لە زمانی کەسانێکی ناوداری دونیای فەلسەفەو زانستە مرۆییەکانەوە کە ئاراستەی فیکریی جیاجیایان هەیە، لە کەسانێکی وەکو: ماکس ڤیبەر، ئێرنست بلۆخ، تیۆدۆر ئادۆرنۆ، ماکس هۆرکهایمەر، ڤاڵتەر بنیامین، هێربرت مارکۆز، یۆرگن هابرماس، میخاییل باختین، کۆرنیلۆس کاستۆریادیس، کلۆد لیفۆر، پیر بۆردیۆ، میشیل فۆکۆ، ژاك دێریدا، ژان فرانسوا لیوتار، پیرو سرافا، ئەنتۆنیۆ نگری، هنری لۆفیڤەر، ڕایمۆند ویلیامز، ئەنتۆنی گیدنز و.. دەبیستین کە هەرکامیان دەگریت بۆ ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی تۆژینەوەو تێفکرین بووە لە کارەکانی مارکس، یان هەندێکیان لە هەندێ لایەنی تیۆرەکانی خۆیاندا سوودیان لە مارکس وەرگرتووە، هەموو ئەمانە ئەوەمان پیشاندەدەن کە فیکری مارکسیش بە هەمان مانای زیندوێتی بیروباوەڕەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆ کانت و هیگل زیندووە.

دەتوانین بە ئاسانی لەوە بگەین کە مارکس لە شیکردنەوەی هەندێ لە مەسەلەکانی سەردەمی خۆیداو، بەتایبەتیش لە ناسینی هەندێ لە ئاراستە



سەرەکییەکانی بزاوت و گۆڕانی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا بە هەڵەداچووە. هەندێ لە خوێنەرانی ئەمڕۆی کارەکانی ئەو، مەسەلەی زانستباوەڕیی، ڕیالیزمی فەلسەفیی ناڕەخنەگرانەو، لایەنە پۆزیتیڤیستیەکان و، تەنانەت ئەو گیانی مرۆڤخوازی (هیومانیستی) یە ڕۆشنگەرانەیەی لەمانەدا هەیە، لە هەمووش گرنگتر، بونیادی میتافیزیکیانەی ڕوانینی فەلسەفیی ئەو بە ناڕاست دەزانن. باوەڕی ئەو بە سروشتی کۆمەڵایەتیانەی ئادەمیزاد، باوەڕ نەبوونی بە ئاشوویر دەروونی و ناوەوەیی مرۆڤ و، وێڕای تەقەللای ئەو بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو ئاشووبەشدا، زۆر کۆنخوازانە دێتە بەرچاو. ئەو ڕوانینە مەسیحیانەیەی ئەو بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ هەیبوو، ئەو وێنایەی ئەو بۆ ڕزگاری و بەختەوەریی ئادەمیزادی دەکرد لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا، کۆمەڵگایەك کە هێندەی ئەو یۆتۆپیانەی بیرمەندانێك خەیاڵی و تەنانەت پێکەنینهێنەریش بوو کە ئەو بە بچووك سەیری دەکردن، ئەسەورێکی دەخولقاند کە دەیزانی چۆن ڕزگاری و نۆخی سروشتیی داواکراوو دروست و بابەتیانەی خەڵك دەمێنێتە ئاراوەو، ئەو بزاڤە ڕزگاریخوازەی کە لەسەر ئەم بناغەیەش پێشبینیی دەکرد، هەموو ئەمانە جێی گومانلێکردن و، قابیلی قبوولکردن نین.

ڕەخنەیان لە مارکس گرتووە کە بناغەی هزری لەسەر هۆکارێتیی ئابووری دامەزراوەو، هەر گۆڕانێکی سەرخانی گەڕاندۆتەوە بۆ گۆڕانەکانی بونیادی ئابووری.

هەروەها دەڵێن کە ئەو باوەڕی بە حەتمیەت هەبووە، واتە دیتێرمینیست *determinist* بووەو، هەموو شتێکی بۆ یەك هۆکار گەڕاندۆتەوە؛ نەك چەند هۆکارێك و، لەم ڕووەشەوە دەتوانین بە ئاشکرا کەموکورتیی ئەو ڕوانینەی هەست پێ بکەین. ئەو ئادەمیزادی بە دیلی دەست نۆخە مێژووییەکان لە قەڵەمدەداو، نرخی بۆ مرۆڤی لێکدانەوەخواز (تەئویلخواز) دانەدەنا. وتراوە کە ڕوانینی جەبرییانەی ئەو گەیاندییە شوێنێك باوەڕی بەوە هێنا کە وەختێ ڕژێمێك نەما دەبێ ڕژێمێکی دی جێی بگرێتەوە. بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەوەوە پەرەسەندنی هێزە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان، هۆکارو بەدیهێنەری خۆشبەختی نی‌یە بۆ مرۆڤ. ئەو قەفەسە ئاسنینەی کە ماکس ڤیبەر باسیدەکات، پیشانیداوە کە مەسەلەکە زۆر لەوە زیاترە کە بە تەنها پشتبەستوو بێت بە هۆکاری مادیی پێشکەوتنەوە. دیسانەوە وتوویانە کە مارکس هەرگیز نەیتوانی پەی بەوە بەرێت کە مەرج نی‌یە بە نەهێشتنی موڵکدارێتیی تایبەتی چەوساندنەوەش نەمێنێت. لێکۆڵینەوەکان سەبارەت بە سەرمایەداریی دەوڵەتی، بە ڕەچاو کردنی ئەزموونەکانی یەکێتیی سۆڤێت و چین و، تەنانەت بە ڕەچاوکردنی هەندێ لە پەیڕەویکارە یەکلابینەکانی مارکس خۆیشی، ئەو ڕاستیەیان پیشاندا کە گۆڕان لە شێوەی موڵکداریدا، گرنگتر نی‌یە لە زەرورەتی گۆڕان لە پێکهاتە (یان دەزگا) سەرخانی و سیاسیەکاندا. ئەنتۆنیۆ گرامشی کە یەکێکە لە گەورەترین بیرمەندە "مارکسیست"ەکان، پاش ئەزموونی شۆڕشی ڕووسیا؛ نووسیی کە مەسەلەی سەرەکی گۆڕان لە دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا و مەسەلەکەش لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە بە زۆر چارەسەر ناکرێ. لە کاتێکدا مارکس "دوا ئامانج (*Endzweck*)ی بزاڤی سیاسی"ی بەو زۆرەی دەسەڵاتی سیاسی لە قەڵەم دەدا[2]. هەندێ لەم تۆمەتانە ڕاست دێنە بەرچاو، دەربارەی هەندێکی تریشیان دەکرێ قسە بکەین و ئەوە بخەینە ڕوو کە لانی کەم ئەم تۆمەتە توندانە بە ڕواڵەت لە جێی خۆیاندا نین. بەهەرحاڵ، بە ڕەچاوکردنی ئەم ڕەخنانە دەتوانین ئەو ماوە زەمەنیە زۆرەش



لەبەرچاو بگرین کە لە نێوان مارکس و ئەم سەردەمەی ئێمەدایە.

ڕوانینی مارکس بۆ کۆمەڵێك مەسەلەی وەکو بزاڤی سەربەخۆیی ئافرەتان؛ زۆر سنووردارو "ڤیکتۆریایی" دێتە پێشچاو، زمانی ئەو بە بەراورد بە ئەمڕۆ، پڕە لە دەستەواژەو مەجازی دژە ئافرەت، لە کارەکانیدا چاومان بە ڕستەو گاڵتەجاڕیی دژ بە جوولەکە دەکەوێ، بە چاوێکی کەمەوە سەیری هەندێ ڕووداوی وێرانکەرانەی پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیی کردووەو، بڕوا نەبوونی بە ئیمکانیەتی پەیدابوون و حوکمکردنی دەوڵەتی دیموکراتیکی بۆرژوایی، بە نادروست دێتە بەرچاو.

ئاشکراشە کاتێ ئەو باسی لە ڕێسای "دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا" دەکرد؛ بەرگریی لێ دەکردو، تەنانەت بە دەسکەوتێکی تیۆرەیی کاری خۆی دادەنا، ئێستا دەبینین کە ئەم ڕێسایە لای خوێنەری بیرئازادی ئەمڕۆ دەبێتە مایەی چ پەرچەکردارێکی توند. تەنانەت ئەگەر وەهاش بڕوانینە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کە ئەو مەبەستی بووە، واتە "دیکتاتۆریەتی زۆریەی کەسانی کۆمەڵگا"، دیسانەوە ئەمە لە گوتاری سیاسیی ئەمڕۆدا شتێکی ناپەسەندەو ناتوانین بەرگریی لێ بکەین. ژمارەیەك لە پەیڕەویکارانی مارکس پێیان وا نی‌یە کە تیۆرەی هەژاریی ڕوو لە زیادبوونی چینی کرێکار دروستکراوی مارکس بێت، بەڵام دەتوانین بە گوێرەی ئەزموونی مێژوویی نادروستی‌ی ئەو ئەنجامانە بسەلمێنین کە پشت بە بیرۆکەی دوو جەمسەریی کۆمەڵگای مۆدێرن دەبەستێت. نابێ لە ڕووی کاڵفامی و دەمارگیرییەوە پاساو بۆ هەر هەڵەیەکی تیۆرەیی و، هەر پێشبینی‌یەکی نادروستی ئەو بهێنینەوە. بەڵام چ فەیلەسووف و تیۆرەسازێکیش هەیە کە بە هەڵەداچوونی نەبووبێت‌و، هەرچییەکی وتبێت لە بواری ئەزموونی کردەیی و مێژووییدا ڕاست دەرچووبێت؟

ئایا ئێمە بە مەرجی ڕاست و دروستی‌ی تەواوەتی بیرو بۆچوونێك؛ لێی ورد دەبینەوە؟ ئاخۆ نابێ ئێمە ئەوەمان قبووڵ بێت کە دەشێ هەڵە بکەین؟ ئایا لەبەرئەوەی کە ئەرستۆ کەسێکی پیاوسالار بووەو لەوە دەچێت کە تەنانەت گومانی لە ئینسانبوونی ئافرەتیش هەبووبێت، یان لەبەر ئەوەی کانت بە چاوێکی نزمەوە سەیری قولەڕەشەکانی کردووە؛ ئیدی پێویستمان بەوە نی‌یە لە کارەکانیان تێبفکرین؟ هەندێ لە بیرمەندە بەناوبانگەکان چ لە تێزە فەلسەفی و زانستیەکانیاندا، یان لە بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و سیاسییانداو، یان لە زەمینەی میتۆدیانداو، تەنانەت لە بواری کردەییشدا، هەڵەی گەورەیان کردووە، بەڵام ئێمە (وا بە ئاسانیش نا) ئەوەمان لا قبووڵە کە ئەمە هەمووی نرخی ڕیسك (خۆخستنە خەتەرەوە)یە لە مەیدانی بیرداو، هەر بۆیەشە ئەوانە لە ئاسۆی مەعریفی و لێکۆڵینەوەی خۆمان دوور ناخەینەوە، پێویستمان پێیانەو، لە هەندێ ڕووی تایبەتیشەوە قەرزاریان دەبین. دەزانین کە ئەو شتەی لە کاری فیکریی ئەواندا ڕاست دێتە بەرچاو و یاریدەمان دەدات، هەمیشە (یان زۆریەی جار) خاڵی نەبووە لە هەڵەی تیۆرەیی و فیکری و تەنانەت ئاکارییش. هەر لەبەر ئەمە، مارکسیش لای ئێمە زیندووە، لەگەڵیدا گفتوگۆ دەکەین، سوود لە کارەکانی وەردەگرین و، لە هەمانکاتدا، بۆ تاوێکیش چی‌یە دەمی تیژی تیغی ڕەخنەی لێ دوور ناخەینەوە.

میشیل فۆکۆ جارێکیان وتوویەتی: "مارکسیزم وەکو ماسی‌یەك وایە کە لە ئاوی سەدەی نۆزدەیەمدا مەلە دەکات، ئەم ماسییە لە ئاوی سەدەی بیستەمدا دەمرێت". ئەم کتێبە هەوڵدەدات ڕاستی‌ی ئەم



**حوکمەی فۆکۆ دەربارەی بیرو بۆچوونەکانی مارکس خۆی نەك مارکسیزم؛ تاقیبکاتەوە.**

ئەزموونی واقیعی و کردەیی، کە پێودانێك بوو مایەی پەسەندیی مارکس خۆیشی بوو، ڕاستیی ئەم قسەیەی فۆکۆ دەسەلمێنێت مادامەکی مەبەستی لە مارکسیزمە، بەلام کاتێ ڕووبەڕووی بیرمەندێك، فەیلەسووفێك یان زانایەك دەبینەوە کە دەشێ هەولدان بۆ دەرکی بنەما فیکرییەکانی، وروژێنەری پرسیاری تازە بێت، ئەوکات چاوپۆشین لە کاری فیکریی ئەو، بەو لافەی گوایە ئەو فیکرە مردووە، دەبێتە کارێکی نازیرانە. ئێمە دەبێ بتوانین بیروڕاکانی ئەو بیرمەندە بگوێزینەوە بۆ ڕۆژگاری خۆمان و، بە دابڕانیان لە لێکدانەوەکانی جارانیان؛ بیریان لێبکەینەوە. لە هەمووش گرنگتر، دەبێ لە توێژینەوەماندا بۆ کارەکانی بایەخ بەم خالەش بدەین: شتە بیرلێنەکراوەکان لە کارەکەی ئەودا چین؟

## 2-"پرسیار تەقوای فیکرە"

بە وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕستە بەناوبانگەی هایدیگەر لە کۆتایی ئەو وتارەیدا کە سەبارەت تەکنۆلۆژیا نووسیویەتی، هەولدەدەم ئەوە پیشانی خوێنەر بدەم کە بۆچی بناغەی ئەم کتێبەی لە بەردەستیدایە پرسیارکەرانەیە، نەك وەلامدەرەوانە. یەکێك لە ئامانجەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە بواری بیرکردنەوە لە پرسیارەکان فراوانتر بکاتەوە لەوەی کە هەیە. لەم خوێندنەوەیەی نووسینە سیاسیەکانی مارکسدا هەولدەدەم پرسیارە گرنگەکان بخەمەڕوو: ئایا ئەو چەمکی ئازادییەی مارکس هێشتا بایەخی هەیە یان نە؟ ئایا لە سیاسەتی مۆدێرندا شوێنێك هەیە کە بەبێ گرنگیدان بە هزری کۆمەلایەتی و سیاسیی مارکس بناسرێ؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەم دوو پرسیارە سەرەکیەدا دەتوانین درێژە بە ڕەوتی پرسیارەکان بدەین و، بگەینەوە هەمان ئەو پرسیارەی کە ئەم دەقە لێوەی دەستی پێکردووە: ئایا بە ڕاستی هزری مارکس کاریگەریی نەماوەو ئیدی هیچ پەیامێکی بۆ ئێمە پێ نییە؟ وەختێ بیر لەو پرسیارەی سەرەوەش دەکەینەوە، ڕستێك پرسیاری دی دێتە پێشێ: لێکدانەوەی کۆمۆنیزمی ڕووسی بۆ تیۆرەکانی مارکس (واتە لینینیزم) تا چ ڕادەیەك لە ڕاستیی هزری ئەوەوە نزیکە؟ ئایا دەتوانین بلێین کە "مارکسیزمی خۆرئاوایی" لێکدانەوەیەکی نزیکتر بۆ دەقی بیروڕاکانی مارکس دەخاتەڕوو؟ ئایا مارکسیزمی خۆرئاوایی زاراوەیەکی وردە؟ ئایا ئەمجۆرە ناونیشانانە نابنە هۆی ئەوەی کە لە کاری تیۆرەسازاندا جیاوازییە فیکرییەکان فەراموش بکرێن؟ لە سەرێکی ترەوە، ئایا دەتوانین هزری مارکس وەك ئەوەی کە هەبووە؛ لە دەرەوەی لێکدانەوەکانی وەچەکانی دواتردا؛ بناسین؟ ئایا خستنەڕووی لێکدانەوەیەکی گۆڕانکارییانەی تری هزری ئەو شتێکی شیاوە؟ ئەم پرسیارەیان ناکاو بەرەو ڕووی کۆمەلێك پرسیاری سەرەکی و دژوارمان دەکاتەوە: ئایا دەتوانین میتۆدەکەی مارکس لە ناوەڕۆکی ئەو قسانە جیابکەینەوە کە کردوونی؟ ئایا نوێکارییەکەی مارکس بە تەنها کورت دەکرێتەوە بۆ "مەسەلەی میتۆد"؟ ئایا دیالەکتیکی مارکسی ڕێ دەدات کە بە ئاسانی میتۆد لە ناوەڕۆکی لێکۆلینەوەکان جیا بکەینەوە؟ لە ڕێی گرنگیدانمانەوە بە کارە ئابوورییەکانی مارکس چۆن دەتوانین بە شتبوون (تشیؤ)ی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بەسەر پەیوەندییە سەرەکیەکانی نێوان مرۆڤەکان لە ژیانی مۆدێرندا بچەسپێنین؟ چۆن دەترانین ڕەخنەکانی مارکس لە مۆدێرنیتە بگوێزینەوە بۆ بواری هزری پۆست مۆدێرن؟ ئایا مارکس بیرمەندی تەکنیك بوو؟ ئایا تیۆرەیەکی داهێنراوی لە فەلسەفەی مێژوودا خستۆتە ڕوو؟ لێرەدایە کە دووبارە دەپرسین:



بەشداریکردنی مارکس لە فۆرمەلەی چەمکە سەرەکیەکانی سیاسەتی مۆدێرن و تیۆرەی کۆمەلایەتی و کۆمەڵناسیدا؛ چی بوو؟ لێکدانەوەی ئەو بۆ ئەقڵانیەت و دەربڕینی بۆ نائەقڵانیەتی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان چی بوو؟ لە ڕوانگەی ئەوەوە واقیعیەت و هەروەها سنووری ڕیالیزمی فەلسەفی چی بوو؟ ئەو بە چیی ئەوت حەقیقەت؟ پاشان ئایا تێگەیشتنی ئەو لە حەقیقەت بۆ ئێمە کە پاش نیچە دەژین و بیردەکەینەوە؛ هیچ سوودێکی هەیە؟ ئایا مارکس هیومانیستێکی سەدەی هەژدەیەم بوو، یان زانستخوازێکی سەدەی نۆزدەیەم؟ ئایا ماتێریالیزمەکەی ئەو کە بڕیار بوو نادۆگماتیک بێت و بەدەربێت لە سروشتخوازیی فۆیرباخی؛ هێشتا کارێکی لێ دەوەشێتەوە؟ ئایا تێگەیشتنە فەلسەفیەکانی ئەو بۆ دیالەکتیك، زانین، هەست، ماددەو.. هێشتا شیاوێتیەکیان هەیە؟ ئایا ڕوانینی ئەو بۆ سروشتی ئادەمیزاد مایەی پەسەندکردنە؟

ئاشکرایە کە ئەم پرسیارانە بە پەلە وەلام نادرێنەوە، بەلام هەر یەکێکیان دەرگا لەسەر کۆمەڵێك مەسەلەی تازەو کێشەی فیکری دەکاتەوە. لەم کتێبەدا بە تەنها لایەنێکی تایبەتی لەو مەسەلانەو هەندێ لەو پرسیارانە خراونەتەڕوو. هەوڵ دەدەم هەر لە ڕێی نووسینەکانی مارکس خۆیەوە لە توژینەوەی ئەو لەسەر ئەقڵی سیاسی، ئازادیی سیاسی، یەکسانیی مرۆیی و چەمکە سەرەکیەکانی تری وەك ئەمانە بگەم. کتێبەکە لەم ڕوانگەیەوە دەیەوێ لە زەمینەی پرسیارەکان ڕابمێنێت: ئایا هزری ڕەخنەگرانەی مارکس بە کەلکی تێگەیشتنی گرفتەکانی مۆدێرنیتە دێت؟ ئایا دەتوانێ لانی کەم وەلامی هەندێ لە مەسەلەکانی ئەمڕۆ؛ واتە ڕۆژگاری نیهیلیزمی تەکنۆلۆژی، بداتەوە؟ ئایا دەتوانێ لە بنیاتنانی ئاڵتەرناتیڤێکدا بەرامبەر سیستمی نوێی جیهان و سیستمی لیبرالیی نوێ هاریکاری بکات؟ ئایا ئەوەی کە دەیڤید ماك لیلان دەیڵێت، بەوەی کە هزری مارکس کاریگەرترین هزرە لەسەر تەواوی زانستە مرۆییەکانی سەدەی بیستەم؛ لاف و زێدەڕۆیی نییە؟ ئایا تارمایی مارکس هەروەکو ژاك دێریدا وتوویەتی هەرەکو تارماییەکەی باوکی هاملێت لەوە ئاگادارمان ناکاتەوە کە حەقیقەت چییەو، ڕێی کارکردن کامەیە؟

**3-گرنگیی مارکس:**

جۆرج لۆکاچ کە یەکێکە لە گرنگترین ئەو بیرمەندانەی کە لە بواری قسەکردن لەسەر "مارکسیزمی خۆرئاوایی" پەیدابوون، لە سەرەتای بەشی "بە شتبوون و هۆشیاریی پرۆلیتاریا"دا لە کتێبی (مێژوو و هۆشیاریی چینایەتی)دا نووسیویەتی: (شتێکی ڕێکەوت نییە کە مارکس ناچاربوو بە شیکردنەوەی کالا کاری خۆی دەستپێبکات، کاتێ ویستی لە دوو کارە گەورەکەی قۆناغی کامڵبوونی فیکریدا؛ وێنەیەکی تەواوی کۆمەڵگای سەرمایەداری و سروشتی بنەڕەتیانەی ئاشکرا بکات. لەبەرئەوەی لەم قۆناغەی ئێستای پەرەسەندنی مرۆییدا، هیچ پرسیارێك نییە کە لە دواییدا بۆ ئەم بابەتە نەگەڕێتەوەو، هیچ پرسیارێکیش نییە کە لە ڕێگەچارەی مەتەڵی بونیادی کالادا وەلامی نەدرێتەوە.. نابێ مەسەلەی کالا وەکو شتێکی لاوەکی، یان تەنانەت وەکو مەسەلەیەکی سەنتەریی ئابووری تەماشای بکەین، بەلکو پێویستە وەکو مەسەلەیەکی سەنتەری و بونیادیانەی کۆمەڵگای سەرمایەداریی لە قەڵەم بدەین، لە تەواوی لایەنەکانیدا. بە تەنها لەم حاڵەتەدایە کە دەتوانین بونیادی پەیوەندییە کالاییەکان بە نموونەی هەموو شێوە بابەتیەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری و لە هەمانکاتدا هەموو



شێوەکانی هۆشیارییان بزانین". ئەم بیرۆکە سەنتەرییە کە بەرهەمهێنانی کالا لە پرۆسەو گۆڕانەکانی ئابووریی بازاڕی ئازاددا مەسەلەیەکی تەوەرەیی و بونیادییانەی مۆدێرنیتەیەو، هەروەها ئەنجامە تیۆرییەکەی ئەمەش واتە بەرجەستە کردنی بونیادی پەیوەندییە کالاییەکان وەك دەرکەوتەو نموونەیەکی گشتیی تەواوی شێوەو پەیوەندییە بابەتییەکان و گشت دەسکەوتە خودییەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن (ئەوەی کە پێی دەڵێین کەلتووری مۆدێرن) ڕێمان بۆ خۆشدەکات تا پەی بە نهێنییەکانی بەشتبوونی گەوهەریی پەیوەندییەکانی ژیاری مۆدێرن، نامۆبوونی مرۆڤ بەرامبەر بە بەرهەمەکەی خۆی و بەرامبەر مرۆڤەکانی دیکەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و، نامۆبوونی بەرامبەر بە خودی خۆی بەرین.

ئەم دووانەش هەردووکیان دەسکەوتی کاری فیکریی مارکسن و، لە تۆژینەوەی قەیرانی مۆدێرنیتەدا ڕێنوێنن. تێگەیشتنی مارکس لە بەشتبوونی هۆشیاری لە سەردەمێکدا کە بیر لە پێشکەوتنی هزری فەلسەفی و زانستی دەکەینەوە لە ڕۆژگاری مۆدێرندا، سەرلەنوێ خۆی دەخاتەوە ڕوو. ئەوەی ئەو سەبارەت بە بەرهەمهێنانی زانین لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا خستوویەتیە ڕوو، کە سەرچاوەکەی بۆ هەمان چەمکی بەشتبوون و، نامۆبوون و، لە خۆنامۆبوون دەگەڕێتەوە کە لە کارەکانی قۆناغی یەکەمی فیکریدا قسەی لەسەر کردوون و، هەروەها لە (گرۆندریسە) و (سەرمایە)دا درێژەی پێ داون (بە تایبەتیش با سەرنج بدەینە بەشی چوارەمی فەسڵی یەکەمی "سەرمایە" واتە "بە بتبوونی کالاکان") تا ئێستا ئەو هێزو شیاوێتییەی خۆیان پاراستووە کە ئەو لە سەدەی نۆزدەیەمدا باسی لێ دەکردن. مارکس وا باسی ناعەقلانێتی و ئاشووبی بەرهەمهێنانی ئابووریی سەرمایەداری دەکات، وەك شتێکی هاودژی عەقلانیەتی مۆدێرنیتە. هەوێنی ئەم بۆچوونە لە نووسینەکانی میشیل فۆکۆو ژیل دۆلۆزو ژان فرانسوا لیوتار و کاری فیکریی هەندێ لە ڕەخنەگرانی مۆدێرنیتەدا دەبینینەوە، ناشکرێ لەم بوارەدا ڕۆڵی مارکس فەرامۆش بکرێ. ئەمڕۆ دەتوانین لەسەر بناغەی ئەو بۆچوونەی ئەو پیشانیبدەین کە ئەو لافی عەقلانیەتە چ نەبوو جگە لە هەمان ناعەقلانیەت کە خۆی لە پەیوەندییە بەشتبووە کۆمەڵایەتییەکاندا بەرهەمدێنێتەوە. (لێرەدا لێکچوونێکی سەرسوڕهێن هەیە لە نێوان تۆژینەوەکانی مارکس و نووسینەکانی مایدیگەردا کە زۆر بیرمەند بۆی نەچوون).

گرنگیی مارکس و، ئەوەی وایلێدەکات کە فەرامۆش نەکرێ لەو وێناکردنەوە دێ کە لە ڕێی شیکردنەوەیەکی وردەوە بۆ سەرمایەداری خستوویەتیە ڕوو. ئەو وێناکردنەی کە بە ڕای ژمارەیەك لە تیۆرەسازان تا ئێستاش جێو بەهای خۆی هەیە. بۆ نموونە ئەلیکس کالینیکۆس بڕوای وایە کە "شۆڕشی **1989**" واتە هەرەسی سیستمی کۆمۆنیستی لە ئەورووپای خۆرهەڵاتداو پاشانیش لە یەکێتیی سۆڤێتدا، بێگومان سەرکەوتنی سەرمایەداری بووە، بەلام سەرکەوتنێك کە "ئەمڕۆ بە شێوەیەکی زیاتر مارکسیزم دەخاتەوە ڕوو". ئەو لە کتێبی (تۆڵە سەندنەوەی مێژوو)دا لەسەر دیموکراسی لیبراڵی نووسیوەو وەکو نۆربرتۆ بۆبیۆ هەولیداوە پیشانیبدات کە لیبراڵەکان لە کۆمەڵێك مەسەلەی گرنگی وەکو بەشداریکردنی خەلك لە دیاریکردنی چارەنووسیانداو دەستێوەردانیان بۆ ناو سیستم و ژیانی سیاسی و، چاودێریکردن لە [illegible]، تەنانەت لەوەدا کە خەلکی بۆ دەربڕینی ناڕەزایی ئازادن و هەروەها لە ڕیفۆرمدا شکستیان هێناوە. لە بەشی حەوتەمی ئەم کتێبەدا دەگەڕێمەوە سەر ئەم خاڵە، بەلام لێرەدا زیاتر مەبەستم لە تۆژینەوەکانی



ئەم تیۆرەسازەیە لە خستنەڕوو و کارایی بەخشین بە بیروڕاکانی مارکس. ئەو لەو بڕوایەدایە  کە لانی کەم دەتوانین لە سێ ڕووەوە پێ لەسەر شیاوێتیی مارکس دابگرینەوە:

*1*)ئەو شیکردنەوەیەی مارکس کە تەنانەت بەرلەوەی بە شێوەیەکی ورد دەست بداتە لێکۆڵینەوەی ئابووری، لە (مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست)دا لەسەر بەرهەمهێنانی سەرمایەداری کردیو، بەجۆرە بەرهەمهێنانێکی شۆڕشگێڕانەی لە قەڵەم دا کە "سروشتی جیهانێکی نیشتمانیی بە بەرهەمهێنان و مەسرەفکردن بەخشیوە" و، "بە گوێرەی وێنەیەکی خۆی جیهانێکی خولقاندووە"، ئەمڕۆ لە ساڵی ***1848*** ڕاستترە.

لە ڕاستیدا ئەو سەردەمە هەندێ مەیل هەبوون بە ئاراستەی بەرهەمهێنانی جیهانی، کە ئەمڕۆ ئەو مەیلانە بەدی هاتوون. ئەوەی ئەوسا لە چاوی هاوچەرخانی (مانیفێست)دا شێوەی دەربڕینێکی مەجازیی بەخۆوە گرتبوو، ئێستاکە بووە بە شتێکی واقیعی.

2)مارکس پاش لێکۆڵینەوە ئابوورییەکانی خۆی، لە گرۆندریسەو یادداشتەکانی تریدا باسی لە ناسەقامگیریی ئابووری کردووە. ئێستاش شیکردنەوەکەی ئەو بۆ ئاراستەی ئابووریی سەرمایەداری ڕووەو قەیرانەکانی قۆناغی تێربوون لە بەرهەمهێناندا پایەی خۆی هەیە. تیۆرە ئابوورییە نیوکلاسیکەکان کە قەیرانەکان بە ڕووداوی کاتیی پەرەسەندنی ئابووری دەزانن؛ لە ئاست توانای بنجبڕانەی میتۆدەکەی مارکسدا کە  باس لە قەیرانە بونیادییەکان دەکات؛ کەچن. کالینیکۆس باسی ئەوە دەکات کە هەر لە دەیەی ***1990***دا سەرمایەداری دوچاری سێ قەیرانی ئابووری  و دارایی بووە کە هەریەکەیان؛ دڵنیابوون لە کارو کاری خۆڕاستکردنەوەی ئەم سیستەمە ئابوورییە دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

*3*)ئەنجامگیرییە سەرەکییەکەی مارکس بۆ پەیوەندیی کەڵەکەبوونی سەرمایە لەگەڵ چەوساندنەوەی کرێکارانی کرێگرتەداو بە سەرنجدان لە ڕووداوەکانی سیاسەتەکانی موحافەزەکارە نوێیەکان (وەکو تاچەریزم) دەردەکەوێ. هەروەها ئەو ئەنجامە کۆمەڵایەتی و سیاسیەی کە مارکس پێی دەگات، واتە پەیدابوونی چینێکی پێکەوە گرێدراو و "بۆخودی" کرێکار کە دەتوانێ خۆی ڕێکبخات و، ڕزگاربوونی بە دەستی خۆی دەبێت، ڕاست دێتە بەرچاو. بە جیا لەو تیۆرە جۆراو جۆرانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا توانەوەی چینی کرێکاریان ڕاگەیاندووە؛ لەبەر ئەوەی شۆڕشی ئەلیکترۆنی و پەرەسەندنی تەکنۆلۆژی لە ئارادایە؛ مانگرتنەکانی چەند ساڵ لەمەوبەری فەرەنسا نموونەیەکە لە زیندوێتیی بیرۆکەی سەرەکیی بۆچوونەکەی مارکس.

بەر لە لێکۆڵینەوەیەکی وردی بیروبۆچوونەکانی مارکس، ناتوانین بە تەواوەتی لەسەر ئەو سێ خاڵەی سەرەوە پێکبێین. بۆ نموونە، خاڵی دووەم پەلکێشمان دەکات بۆ  کۆمەڵێك باس و خواسی ورد کە لە دوو دەیەی پێشوودا لەسەر ڕەتکردنەوەو قبوولکردنی تیۆرە ئابوورییەکانی مارکس سەبارەت بە قەیرانەکان لە مشتومڕدا بوون. بە تایبەتیش کەوا دێتە پێشچاو مارکس وێنایەکی گشتیتری بۆ "قەیرانی سەرمایەداریی هاوچەرخ" خستبێتەڕوو، کە تۆژینەوە دەربارەی ئەوە خۆی بۆ خۆی پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆو بەرفراوانترەو، لە کۆتایی فەسڵی پێنجەمی ئەم کتێبەدا من ئاماژەیەکم  بەمە داوە. لە سەرێکی ترەوە، خاڵی سێیەم کە کالینیکۆس لێی دەدوێت، دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی گرنگ:



گرنگێتیی مارکس بە تەنها لەو وێنایەدا نییە کە ئەو وەکو تیۆرەسازێك یا شیکارێکی وردی سیستمی سەرمایەداری و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان؛ پیشاندەدات. ئەمانە هەموو بەجێی خۆیان، بەڵام کارایی هێزی مارکس لە سروشتی لایەنگیرانەی ڕوانینی ئەو، لە جەختکردنەوەی لەسەر هۆشیاریی چینایەتی و پاشانیش پێداگرتنی لەسەر گرنگێتیی خەباتی چینایەتیدایە. کۆرنلیۆس کاسترۆیادیس کە ساڵانێکی زۆری ژیانی خۆی لە چالاکی کردەیی حیزبە چەپە توندڕەوەکاندا بردە سەر، لە دوا ساڵانی ژیانیداو، کاتێ بە ئەندازەیەکی پێویست ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی حیزبە کۆمۆنیستەکان و بیروباوەڕە ستالینیەکان گرت و لەگەڵیاندا جەنگابوو، لە ڕوانگەیەکی نوێوە دەیڕوانییە سیاسەت؛ سەبارەت بە گرنگێتیی کاری مارکس نووسیی کە ئەو شتەی زۆر تازەو ڕەسەنە لە هێزی مارکسداو دانسقەیی فیکری ئەو پیشان دەدا، ئەوەیە کە ئەو لە چالاکیەکانی ئادەمیزادە زیندووەکانداو ئەوانەی لەناو کۆمەڵگادان بەدوای سەرچاوەی حەقیقەتدا (بە تایبەتیش لە بواری سیاسیدا) دەگەڕا؛ نەك لە ئاسماندا، یان لە کتێب و بیروباوەڕەکاندا. تێزی تازەی مارکس ئەوە بوو کە دەکرێ لە ڕێی بایەخدانمانەوە بە ململانێی نێوان کرێکاران و سەرمایەداران لە حەقیقەت بگەین. لەم قسەیەدا خاڵێکی گرنگ دەبینرێ. مارکس خۆیشی کارەکەی نەك هەر بە ڕەنگدانەوەی ململانێی چینایەتی لە هۆشیاریو تیۆرەدا دەزانی، بەڵکو بڕوای وابوو کە تەنها لەو گۆشە نیگایەوە دەتوانرێ لە کارەکەی بگەن. ئەو نەك هەر لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا وازی لە وانە وتنەوەو توێژینەوە لە زانکۆدا هێناو ژیانی خێزانەکەی خستە هەژاری و دەردی کۆچەوەو، ئەوەی لە خۆشگوزەرانی و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی مامۆستایەك لا پەسەندتر بوو، بەڵکو بەردەوام بە جۆرە سووکایەتیەکەوە دەیڕوانییە "جەنابە زانکۆییەکان" و، هەموو دەرفەتێکی دەقۆستەوە تا پەیوەندیی نێوان سیستمی فێرگوزاریی وڵاتە پیشەسازییەکان و چەمکی مۆدێرنی زانست کە لە خزمەتی سەرمایەداراندایە، ئاشکرا بکات. لەم ڕووەوە، بەردەوام پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە پێویستە لەبەر ئاسۆی ململانێی چینایەتیدا بڕوانینە کارەکانی و بیانخوێنینەوەو لێکیانبدەینەوە.

لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان و کۆمەڵناسیی سەدەی بیستەمدا، لە خۆرئاوادا، بایەخێکی ئەوتۆیان بە مارکس نەدا. لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا، جگە لە هەندێ حاڵەتی ئاوارتەی وەکو نووسینەکانی سی. ڕایت. میلز نەبێت کە بەهای کاری مارکسی زانیبوو، کۆمەڵێك لە نووسەران و ئەکادیمیان کارەکەی ئەویان بە کارێکی ئایدیۆلۆژی لە قەڵەم دەداو بە جیددییان نەدەژمارد. بۆ نموونە تالکۆت پارسۆنز لەو دوو کتێبە بەناوبانگەیدا کە کاریگەرییەکی زۆریان بۆ سەر پەرەسەندنی کۆمەڵناسی لە ئەمریکادا هەبووە، واتە (بونیادی کرداری کۆمەڵایەتی) "*1937*" و، (سیستمی کۆمەڵایەتی) "*1951*"، چەند لاپەڕەیەك زیاتری بۆ مارکس تەرخان نەکردووە، ئەوەش هەر بۆ ڕەتکردنەوەی بیروڕاکانی، بەڵام هەر ئەم پارسۆنزە سەدان لاپەڕەی لە بارەی ماکس فیبەرر ئەمیل دورکهایم و ویلفەردو پارتو (کە بە بەراورد لەگەڵ مارکسدا لە پەراوێزدایە) وە نووسیوە. پاش ساڵانی شەستەکان، لەگەڵ ڕادیکالیزمی سەرچاوەگرتوو لە براڤی دژی جەنگی ڤیەتنام و، پەرەسەندنی براڤی توتابیان لە وڵاتە یەککگرتووەکان و ئەورووپادا؛ بایەخدان بە مارکس دەستپێکرد. لە سەرێکی تریشەوە، ئەو ڕەخنە کۆنەی کە کۆڵەکەی توێژینەوە تیۆرییەکانی ئەوی بە "ئایدیۆلۆژیك" دادەنا، ڕووی لە لاوازی کرد. پەرەسەندنی کۆمەڵێك تیۆرەی نوێ لە



فەلسەفەی زانستدا (وەکو بیروڕاکانی تۆماس کۆهن و پۆڵ فایرابند) و، تەشەنەکردنی گوتاری هێرمنیۆتیکی لە زانستە مرۆییەکانداو، پتر بایەخدان بە تیۆرەی ڕەخنەیی ئادۆرنۆو هۆرکهایمەرو مارکۆزو، تەنانەت بڵاوبوونەوەی ئەقڵانیەتی ڕەخنەیی کارل پۆپەرو هاوبیرانی و، سەرەنجام پەیدابوونی گوتاری پۆست مۆدێرن و ئەو ڕێژەخوازییەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنای، هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە زیاتر بیرمەندان و ئەکادیمیان بگەنە ئەو بڕوایەی کۆمەڵناسیی بەدەر لە بەها بوونی نییە. ئەوەش ڕوون بۆوە کە کار و بیروبۆچوونەکانی ڤیبەرو دۆرکهایمیش لە نووسینەکانی مارکس کەمتر ئایدیۆلۆژیك نین. بۆچوونێکی تازەش سەبارەت بە مارکس هاتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بە ئاشکرا ئایدیۆلۆژیای خۆی دەخستە ڕوو و، لەژێر ڕووپۆشی گوتاری زانستیدا نەیدەشاردەوە.

### 4-کام مارکس؟

به بڕوای مارکس زانست لایەنگرە. ئامانجی من لەم کتێبەدا ئەوە نییە کە لەسەر حسابی فەرامۆشکردنی ئەو وەك تیۆرەسازێکی دژە سەرمایەداری و خەباتگێڕێکی ڕێی ڕزگاریی پرۆلیتاریا، ئەو بخەمە ئاستی زاناو بیرمەندێکی ئەکادیمی و زانکۆییەوە، (بە دڵنیاییشەوە دەڵێم کە کارێکی لەمجۆرە لە ڕوانگەی ئەو خۆیەوە وەکو "کەمکردنەوە لە ئاست"ی ئەو بوو). بە پێچەوانەوە، دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەم کە مارکس بۆ ئەوە دەینووسی کە سیستمی باو بگۆڕێ. ئەمە بە ڕواڵەت چاوەڕوانیەکی گەورەیە کە لە کاری فیکری و نووسین دەکرێ. بەڵام نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە گوتاری فەلسەفی لە گەوهەردا سەروکاری لەگەڵ گۆڕانکاریدا هەیە. تەواوی فەیلەسووفان بە مەبەستی گۆڕینی هۆشی خوێنەر دەتۆژنەوەو دەنووسن.

فەلسەفە، هەروەها وەکو مۆریس بلانشۆ دەڵێت زمان‌و نووسین، بە گۆڕینەوە بەندن. تەنانەت موحافەزەکارترین بیرمەندانیش کە ئەرکی خۆیان بە بەرگریکردن لە سیستمی سەقامگرتوو و شێوە باوەکانی ژیان و کار دەزانن، دەیانەوێ لە ڕێی تۆژینەوەو نووسینەوە بۆچوونی کەسانی دیکە بەلای خۆیاندا ڕابکێشن.

ئەوانە گەمەیەك دەست پێ دەکەن کە بە گوێرەی لۆجیك خۆیان لە ئاکامەکەی بێ ئاگان، ئاسۆی چاوەڕوانیەکانی خوێنەری خۆیان دەگۆڕن و، بەم گۆڕینەش ڕێ بۆ لێکدانەوەی تازەو، دەشێ بۆ تازە بوونەوەی پەیوەندییە مرۆییەکانیش بکەنەوە. بە هەمان شێوە، بیرمەندێکی ڕادیکال کە بە هوشیارییەوە ئەو تازەکارییەی ویستووەو، گۆڕانکاریی کردووە بەسەرلەوحەی کاری فیکریی خۆی، ناتوانێ ئێمە لە ئاسۆی چاوەڕوانیەکانی خۆیدا قەتیسبکات.

مارکس نەك بە تەنها لە ئاستی دەربڕیندا؛ واتە لە دەقی گوتەکانیدا، بەڵکو دەبووایە لە قووڵایی زمانیشدا شتەکانی بگۆڕیبایە. بۆیە ئێمە ناچارین کە لە ناواخنی قسەکانی ئەو زیاتر بڕۆین و، ئەو لە شوێنێکی دیکە، لە وێرانکردن و بینا کردنەوەدا ببینینەوە. ناچارین ئەو ئاسۆی چاوەڕوانی‌یە، چەندەها جار فراوانتر لەوەی ئەو خۆی پێشنیازی کردووە؛ بیخولقێنینەوە.

هەرچەند بمانەوێ لەو شوێنەدا لە هزری مارکس بکۆڵینەوە کە ئەو خۆی بۆ خۆی دانا (یان دەیویست دایبنێ)؛ واتە لە پلەی خەباتگێڕێکی پرۆلیتاردا، بەڵام ناتوانین ئەوە بشارینەوە کە هەر لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەوە، ئەو لە پلەیەکی دیکەشدا دەبینینەوە. لە سەروو نیازی دانەرەوەو، تا ئەو جێیەی کە ئێمە وەکو دەق لەگەڵ کارەکانیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە، ئەو پێشگریمانەیەی کە ئێمە



پێویسته له نووسینەکانی وەکو نووسینەکانی خەباتگێڕێکی پرۆلیتار بکۆڵینەوە بە تەنها دەبێتە یەکێك لە ڕووەکانی "ئاسۆکانی چاوەڕوانی"ی کارەکانی، کە دەکرێ لە میانیانەوە بخوێنرێنەوە. بە پێی حوکمی بنەڕەتیی هێرمینیۆتیکی ئەدەبی مۆدێرن و ڕێبازی ئیستاتیکای وەرگرتن، نیازی دانەر لە تێگەیشتنی ماناکانی دەقدا بەهاو بایەخی نییەو، خوێنەر ئازادە لەوەی کە هەر دەقێك بخاتە ئاسۆی چاوەڕوانیی تازەوەو، خوێندنەوەی خۆی بە تیژی تازەوەو لە ئەنجامیشدا بە ئەزموونی خولقاندنی مانا دەستپێبکات. هیچ خوێندنەوەی دەقێك ناتوانێ لە سروشتی لێکدانەوەو دامێنانی مانای تازە ڕزگاری ببێت و، لەناو دۆزینەوەی ئەو مانایانەدا قەتیس بمێنێ کە دانەر مەبەستی بوون، یان لە ئاسۆی تێزەکانی دانەردا گیر بخوات. هەر لەبەر ئەمە تەواوی نووسینەکانی مارکس بەدەر لەو ڕێنومایانەی کە خۆی پێشنیازی دەکردن (یان کەسانی دی بەناوی ئەوەوە پێشنیازی دەکردن) دەخوێنرێنەوەو، تێگەیشتنیشیان جگە لە بنیاتنانی لێکدانەوەی تازە بە هیچ مانایەکی دی نایەت.

پرسیاری "کام مارکس؟" ئێمە دەخاتە بەردەم دۆزینەوەیەکی ترەوە. ئێمە سەبارەت بە مارکس، هەروەکو هەموو بیرمەندێکی ڕەسەنی تریش ناتوانین لافی ئەوە لێبدەین کە "بە تەنها ڕووبەڕووی یەك کەس بووینەتەوە". لە ڕووی کردەییەوە، هەمیشە لە ڕەوتی خوێندنەوەماندا بۆ کارەکانی مارکس، ڕووبەڕووی چەند مارکسێك دەبینەوە. لە بڕوامانەوە بە نکووڵی کردن لە یەکەیەکی بنەڕەتیی شوناسی خودی مۆدێرن؛ ئەو لافانە ڕەتدەکەینەوە کە یەك مارکس لە ئارادایە. بەلای ئێمەوە کەسێك نییە کە بەردەوام وەکو خۆی بمێنێتەوە. گریمانکردنی ئەوەی کە کۆمەڵێك کار هەن بە درێژایی چەندین دەهە لەسەر بناغەی مەبەست و ئامانج و نەخشەیەکی دیاریکراو نووسرابن و، دواتریش بە گوێرەی ئەوانە بناسرێن و پاساویان بۆ بهێنرێتەوە، شتێك نییە قابیلی سەلماندن بێت. مارکسێك کە لە سەرەتای پێگەیشتنی جەستەیی و فیکرییەوە تا سەرەمەرگ بە ئەمەکداری بۆ پرنسیپێك یان ئامانجێکی پیرۆز مابێتەوە هەر شایانی لینینیستەکانە. ئەوەی کە مارکس "چیی لە مێشکدا بووە" و "ویستوویەتی چی بڵێت" بۆ من گرنگ نییە. ئەوەی گرنگە تێگەیشتنی گەمەی زمان، شێوەی دەربڕین، ئەپستیمی سەردەمە. لەم ڕووەوە، بڕوا ناکەم ئەو دەقانەی کە ئەو بەرهەمیهێناون ڕێك ڕواڵەتی ئەو بیرۆکانە بن کە ئەو دەیویست بیانخاتە ڕوو. ئەوەم پێ قبووڵ ناکرێ کە بەتەنها ئیمزایەك هەموو ئەو دەقانە پێکەوە دەبەستێتەوەو، یەکەیەکی بابەتی و ناوەکیان پێ دەبەخشێت. هەڵوێستێکی لەمجۆرە زیاتر لەوەی بەڵگە هێنانەوەیەك بێت بە ئاراستەی سەلماندنی چوونیەکی و ڕێکخستنی دەقەکان، سەلماندنی سادەی کاریگەریی ڕوانینێکی میتافیزیکانەیە.

مارکس وەکو هەر ئادەمیزادێکی دی هەزاران جار ژیاوە. ئەو هەموو ڕووداوەی ژیانی تایبەتیی، مێژوویی و سیاسی، ئەو هەموو گۆڕان و، کەوتنە ژێر کاریگەری و کارلێکردنە جیاوازانە، ئەو هەموو کاریگەرییە ئاشکرایە بۆ سەر گوتارە جۆراوجۆرەکان ئەوە پیشاندەدات کە ئێمە ڕووبەڕووی یەك کەس و، یەك خود نین کە بەردەوام بە شێوازێك و بە یەك شێوە ژیابێت و بیری کردبێتەوەو کاری کردبێت. شێوە جۆراوجۆرەکانی دەربڕینی ئەو و، ئەو شێوازە جیاوازانەی بەکاری بردوون و، دەوڵەمەندی و تیرە جۆریی میتۆدی تەنزئامێزانەی پەخشانەکانی و ئایدیا جیاوازەکانی، هەرگیز ناچنەوە سەر یەك سەرچاوە. تاقە تەوەرەیەکی لە شکست نەهاتوو نەبوو لە کارەکانیدا. تەنانەت گەر بشڵێین کە تەمەنێك لە



گۆشەنیگای چینی ستەملێکراوی کرێکارانەوە سەیری ململانێی چینایەتیی کردووە، دیسانەوە دەبێ دان بەوەدا بنێین کە دوو ڕوانین لە گۆشەنیگایەکەوە هەرگیز کورت ناکرێنەوە بۆ ڕوانینێك. گەورەیی کاری شۆڕشگێڕێکیش لەوەدایە کە هەرگیز بۆ یەك سەرچاوە کورت نەکرێتەوە.

### 5-سیاسەتی مۆدێرن و ڕۆڵی مارکس:

مارکس هەرگیز کارێکی سەربەخۆو ڕێکوپێك و کاملی دەربارەی تیۆرەی سیاسی نەنووسیوە. وا دێتە بەرچاو کە لە بەشی زۆری قۆناغی کاری فیکرییدا، بە گوێرەی پێداویستی و هەلومەرجەکانی ململانێکانی ڕۆژانە ڕوانینی سیاسیی خستبێتەڕوو. تەنانەت ئەو یاداشتەی کە دەیویست وەکو بەرگی چوارەمی (سەرمایە) "دەربارەی دەوڵەت" بینووسێت؛ نەماوەتەوە. "کارە سیاسیەکان"ی ئەو بەو سەودایەوە نەنووسراون کە تیۆرەیەکی گونجاو و گشتگیر لە بورای فەلسەفەی سیاسەتدا بخەنە ڕوو. لەو بنەماو پرنسیپانەیان نەتۆژیوەتەوە کە تەنانەت لە ڕۆژگاری ئەودا پێیان دەوت "زانستی سیاسەت"و، تەنها بەپێی زەرورەتی دەستخستنە ناو ململانێی کرێکاران و بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژ نووسراون. ئەو بیرخستنەوەیەی مارکس لە پێشەکیی دووەمین چاپی (هەژدەیەمی برومری لویس بوناپارت)دا کە ئەو کارە "لە ژێر گوشاری ڕاستەوخۆی ڕووداوەکاندا" نووسراوە (5ب: 3، ب ئا-1: 394) بە ڕاستی بەسەر تەواوی کارەکانیدا دەچەسپێ، لە گەڕانماندا بە دوای بونیادی تیۆرەیی هەندێ لە بیرۆکەو هەڵوێستە سیاسیەکانی ئەودا هەندێ جار ناچار دەبین کە پەنابەرینە بەر نووسینە ئابووریەکانی و لێیان وردببینەوە. کارە سیاسیەکانی ئەو سروشتێکی ئەزموونکاریان هەیەو تەنانەت لە هەندێ لە گرنگترین ئەو کارانەدا حوکمی دژیەك دەبینینەوە. لەبەر ئەوەی لەکاتی نووسینیاندا تێڕوانینی دەگۆڕا. بۆ نموونە، دەبینین زنجیرە وتارە بەناوبانگەکەی بە (ململانێی چینایەتی لە فەرەنسادا) بەوە دەستپێدەکەن کە ڕوودانی شۆڕشێکی ئەورووپایی لە ئاییندەیەکی نزیکدا شتێکی حەتمیيە، کەچی بە نکوڵی کردنی هەمان ئەو شتە کۆتاییان دێ. لە سەرێکی ترەوە، مارکس لەبەر هەلومەرجی سیاسی و ڕەچاوکردنی پرنسیپی پەنهانکاری هەندێ جار بە زمانێکی ڕەمزی دەینووسی و پەنای دەبردە بەر تەنز، یان باسی سەرچاوەی زانیارییەکانی خۆی نەدەکرد. هەموو ئەم شتانەش توانای ئەنجامگیری لە نووسینە سیاسیەکانی کە زیاتر بریتین لە وتارو نامیلکەو بەیاننامەو پەیام و یادداشت و نامە، دژوار دەکات.

ناتوانین بە مانا وردەکەی، مارکس بە فەیلەسووفێکی سیاسی لە قەڵەم بدەین. ئەو هەرگیز فەلسەفەیەکی سیاسیی وەهای نەخستۆتە ڕوو کە گشتگیرو شێوەدار بێت. فیلیپ لاکۆلابارت و ژان لۆك نانسی لە یەکەمین بەرگی کتێبی (گەمەی سەرلەنوێی سیاسەت)دا نووسیویانە کە "فەزایەکی خاڵیی سیاسی" لە فیکری مارکسدا هەیە. بە بۆچوونی ئەوان مارکس بە شێوەیەکی سەرەکی لە تۆژینەوە فەلسەفیەکانی خۆیدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە تیۆرەیەکی کۆمەڵایەتی بینا بکات و، بناغەکەشی لەسەر ئابووریی سیاسی دابمەزرێنێت کە ببێتە مایەی تێگەیشتن لە کۆمەڵگای مەدەنی. لەم ڕووەوە "سیاسەت هەر وەکو شتێکی بیرلێنەکراوە لە کاری ئەودا مایەوە".

زیاتر لەم خاڵەش دەگەین ئەگەر سەرنج لەو گوتەیەی مارکسی لاو بدەین کە ئەقڵی سیاسی ڕێك لەبەرئەوەی کە سیاسیەکی پەتیيە، لە تێگەیشتنی دژوارییەکان و ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکاندا کەموکورت و ناکارایە (م ئا- 3: 199). بۆ خستنەڕووی خاڵێکی



گشتیش کە پیشانیدەدات مارکس لە ئاست کام لایەنی ژیانی سیاسیدا بێ دەربەست بوو و، لەم بوارەشدا شتە بیرلێنەکراوەکانی کامانەن، سوود لە ڕستەیەك وەردەگرم کە لویس ئاڵتۆسیر دەربارەی ئابووریناسە کلاسیکەکان نووسیویەتی و، بە بڕوای من ڕێك بەسەر مارکسیشدا دەچەسپێ.

ئاڵتۆسیر لە کتێبی (خوێندنەوەی سەرمایە)دا نووسیویەتی: "ئەو شتەی ئابووریی سیاسی نایبینێت شتێك نییە کە لە پێشدا هەیەو دەتوانرێ ببینرێ، بەڵام نایەتە بەرچاو. ئەوەی نایبینێت، شتێکە کە لە ڕەوتی بەدەستهێنانی مەعریفەدا بەرهەمیدێنێت و، بەر لەو ڕەوتە بوونی نەبووە. هەمان ئەم بەرهەمهێنانی مەعریفەیەشە کە مەسەلەیەکی ڕەچاونەکراوێتی. ئەو شتەی ئابووریی سیاسی نایبینێت شتێکە کە خۆی دەیخولقێنێت، بەرهەمهێنانی وەڵامێکی تازەیە بەبێ ئەوەی کە پرسیارێك لە ئارادا بووبێت و، لە هەمانکاتدا بەرهەمهێنانی کۆمەڵێك پرسیاری دواترە کە لەناو مەناوی ئەو وەڵامە تازەیەوە فۆرمەلە دەبن".

مارکس لە ڕەوتی بەرهەمهێنانی مەعریفەشدا، واتە لە بەرەوپێشبردنی شیکردنەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریی هاوچەرخدا، کۆمەڵێك مەسەلەی تیۆرەیی گرنگی دەخستەڕوو کە نەیدەتوانی بە شێوەیەکی تەواو لە ڕەوتی دواتری گۆڕانی سەرمایەداریدا بە دوایاندا بچێت و، پێشبینییەکی وردی ڕەوتی ئەو پەرەسەندنە بەدەستەوە بدات. لە گرنگترین ئەو مەسەلانەش کە لەم کتێبەدا پەنجەم خستۆتە سەر، تێگەیشتنی میکانیزمی چالاکیی دەوڵەتی دیموکراتی مۆدێرن یان بۆرژواییە.

کۆمەڵێك چەمك و مەسەلە لە سیاسەتی مۆدێرندا هەن کە لە ڕوانگەی پێکهاتەی مێژووییانەوە بە هەندێ لایەنی تیۆرەکانی مارکسیشەوە پەیوەست دەبنەوە، بەڵام مارکس ئەوانەی نەخستبوونە ڕوو، وەکو: دەوڵەتی ڕەفاه، دەوڵەتی لانی کەم (وەکو ڕێگەچارەیەکی تیۆرەیی بۆ بەرامبەربوونەوەی دیموکراسیی سنووردارو پشت ئەستوور بە نوێنەرایەتی لەگەڵ دیموکراسیی ڕاستەوخۆدا)، ڕوونکردنەوەی تیۆرەیی و ڕەخنەگرانەی چەمکەکانی وەکو ڕەوایەتی، وێکهاتن، ڕێکەوتننامە، لێکبووردن، بواری گشتی، تێگەیشتنی سروشتناسی وەکو هێزێکی سیاسی، بزاڤی سەربەخۆی ئافرەتان، بزاڤە ئازادیخوازەکانی کەمینە نەژادییەکان و.. بەرامبەر ئەمانەش کۆمەڵێك چەمك و مەسەلە هەن کە لە سیاسەتی مۆدێرنداو، لەوەدا کە ئەمڕۆ ئێمە بە شتی سیاسیی دەزانین کلیل ئاسان و لە نووسینەکانی مارکسدا بایەخیان پێ دراوەو، هەندێکیان لە ناو چەقی گرنگیپێدانی ئەودا بوون، وەکو: یەکسانی، عەدالەت، دەسەڵات، توانا، پەیوەندیی موڵکدارێتی بە مافەکانەوە، مەسەلەی نەتەوایەتی، جێکەوتەی تایبەتیی جەنگ و، بێگومان سروشتی چینایەتیانەی دەوڵەتیش.

بە سەرنجدانی ئەو خاڵانەی سەرەوە ناتوانین لەگەڵ ڕۆجەر تریگدا کە نووسەری کتێبێکی ناوداری وەکو (کۆمەڵێك بیروبۆچوون سەبارەت بە سروشتی مرۆیی) "*1988*"ە؛ هاوڕابین کە نووسیویەتی: "هیچ بیرمەندێك بە ئەندازەی کارل مارکس کاریگەرییەکی وا قووڵی لەسەر بونیادی سیاسیی جیهانی مۆدێرن نەبووە. بیروباوەڕەکانی ئەو تۆوی ئەو هەموو شۆڕشەیان لە سەدەی بیستەمدا چاند. هەرچەند بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوەوە، ئەو شۆڕشانە لە پێشکەوتووترین وڵاتی پیشەسازیدا ڕوویان نەدا".
هەڵبەت تریگ لە پێشەکیی چاپی دووەمی کتێبەکەیدا لە ساڵی *1999*دا و، پاش هەرەسی کۆمۆنیزمی سۆڤێتی، تا ڕادەیەك ئەو قسەیەی خۆی ڕاستکردەوە. بەڵام هەروەکو پێشتریش ئەوەم ڕوونکردەوە، مەسەلەکە لەسەر ئەم خاڵە نییە.



بەلکو مەسەلەی سەرەکی لە چۆنێتیی دەرکی تریگدایە بۆ "بونیادی سیاسیی جیهانی مۆدێرن". ئەم بونیادە چەمکێکی زۆر بەریلاوە. ڕاستە کە لە سەرێکەوە بە شۆڕشەکانەوە بەستراوەتەوە، بەلام قەلەمڕەوی فراوانی بە تەنها لە شۆڕشەکاندا کورت ناکرێتەوە. چۆن دەکرێ ڕۆلی مەزنی تیۆرەسازانێکی لیبرالی وەکو جۆن ستیوارت میل و ئەلێکسی دۆتۆکویل لە فۆرمەلەی بونیادی هەنووکەیی سیاسەتی جیهاندا لە یاد بکەین؟ یان چۆن دەتوانین کاریگەریی قوولی ماکس ڤیبەر بۆ سەر تێگەیشتنمان لە سروشتی ئەقلانیانەی کرداری سیاسی و ڕێکخستنی ژیانی سیاسی یان وەکو نریگ خۆی دەلێ بونیادی سیاسیی جیهانی مۆدێرن، بە کەمبایەخ سەیر بکەین؟ بە گوێرەی کۆمەلێك بەلگەی بەهێز دەتوانین بیسەلمێنین کە ئەم بیرمەندانە کاریگەرییەکی قوولترو درێژخایەنترو خولقێنەرتریان بۆ سەر ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە پێی دەلێین "سیاسەت" هەبووە وەك لە مارکس.

## 6–دوو مانای "مارکسیزم"

دەتوانین تەسەوری دوو مانا بکەین بۆ مارکسیزم. مانای یەکەمیان بریتیی‌یە لە بیروبۆچوونەکانی کارل مارکس خۆی. هەروەکو چۆن برتل ئۆلمانیش بەم مانایە کتێبەکەی (لەخۆنامۆبوون، چەمکی مارکس بۆ مرۆڤ لە کۆمەلگای سەرمایەداریدا) دەستپێدەکات: "مارکسیزم بە شێوەیەکی سەرەکی بریتیی‌یە لە لێکدانەوەی مارکس بۆ سەرمایەداری، ئەنجامە کۆتایی پێ‌نەهاتووەکانی تۆژینەوەی ئەوە دەربارەی ئەوەی کە کۆمەلگای ئێمە چۆن کاردەکات، کە چۆن پێشدەکەوێت و، بەرەو کام ئاراستە دەڕوات" ئەم پێناسەیە ناڕاست نی‌یە، بەلام دەبێ سەرنجی خالێکی گرنگ بدەین. جەختکردنەوەی ئۆلمان لەسەر لایەنی "کۆتایی پێ نەهاتوو"ی لێکدانەوەی مارکس ئاماژەیە بۆ ئەو ڕاستیەی کە نابێ ئەنجامەکانی تۆژینەوەی ئەو بە دامەزرێنەری سیستەمێکی بێ کەموکوڕتی گوزارشتکەری واقیع بزانین. لە لێکدانەوەی مارکس بۆ سەرمایەداری نەك هەر ناتەواو بوو، بەلکو خاوەنی تەوەرێکی مانایی جێگیرو هەمیشەییش نەبوو. بە تەنها کاتێ مزری مارکس گۆڕا بۆ دەستوورێکی دۆگمایی و وەکو مەزهەبێکی لێ کرا، واتە لە یەکێتیی سۆڤێتدا (کە سەرچاوەکەی دەگەڕایەوە بۆ لێکۆلینەوە ناوەکیەکانی ئینتەرناسیونالیزمی دووەمی سالانێك بەر لە شۆڕشی ڕووسیا) "مارکسیزم" لایەنێکی ئەفسانەیی بەخۆوە گرت و، مزری "دەربڕینی تەواوی حەقیقەتی ململانێی چینایەتی" و "ڕێنومای کاری زەحمەتکێشان" و شتی تری لەمجۆرەی پێوەنرا.

مانای دووەمی "مارکسیزم" بە ئاقارێك پێناسەی دەکات کە هەرچەند بە مارکس دەستی پێکرد، بەلام مێژووەکەی لە سنووری ژیان و چالاکیی فیکریی ئەو تێدەپەڕێت و، هەموو ئەو شیکردنەوانە دەگرێتە خۆی کە کەسانی دی پاش خۆی سەبارەت بە پەرەسەندن و ئاراستە ناوەکیەکانی سەرمایەداری خستوویانەتە ڕوو (دەشیانووت کە سەرچاوەی تیۆرەیی کارەکانیان نووسینەکانی ئەو بووە). هەر لەبەرئەمە ڕووبەڕووی یەك مارکسیزم نەبووینەتەوە. لە ڕاستیدا تێگەیشتنی هەر کەس و گرووپێك لە ئایدیاکانی مارکس (ئەوانەی کە هاوبیرو لە زۆربەی جاریشدا هاوڕێکاو هەڤالی حیزبێك بوون) سەرباری ئەوەی خۆیشیان لە سای پەرەسەندنی واقیعیەت و مێژوودا زانیویانەو لێکیانداوەتەوە، بە جۆرێك لە جۆرەکانی "مارکسیزم" دەژمێردرێ. هنری لۆفیڤەر لە وتارێکیدا دەربارەی نیچە لە ڕووی پێداویستیی تۆژینەوەکەیەوە نووسیویەتی: "یەکجۆر مارکسیزم نی‌یە. بە گوێرەی مەیل و ڕێبازو ڕێگەو تێزە کردەییەکان گەلێ مارکسیست هەن" کەمتر ڕوویداوە



بیرمەندێك هەبێت كە خۆی بە "ماركسیست" دەزانێت، ئامادە بووبێت بەرپرسیاریی كارو بیروبۆچوونەكانی بیرمەندانێكی تر قبووڵبكات كە خۆیان بە ماركسیست دەزانن.

هەموو پێ لەسەر ئەوە دادەگرنەوە كە یەك جۆر ماركسیزم نییە، بەڵكو چەندەها جۆر ماركسیزم هەیە. لەم حاڵەتەدا چ پێویست دەكات و، بگرە چۆن دەشێ باسی ڕێبازێكی گشتی بكەین بەناوی ماركسیزمەوە؟ كارل كۆرش لە ئەپریلی *1935*دا لە سەرەتای وتارێكدا بەناوی "من بۆچی ماركسیستم؟"ەوە نووسیویەتی كە بە بۆچوونی ئەو باسكردنی شتێكی گشتی بە ناوی "ماركسیزم" ەوە، هەروەكو باسكردنی مانایەكی گشتیی دیموكراسی و، ستەم و، دەوڵەت، شتێكی ناڕوونە. هەریەك لەمانە دەبێ لە شوێنی مێژوویی دیاریكراو و، بەستراو بە فاكتەرە ئابووری و جوگرافی و نەریتیەكانەوە بناسرێ. جۆرەكانی ماركسیزمیش "بەو جیاوازییە ناسراوەیان و، هەروەكو ئایین و ئاقارەكان" دەناسرێنەوە. هەم لە شێوە نەتەوەییەكەیداو هەم لە شێوەی ئینتەرناسیونالیستیەكەیدا، سیستمی جیاجیای تیۆرەیی و بزاڤی كردەیی جۆراوجۆر هەن كە خۆیان بە ماركسیست دەزانن. كۆرش دەڵێت لەبری ئەوەی لە ماركسیزم بتۆژینەوە كە بە ناچاری دەبێ سەبارەت هەندێ بنەمای گشتی بدوێین، ڕەنگە چاكتر بێت كە لە هەندێ مەسەلەی دیاریكراو و كردەییەوە لە بزاوتی پرۆلیتاریدا دەسپێبكەین. بەڵام لە درێژەی باسەكەیدا، ئەو خۆی هەندێ مەسەلەی وەك گرنگترین مەسەلەكانی فیكری ماركس دیاری كردووە، كە بریتین لە: *1*) تەواوی حوكمە ماركسیەكان، تەنانەت ئەوانەش كە وەك حوكمی گشتی دێنە بەرچاو، حوكمی تایبەتین. (ئەی ئەم حوكمە خۆی چۆن؟).

*2*)ماركسیزم مەسەلەیەكی پۆزەتیڤانە نییە، بەڵكو مەسەلەیەكی ڕەخنەگرانەیە.

*3*)بابەتی ماركسیزم كۆمەڵگای سەرمایەداری نییە لە حاڵەتی پۆزەتیڤی و بەرقەراریدا، بەڵكو كۆمەڵگای سەرمایەدارییە لە حاڵەتی فەوتان و هەڵوەشانەوەدا.

*4*)مەسەلەی سەرەكیی ماركسیزم تێگەیشتنی ڕامانئامێزانەی جیهان نییە، بەڵكو گۆڕینی چالاكانەیەتی. هەریەك لەم مەسەلانەش دەكرێ ببنە سەرچاوەی تۆژینەوەی جۆراوجۆر. بۆ نموونە دوا مەسەلە كە تێزی یانزدەهەمی "كۆمەڵێك تێزی ڕەخنەیی سەبارەت فۆیرباخ"ی ماركسمان بیردەهێنێتەوە، بە بڕوای من دەكرێ وا بنرخێنرێ كە ناڕاستەو، یان لانی كەم ناكامڵەو لە ڕووی فەلسەفیەوە مایەی سەرەگێژە بێت. پێشنیازەكەی كۆرش بۆ ئەوەی كە لەم فەسڵە هاوبەشانەوە دەستپێبكەین، خۆی لە خۆیدا سەرچاوەی چەندەها تۆژینەوەی بێ كۆتاییە. لە ڕاستیدا كۆرش لە تێگەیشتنێكی تایبەتیەوە بۆ ڕوانگەی ماركس ئەم فەسڵانەی بە هاوبەش داناوەو، نەیدەتوانی زۆر لە "ماركسیست"ەكانی دی سەبارەت بە ڕاستێتی و ڕەسانەیەتیی كارەكەی خۆی قەناعەت پێبكات. وا چاكتر بوو بگەڕێتەوە بۆسەرەتای تۆژینەوەكەی خۆی و ڕایبگەیاندایە كە فەسڵێكی هاوبەش بۆ "ماركسیزمەكان" پەیدا نابێت.

وا دێتە بەرچاو كە بۆ ناسینی هزری ماركس و تەوەرە مانابیە جیاوازەكانی واباشتر بێت كە زاراوەی "ماركسی" بەكار بهێنین، خۆمان لە بەركاهێنانی "ماركسیزم" بە دوور بگرین بەو مانایەی كە پێشتر لە خاڵی دووەمدا باسكراوە.



## 7-مارکس یا مارکسیزم؟

وتەیەکی بەناوبانگی کە "مارکس" هەیە کە بە "لاسال"ی وتووە: "ئەوە شتێکە براوەتەوە کە من مارکسیست نیم"[4]. زاراوەی "مارکسیزم"لە مشتومڕێکی سیاسی و تیۆرەییەوە پەیدا بوو. لە سەرەتای دەیەی 1850دا زاراوەی "مارکسی" (Marxianer) لە لایەن لایەنگرانی گروپی وایتلینگەوە دژ بە لایەنگرانی مارکس بەکاردەهێنرا. ئەوانە دەیانویست دوژمنایەتیی پەیڕەویکارانی مارکس لەگەڵ لایەنگرانی لاسالدا زەق بکەنەوە. لەناو ئینتەرناسیونالی کرێکاریدا وەك تانەو تەشەر بە گروپێکیان دەوت "مارکسیست" یان "مارکساوی" یا "Marxides"، تا دووریی ئەوان لە پەیڕەویکارانی باکونینەوە بخەنەڕوو. ساڵێك بەر لە مەرگی مارکس، واتە لە ساڵی 1882دا کتێبێکی بچووك بەناونیشانی "مارکسیزم و ئینتەرناسیونالیزم" بە زمانی فەرەنسی و بە پێنووسی پۆڵ برۆس بڵاوبۆوە. ڕەنگە ئەمە یەکەمین نموونەی خستنەڕووی ئەم وشەیە بێت بە مانا پۆزیتیڤیەکەی. چەند ساڵ دوای ئەوە ئینگلز وشەی مارکسیزمی لە نووسینەکانی خۆیدا بەکارهێنا. هەندێ نموونەش هەن ئەوە پیشان دەدەن کە لایەنگرانی مارکس لە نامەکانی خۆیاندا بۆ مارکس ئەو زاراوەیەیان بەکارهێناوە، بۆ نموونە ڤیرا زاسۆلیچ لە نامەیەکدا بۆ مارکس خۆی کە لە 16ی فێبروەریی 1881دا نووسیویەتی؛ ئەم وشەیەی بەکارهێناوە. بەڵام مارکس خۆی لە بڵاوبوونەوەی ئەم زاراوەیە ڕازی نەبوو و هەروەکو ئاماژەشمان پێدا خۆی بە مارکسیست نەدەزانی. بەڵکو لە نێوان نیازی هەمیشەیی خۆیدا کە پێویستە سروشتێکی زانستیانە بە سۆسیالیزم ببەخشرێو لە نێوان ئەم وشە خودخوازانەو لە ڕووی سیاسیشەوە تاکخوازانەیەدا ناکۆکیی بەدی دەکردو، لەوە دەترسا کە ئەم وشەیە دەلالەت لە بوونی دەستەو تاقمێك بکات لەناو سەرجەم بزاڤی کرێکاریدا. هەر بۆیە لە کۆنگرەکانی -سن- ئەتین و روانی حیزبی کرێکاریی فەرەنسادا بێزاریی خۆی بەرامبەر "دوو دەستە بوونەوەر" دەردەبڕێ کە یەکێکیان خۆی بە "مارکسیست" دەزانی (لە نامەیەکدا بۆ ئینگلز، 30ی سێپتەمبەری 1882)، تەنانەت ئینگلزیش لە نامەیەکدا بۆ لافارگ بە سووکیەوە ناوی "ئەم بەناو مارکسیستانە" دەهێنێت. بەڵام دەبێ ئەوە بوترێ کە زۆر بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە لایەن ئینگلزەوە و لە دەیەی کۆتایی ژیانیدا ڕەسمیەت و ڕەوایەتیی پێ بەخشی. وردە وردە وای لێهات وشەی مارکسیزم لە کوفری شەیتان بەناوبانگتر بوو و، ناوەڕۆکی ئایدیاکانی مارکس و، کۆمەڵێك لێکدانەوەو راڤەی پەیڕەویکارە جیاوازەکانی لەخۆ دەگرت و، پاشان وشەی لینینیزم بە دوایدا هات کە نەبووە مایەی شانازییەکی ئەوتۆ بۆ مارکس و، تەنانەت بۆ شکانەوەی زیاترو تەواوکردنیشی، بیروبۆچوونەکانی مارکس لەگەڵ "بیروبۆچوونەکان"ی کەسانێکی وەکو ماو و ئەنوەر خواجەو کیم ئێل سۆنگ و پۆڵ پت ئاوێتە کرا.

"ئەوە شتێکە براوەتەوە کە من مارکسیست نیم". دواتر مارکسیستە جۆراوجۆرەکان هەوڵیاندا ئەم ڕستەیە بێ ڕەونەق بکەن و، بە کاردانەوەی قۆناغێکی بەرامبەر بە لایەنگرە فەرەنسایییەکانی لە قەڵەمیدەن و، وەکو ئینگلز مارکس بکەن بە ئەفسانە. بەڵام لێرەدا نەغمەی توندی مارکس و توندوتیژیی ئەو ڕستەیەی (کە یەکێکە لە ئەدگارە دیارەکانی شێوەی دەربڕینی ئەو) کۆمەکی من دەکات. مارکس بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە لەو ڕستەیەی سەرەوەدا ڕوونیدەکاتەوە کە ئامادە نییە بەرامبەر کردەوەو بیروباوەڕی سیاسیی کەسانی دی خۆی بە بەرپرسیار بزانێت. ئەو بەردەوام خۆی بە سەربەخۆ



و گەورەتر لە کاری کەسانێك دەزانی کە خۆیان بە قوتابی و لایەنگری ئەو لە قەڵەمدەدا. ئەم کتێبەی لە بەردەستتدایە دەربارەی مارکسە نەك مارکسیزم، هەوڵدەدات مارکس پاك بکاتەوە لە ماکیاژی هەموو ئەو راڤانەی پەیڕەویکارە جۆرلوجۆرەکانی بۆیانکردووە. لەم کتێبەدا نە نیشانەی لێکدانەوەکانی وەچەی یەکەمی پەیڕەویکارانی ئەو دەبینیتەوە، واتە لافارگ، برنشتاین، ببل، مرینگ، کاوتسکی، پلیخانۆف، لابریۆلاو کەسانی دی، نە نیشانەی لێکدانەوەی مارکسیستە ڕووسیایی‌و چینی‌و هتد.. هەوڵم داوە مارکس لە دەرەوەی کاری کەسانێك بناسێنم کە هەریەکەیان ویستوویانە بە جۆرێك لە جۆران درێژە بە ڕێگا فیکری و تیۆرەییەکەی بدەن. مارکسێکی ئازاد لە مارکسیزم و، ئێستا دەتوانم بڵێم مارکسێکی پاش مارکسیزم. مارکسێك بێبەری لە مێژوویەك کە بە ناوی ئەوەوە دەستیان پێ کرد، چ لە هێزو تواناکانیداو، چ لە کەموکورتی و ناشیرینیەکانیدا. ویستوومە ڕێی کارێکی دژوار بگرمەبەر: دەقێك بخەمەڕوو جیا لەو لێکدانەوە زۆرانە کە دەیشارنەوە. هەڵبەتە دەزانم کە ئەمەی منیش هەر یەکێکە لە لێکدانەوەکان و لەم گەمە هێرمنیۆتیکیە دەرباز بوونم نی‌یە. هەروەها دەشزانم کە هەرچەندە کار لەسەر کارەکانی مارکس خۆیشی بکەم، بەڵام دیسانەوە ڕاستیەکی تاڵ خۆی بەسەر من و خوێنەردا دەسەپێنێت: چەندەها وەچە لە مارکسیستەکان بە ڕادەی جیاواز گرفتاری تێگەیشتنێکی میکانیکیانەی "گۆڕانی دیاردە سەروو بونیادیەکانی سەرچاوەگرتوو لە گۆڕانکارییەکانی بونیادی ئابووری" بوون. ئەوانە لەسەر بنچینەی کۆمەڵێك لێکدانەوەی دۆگماییانە کارەکانی مارکسیان دەخوێندەوەو، بانگەشەیان بۆ دەکردو، دەیانبردە مەیدانی ململانێی چینایەتیەوەو، دەیانکردە هێزێکی ماتەری. کارێکی هەروا ئاسان نی‌یە لەم "شێوەی دەرکەوتنە" تێبپەڕین و بگەڕێینەوە سەر کارەکانی مارکس خۆی، بەڵام هەر دەبێ واش بکەین.

ئەو شتەی لای من گرنگە، مارکسیزم تێدەپەڕێنێت. جەختکردنی زیاد لە پێویست لەسەر گرنگیی قوتابخانە فەلسەفیەکان لە گوتاری فەلسەفیدا؛ کارێکی ڕاست نی‌یەو، دەبێتە مایەی هەڵەی تیۆرەیی. زەقکردنەوەی بایەخی فەیلەسووفان بە ڕێبازێکی تایبەتی؛ بەردەوام وامان لێدەکات جەخت لەسەر فەسڵە هاویەش و وێکچووە ڕواڵەتیەکان بکەین و، گرنگترین شت لە کاری ئەو فەیلەسووفەدا کە دانسقەیی و ڕاستگۆیی هزرو سروشتی تاکانەی ئەقڵانین؛ فەرامۆش بکەین. وا دێتە بەرچاو کە زەقکردنەوەی فەسڵە هاویەشەکان زیاتر سەبارەت ئەو "قوتابخانانە" ڕاست بێت کە دوای فیکری فەیلەسووفێکی گەورە هاتوونەتە ئاراوە، هەر بۆ نموونە ئەفلاتوونیە تازەکان و کانتی‌یە تازەکان. لە کاتێکدا ئێمە ژمارەیەك لە بیرمەندان دەخەینە خانەیەکەوە کە بیرمەندی سەرەکی تیایدا کە دەسپێشخەر بووە چەندەها جار بەرزترو باڵاتر لە هەر قوتابخانەو ڕێبازێك کاری کردووە. فەیلەسووفی گەورە هەروەکو هایدیگەر دەڵێت نە سەر بە ڕێبازێکەو نە بە مانای وردی وشەکەش خولقێنەری قوتابخانەیەکە. عادەتەن لێکدانەوەکانی پاشترن کە دەبنە مایەی وەهمی چوونیەکیی هزرەکان. بەڵام بە وردبوونەوە لە تایبەتمەندییە هێرمنیۆتیکیەکانیش دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کە جیاوازییەکان ڕۆڵیان زۆر زیاترە لە چوونیەکیەکان. ئەگەر ئەو خاڵەی سەرەوەمان پێ قبووڵ بێت، ئەوکات حوکمی ئێمە لە بارەی پەیوەندیی مارکس بە مارکسیزمەوە بە شێوەیەکی بنبڕانەتر دەردەکەوێ. دانانی مارکس لە خانەی سۆسیالیستەکان، هیگلی‌یە لاوەکان، ڕیالیستەکان، ماتێریالیستەکان و هتد دا.. تایبەتمەندی و مەزنیی کاری فیکریی ئەو کەمڕەنگ



دەکات. لە ڕووی مێژووییشەوە ئەم مەسەلەیە سەلماوە کە خۆدانە دەست مارکسیزم، هەرچەند ڕۆڵی بژاردە جۆراوجۆرەکانیشی تیا بووبێت بەڵام پتر لەهەر شتێك لە خزمەتی پێکهاتنی ئایدیۆلۆژیی حیزبە کۆمۆنیستەکاندا بووە. ئیدی بە شکستی ئەو حیزبانە، مارکسی پەیامبەرو پێشبین، مارکسی پێشڕەو، لەنێوچوەو باشتریش. سەرئەنجام ئەوەی مایەوە نووسین و بیروبۆچوونەکانی مارکس بوو، دوور لە سوود وەرگرتنە کردەیی و پەلەکان لێی، وەکو بەشێك لە کەلتووری ئەورووپایی، کە بە ناچاری شایەتی ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنیتەیە.

**8-سەبارەت بە ئینگلز:**

ئەو تێگەیشتنە تەقلیدیەی بۆ پەیوەندیی فیکریی نێوان مارکس و ئینگلز لە ئارادایە، تاڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ چالاکیی لایەنگرەکانیان لە ئینتەرناسیونالیزمی دووەم و حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیادا لە دواساڵانی ژیانی ئینگلزدا.

جەختکردنەوەی ئینگلز لەسەر دۆستایەتی‌ی نزیك و هاوبیریی لەگەڵ مارکسداو پێکەوە کارکردنیان لە نووسینی سێ کتێبدا. لە سەرێکەوە، پشتیوانیکردنیان لە یەکتری بەرامبەر نەیارەکانیان لەنێو بزاڤی کرێکاریدا، کەسانێکی وەکو لاسال و باکونین و پرۆدۆن لە سەرێکی ترەوە، سەرەنجامیش ڕۆڵی ئینگلز لە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك یادداشتدا کە بە بەرگی دووەم و سێیەمی (سەرمایە) ناسراون، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی کە جیاوازییە فیکرییەکانی نێوان ئەم دووانە ئەفەرۆز بکرێ. بە بڵاوبوونەوەی هەندێ کاری وەکو (مێژوو و هۆشیاریی چینایەتی)ی لۆکاچ و، (مارکسیزم و فەلسەفە)ی کارل کرۆش لە دەیەی **1920**دا، دەرفەتی ئەوە هاتە پێشەوە کە تیۆرەسازان بە شێوەیەکی جیددی سەبارەت فیکری فەلسەفی‌ی مارکس و جیاوازیی ڕوانینی لەگەڵ ڕوانینی ئینگلزدا بتۆژنەوە. مارکس ئەوەندەی ئینگلز گرفتاری ڕوانینێکی میکانیکی و میتۆدی "زانستی" بە مانای تەسلیمبوون بە نموونەی زانستی ئەو سەردەمە واتە زانستە سروشتیەکان؛ نەبوو. هەرگیز واش نەیدەڕوانیە دیالەکتیك کە بریتی بێت لە چەند یاسایەکی ئەمر کە لە زانستی سروشتی‌ی ئەو سەردەمەوە وەرگیرابن. ئەو چوونیەکیانەی کە مارکس لە نێوان میتۆدی کاری خۆی و میتۆدی زانستە سروشتیەکاندا دەیبینیەوە و لە هەندێ ئاماژەی پەرتدا هاتوون، تا ئێستاش جگە لە ئەنجامگیریی حەتمیانەو قەدەریانە، ڕێ بۆ لێکدانەوەی دیکەش خۆشدەکەن. لە کاتێکدا ئینگلز بە وردی بەرگریی لە یاساکانی دیالەکتیك وەك یاسای حەتمی و مەحکەمی پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان و، بەکاربردنی هەندێ لە ئەنجامەکانی توێژینەوەکانی زانستە سروشتیەکان لە شیکردنەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا کردبوو. تەنانەت زاراوەکانی ماتێریالیزمی دیالەکتیك و ماتێریالیزمی مێژوویی کە لە گۆڕانی ئایدیۆلۆژیانەی لینینیزمدا ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبوو، دروستکراوی ئینگلزن و مارکس ئەو زاراوانەی بەکارنەهێناوە. لە ڕاستیدا ئینگلز ماتێریالیزمی مێژوویی گەیاندبووە ئاستی جیهانبینی‌یەك یان ***Weltanschauung***. زانستگەراییەکەی ئینگلز لە هەوڵیدا بۆ دروستکردنی گونجانێك لە نێوان ڕوانینی مارکس و تیۆرەی پەرەسەندنی داروینذا بە باشی ئاشکرا دەبێت. ئەو هەوڵەی کە لە هیچ شوێنێکدا هێندەی ئاشکرابوونی لە نووسراوی "ڕۆڵی کار لە پەرەسەندنی مەیموندا بۆ مرۆڤ"دا ڕوون نی‌یە، کە ئینگلز لە ***1876***دا واتە هێشتا مارکس لە ژیاندا بوو ئەوەی نووسی و نزیکەی بیست ساڵ دوای ئەوە بڵاوبۆوە. (ب-ئا-3: 66-***78***). بەهەر حاڵ مارکس خۆی لە هەموو کەسێك باشتر بواری جیاوازییەکانی کاری خۆی و ئینگلزی



دەزانی و، بۆ نموونە لە نامەیەکدا بۆ ئینگلز (کە لە 1ی ئۆگستی 1856دا نووسیویەتی) دەربارەی یەکێك لە ڕافەکارانی هزری خۆی نووسیبووی: "ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ئەو هەردووکمان وەکو یەك کەس باسدەکات و، دەڵێت کە مارکس و ئینگلز دەڵێن.." (م ئاثا- 29: 68).

لە سەرێکی ترەوە و بە ڕەچاوکردنی جیاوازیی نێوان ئەم بیرمەندە، بە دڵنیاییەوە دەبێ بگوترێ کە لە نێو سەرکردەکانی بزاڤی کرێکاریی ڕۆژگاری مارکسدا؛ ئینگلز زۆرترین کاریگەریی لەسەر ئەو هەبوو، لە زۆر مەسەلەی سیاسیشدا هاوڕا بوون.

هەرچەند بمانەوێ جیاوازییەکانی نێوانیان لە بواری تۆژینەوەی تیۆرەیی و میتۆدناسیدا بخەینەڕوو، دیسانەوە ناچار دەبین لە بواری بیروباوەڕی سیاسی و چالاکیی حیزبیدا باس لە هاوبۆچوونیی ئەوان بکەین. نموونەیەك بۆ چوونیەکیی فیکریشیان لەم بوارەدا زنجیرە وتارێکە دەربارەی شۆڕشی ئەڵمانیا لە 1848دا کە ئینگلز نووسینی بەڵام بەناوی مارکسەوە بڵاوبوونەوەو ئەمڕۆ بە ناوی (شۆڕش و دژە شۆڕش لە ئەڵمانیادا)وە ناسراون. لێرەدا بە خراپی نازانم باس لەوە بکەم کە نووسینە هاوبەشەکانی مارکس و ئینگلز تەنها بەشێکی بچووکی کۆی کارەکانی مارکس پێکدێنن. ئەو سێ کتێبەی پێکەوە نووسیویانن؛ یەکێکیان (خێزانی پیرۆز)ە کە تیایدا دابەشکردنی کارە فیکرییەکە گەڵاڵە کراوە و هەر بەشێك لە کتێبەکە نووسینی یەکێکیانەو هەر کەسەو بەرپرسیارە لە بەشی خۆی. کتێبێکی تریان (ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی)یە کە لە ژیانی خۆیاندا بڵاونەبۆوەو وا پێدەچێت لەسەر بنچینەی هاوبیری و کاری هاوبەش نووسیبێتیان، بەڵام هەندێ بەشی گرنگی لە نووسینی مارکس خۆیەتی. سێیەمیشیان دەقی (مانیفێستی حیزبی کۆمۆنیست)ە کە بە دڵنیاییەکی زیاترەوە دەتوانین بڵێین بە پشتبەستن بە تۆژینەوەو هاوکاری و هاوبیری نووسراوە، ڕۆڵی ئینگلزیش تیایدا زەقەو، ناشبێ ئەوەمان لە یاد بچێت کە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم کتێبە نووسینێکی کورتی گرنگی ئینگلزە بەناوی (بنەماکانی کۆمۆنیزم کە لە ئۆکتۆبەری 1847دا نووسراوەو لە ساڵی 1914دا بۆ یەکەمجار بڵاوبۆوە (م-ثا-6: 341-358).

هاوکاریی نێوان مارکس و ئینگلز لە کاری سیاسیدا، دوور لە زێدەگۆیی مارکسیستەکانی دواتر، پشتبەستووە بە هەڵوێستی هاوبەشیان لە زیندووترین ساتەکانی کاری سیاسیدا.

دەربارەی چارەنووسی شۆڕشی 1848 و، پلەوپایەی یەکێتیی کۆمۆنیستەکان و، پێویستیی ئینتەرناسیونالیزمی کرێکاری و، گرنگترین مەسەلە ناوخۆییەکانی ئینتەرناسیونالیزم و، ناکۆکی لەگەڵ لاسال و پرۆدۆن و ئەنارشیستەکان و باکۆنیندا بە تەواوەتی هاوڕا بوون و، لە مەسەلە ناوخۆییەکانی سۆسیال دیموکراسیی ئەڵمانیاشدا چەندەها جار یەك هەڵوێستیان ڕاگەیاندووە. ئینگلز یەکەمجار بەیاننامەی "شۆڕشی بەردەوام"ی لە ساڵی 1847دا خستەڕوو و، لەو گۆڕانکارییانەشدا کە ساڵی دوایی لەو تیۆرەیەدا ڕوویدا، ڕۆڵی لەرۆڵی مارکس کەمتر نەبوو. دەبێ ئەو خاڵەشمان لەبیر نەچێت کە کتێبە دیارەکەی ئینگلز واتە (بارودۆخی چینی کرێکاری ئینگلستان) (گرنگترین دۆکیۆمێنتێکە کە لە بارەی بارودۆخ و ژیانی کرێکارانی ئینگلستانی قۆناغی ڤیکتۆریاوە ماوەتەوە) کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر مارکس و، بە بۆچوونی زۆر لە ڕەخنەگرانیش مارکس لەژێر کاریگەریی تۆژینەوەکانی ئینگلزدا ڕووی لە لێکۆڵینەوەی ئابووریی سیاسی کرد. بەهەر حاڵ، هێندەی پەیوەندیی بەم تۆژینەوەوە هەیە دەبێ دان بەوەدا بنێم کە بەردەوام قەناعەتم بەوە



زۆر بووە کە لە کتێبێکدا کە دەربارەی کارو بیروبۆچوونە سیاسیەکانی مارکسە، تۆژینەوە لە بیروڕاکانی ئینگلز کارێکە ناچارییەو، هۆی ئەو هەموو ئاماژەو گەڕانەوانەش بۆ ئینگلز لەم کتێبەدا لەوەوە هاتووە. بەڵام دەمەوێ ئەوە بیری خوێنەر بهێنمەوە کە بە پێچەوانەی خواست و ویستی ئینگلزی بە ساڵاچووەوە، ئێمە لێرەدا بەرامبەر "ئینگلزێکی مارکسیست نین". من لەم کتێبەدا ئەو وەکو "دۆستیئەمەکدار" و "یەکەم پەیڕەویکاری مارکس" ناناسێنم، بەڵکو هەوڵدەدەم کەسێتیی فیکریی بخەمەڕوو، وەکو بیرمەندێکی سەربەخۆ باسی بکەم کە کاریگەرییەکی زۆری بۆ سەر بەرەو پێشەوەچوونی کاری فیکریی مارکس هەبوو، خۆیشی زۆر کەوتە ژێر کاریگەریی مارکسەوە. ئەمە بەبێ ئەوەی ناکۆکیی خۆم لەگەڵ "دیالەکتیکی سروشت" (کە ئینگلز لە کتێبێکدا بە هەمان ناوەوەو هەروەها لە "ئەنتی دۆرینگ"یشدا باسیدەکات)دا بشارمەوە.

لەم کتێبەدا چەندین جار لەکاتی ئاماژەکردندا بۆ نووسینە هاوبەشەکانی مارکس و ئینگلز دەخوێنیتەوە کە "مارکس نووسیویەتی کە..". بە دڵنیاییەوە دەبێ بڵێم کە ئەم شێوەی بیرهێنانەوەیە بە مەبەستی بە بچووك پیشاندانی کاری فیکریی ئینگلز و کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئەو نییە، بەڵکو تەنها ئەوەیە کە بابەتی ئەم کتێبە بیروباوەڕەکانی مارکسەو، ویستوومانە خۆمان لە دووبارە کردنەوە بپارێزین و هیچی دی.

### 9-بۆ مارکس دەخوێنینەوە؟

ترێل کارڤەر لە یەکەمین دێڕی پێشەکیەکەیدا بۆ کۆمەڵێك وتار دەربارەی مارکس پرسیویەتی: "بەڕاستی بۆ دەبێ (کارەکانی) مارکس بخوێنینەوە؟". ئەوەمان وەبیر دێنێتەوە کە گەڕان بەدوا مانادا لە دەقە کۆنەکاندا، بە ئاشکرا ئەزموونێکی ناهەموارە. ئەو ڕووداو و باوەڕانەی ڕابردوو، بۆ نموونە هەموو ئەو شتانەی کە بوونەتە مایەی پەیدابوونی بیروبۆچوون و نووسینەکانی مارکس، ئێستا لە ئارادا نەماون.

ئێمە ناتوانین لە ڕابردوودا، بۆ نموونە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بژین. تەنانەت دواکەوتووترین شێوەی خواستی ژیان لە ڕابردووداو ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، لە ئامانج و خواست و هۆیەکانی ئەمڕۆ ئاگادارمان دەکەنەوەو لەسەر ئەوانە بەندن. بەهەمان مەنتیق، دەتوانین بە شێوەیەکی جیاواز بڵێین کە بیرکردنەوە لە سەردەمێك کە "سەرمایە" و "گرۆندریسە"ی تیا نووسراون، مانای وایە کە سەردەمەکەی ئێمە هێشتا دەستەوێخەی هەندێ گیروگرفتە کە توانیومانە (لە ڕاستیدا هەندێك لە ئێمە) شتێك دەربارەی ئەو گیروگرفتانە لەو کتێبانەدا ببینینەوە. ڕاستە کە چیدی ناتوانین بۆ ڕابردوو بگەڕێینەوە، بەڵام لە سەرێکی تریشەوە ناتوانین نکوڵی لە ڕابردوو بکەین. زۆربەی جاران سەرنجمان داوە کە بەبێ گرنگیدان بە پێشینەی دیاردەکان ناتوانین بیانناسین. تەنانەت لە زانستی زمانناسیی ئەمڕۆشدا میتۆدە شیکاری و هاوزەمانیەکان کە وەڵامی گەلێ لە مەسەلەکان دەدەنەوە، ناتوانن لافی ئەوە لێبدەن کە چارەسەری تەواوی مەسەلەکانیان لایە. بۆ وەڵامدانەوەی زۆر مەسەلەی گرنگ وا پێویست دەکات ڕوو بکەینە زمانناسیی مێژوویی و میتۆدی ناوزەمانی. وردبوونەوەیەك لە فەلسەفە جۆراوجۆرەکانی زمان کە ئەمڕۆ لە ئاراداان بە باشی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مێژووی پەرەسەندنی زمانەکان تیایاندا چەند بە گرنگ ژمێردراوە. بەبێ ڕیشەناسیی وشەکان ناتوانین تەسەوری فەلسەفەکەی هایدیگەر بکەین. بەبێ خستنەڕووی چەمکی نەریت، باسی هێرمنیۆتیکای گادامێر ناکرێ.



تەنانەت لێکدانەوە بەو مانایەی کە دەیفیدسۆن ئەیخاتەڕوو، لایەنی مێژوویی خۆی هەیە.

مێژوو بە شێوەیەکی دیکەش خۆی بەسەرماندا دەسەپێنێت. "هەنووکە" ساتەوەختێکی مێژووییترو تازە نییە. بەڵکو درێژبوونەوەیەکی مێژووییە. ئێمە بۆ قبوڵکردنی سروشتێکی مێژوویی تایبەتی سەبارەت بە دیاردەیەك جگە لە بەڵگەنامە پەنا بۆ چیی تر دەبەین؟ ئەو بەڵگەنامانە خۆیان زادەی لێکدانەوەی ڕابردوون. هیچ هۆیەك نییە وامان لێ بکات (وا بزانین ئەم بەڵگەنامانە بە شێوەیەکی تەواو و ڕەها لەگەڵ ڕاستیدا یەکدەگرنەوە. فالتەر بنیامینیش دەڵێت ڕابردوو وەکو ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە دەیزانین؛ لە ڕێی ئەو بەڵگەنامانەوە دەبێتە کۆڵەکەی تێگەیشتنی ئێمە کە فەتحکار (فاتح)ەکان جێیانهێشتووە. لە تێزی حەوتەمی "چەند تێزێك دەربارەی فەلسەفەی مێژوو"دا دەخوێنینەوە کە: "پەیڕەویکارانی مێژووگەرایی لە ڕاستیدا لەگەڵ کێدا هاوڕان؟ ئەو وەلامەی کە ناتوانین لێی هەڵێین ئەمەیە: لەگەڵ فەتحکاراندا. تەواوی حوکمڕانانیش میراتگری ئەوانەن کە پێش ئەوان فەتحکار بوون. بەمجۆرە هاوڕازی لەگەڵ فەتحکاراندا بێ سێ و دوو لە بەرژەوەندیی حوکمڕاناندایە. ماتێریالیستی مێژوویی باش دەزانێت ئەم قسەیە یانی چی. هەر یەکێك لەوانەی فەتحکار بوون تا ئەم ساتە وەختەش بەشدارە لەو کەژاوەی سەرکەوتنەدا کە تیایدا حوکمڕانانی ئەمڕۆ پێ بە پشتی نشوستخواردووواندا دەنێن. بەپێی دەستووری کۆنیش دەسکەوتەکانیش لەم کەژاوەی سەرکەوتنەدا نمایشدەکرێن. ئەمانە ناودەنێن گەنجینەی کەلتووری، ماتێریالیستێکی مێژوویی بەجۆرە بێلایەنیەکی سڵەکەرانەوە ئەڕوانێتە هەموو ئەمانە. لەبەرئەوەی ئەو گەنجینە کەلتوورییانەی ئەو لێیان دەتۆژێتەوە کۆمەڵێك سەرچاوەیان هەیە کە ئەو ناتوانێ بەبێ ترس بیریان لێبکاتەوە.

ئەم گەنجینانە بوونی خۆیان تەنها بە قەرزاری هەوڵ و تەقەللای ئەو بیرمەندو داهێنەرە گەورانە دانانێن کە دروستیان کردوون، بەڵکو قەرزاری هەوڵ و تەقەللای لە یادچوو و بێ ناوونیشانی هاوچەرخەکانی خۆشیانن. بەڵگەنامەکان چەند بەڵگەنامەی ژیارن لە هەمانکاتدا هێندەش هی هۆڤێتی (وەحشیەت- بەربەریەت)ن، ڕێك هەرچۆن ئەم بەڵگەنامانە لە هۆڤێتی خالی نین، شێوەی گواستنەوەشیان لە حوکمڕانێکەوە بۆ حوکمڕانێکی دی هۆڤیانەیە. لێرەوە، ماتێریالیستی مێژوویی تا ئەو ڕادەیەی پێویست بێت هەوڵدەدات خۆی لەمانە جیابکاتەوە. بە ڕەوتێکی جیاواز لەم ڕەوتەش لە مێژوو دەکۆڵێتەوە".

بەم شێوەیە، ئێمە لەسەر بنچینەی ئەو لێکدانەوانەی لەو بەڵگەنامانەدا بەرجەستە کراون ڕووبەڕووی مێژوو دەبینەوە. پاش ئەوە، خۆمان هەر لەسەر بنچینەی ئەو لێکدانەوانەی ڕابردوو؛ لێکدانەوەی تازە ئەنجامدەدەین. ئەوەمان پێ قبووڵە کە ناتوانین لەم دەورە هێرمنیۆتیکیە ڕابکەین. تێگەیشتنە پێشوەختەکانمان لێکدانەوەن و، بەبێ ئەوانە ناتوانین لێکدانەوەی تازەمان هەبێت. هەروەکو کارڤەر دەڵێت کاتێ دەپرسین: "ئەم چرکەساتە چییە؟" یان بە دەربڕینێکی وردتر: "مەسەلەی ئێمە لەم چرکەساتە تایبەتیەدا چییە؟" پرسیارێك دەخەینەڕوو کە لە بنەڕەتدا مێژووییە. ئەم پرسیارە لە گێڕانەوەکانی ڕابردوو و لێکدانەوەکانمان بۆ ڕووداو و بیروبۆچوونەکانی پێشوو جیا نابێتەوە. تۆژینەوەی ڕابردوو بە پێویست ناکاتە تێگەیشتنی ئەمڕۆ. بەڵام بۆ تێگەیشتنی ئەمڕۆ، جگە لە ئاوڕدانەوە بە ڕابردوو و بە ئەزموونی هێرمنیۆتیکی ڕییەکی دی شك نابەین. سیستمی مەجازیانەی زمان و، شێوە



بالادەستەكانی ڕۆژگارمان، جیانابنەوە لەو ڕێسا مزریو ئەقلانیانەی كە سروشتێكی مێژوورییان هەیە. نابێ نكوولی لەم خاڵە بكەین، یان بیشارینەوە. پەیوەندییەكانی ژیانی ڕۆژانەمان "شێوە ژیان"ێكی مێژوورییە. لێرەوە، هەر تۆژینەوەو تاقیكردنەوەیەكی بیروباوەڕەكانی ئەمڕۆ، تۆژینەوەو تاقیكردنەوەی لێكدانەوەن بۆ بیروباوەڕەكانی دوێنێ. ئەمڕۆ پیشاندەری هاتنەدیی هەندێ لە شێمانەكانی دوێنێیەو، دوێنێش ناناسرێ تەنها لە ڕێی لێكدانەوەكانی ئەمڕۆوە نەبێت. لەم گوتەیەوە دوو ئەنجام بەدەستدەهێنین، یەكێكیان ئەوەی كە ناسینی پەتیی ڕووداوەكانی ڕابردوو شتێكی مومكین نییە. ئەزموونی ڕابردوو نە تەواو ڕاستەو نە تەواو هەڵەشە، زانستی مێژووش بوونی نییە. ئەزموونی ڕابردوو لەسەر بنچینەی پێودان و دراوەكانی ئەمڕۆ بە ڕاست یان هەڵە سەیر دەكرێ.

ئەنجامی دووەمیش ئەوەیە كە بایەخدانی ئێمە بە ڕابردوو، بریتییە دامێنانی ڕابردوو بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی ئەمڕۆمان. پێودانێكی كارای لێكدانەوەیی بۆ ڕابردوو، لە بارودۆخ و هەلومەرجەكانی ئەمڕۆ بەدەر نییە. تۆژینەوەی ئەمڕۆ لە ڕێی بایەخدان بە سیاق و هەلومەرجەكانەوە پێودان دەخولقێنێت.

خوێندنەوەی نووسینەكانی ماركس، ئەو خوێندنەوەیەی كە ئەمڕۆ دەكرێ، بەرلەوەی هەوڵێك بێت بۆ ناسینی دوێنێ، واتە بۆ تێگەیشتنی سەردەمی ماركس یان ئەوەی بە ڕاستی ویستوویەتی بیڵێت، هەوڵێكە بۆ چارەسەری گیروگرفتەكانی ئەمڕۆ، ئەو ئەمڕۆیەی كە لە گێڕانەوەكانەوە پەیدا بووەو، كەڵەكەكردنی كۆمەڵێك گێڕانەوەشە دەربارەی ئەزموونەكان. ئێمە سەروكارمان لەگەڵ ئەم گێڕانەوانەدا هەیەو ناتوانین لێیان هەڵێین.

بە شێوەیەكی تریش خوێندنەوەی كارەكانی ماركس لە شوێنێكی مێژووییدا خۆی دەبینێتەوە. ئێمە ئەو كارانە دەخوێنینەوە لەبەرئەوەی بەبێ لێكۆڵینەوەو تۆژینەوەو ڕەخنەلێگرتنیان ناتوانین لە بیروبۆچوونی بیرمەندانێك بگەین كە كەوتوونەتە ژێر كاریگەریی ئەوەوەو، ئەو تیۆرە كۆمەڵایەتی و ڕەخنەییانە بناسین كە هەندێ لە ڕەگوڕیشەكانیان دەچێتەوە سەر ئەو. فەیلەسووف دەتوانێ لەبەر گەلێ هۆو لە گەلێ ڕێگاوە كاریگەریی خۆی لەسەر بیرمەندانی پاش خۆی جێبهێڵێت. یەكێك لەم ڕێگایانە توانا یان ڕەسەنایەتیو یان ئەو حەقیقەتەیە كە لە ڕوانین و یان لە بەڵگەهێنانەرەكانی ئەو فەیلەسووفەدایە. لەو ناوانەی كە لەم ڕووەوە یەكسەر دێنەوە یادمان ئەفلاتوون و ئەرستۆن. ڕێگای دووەم ئەوەیە كە دەشێ ئەو فەیلەسووفە توانیبێتی مەسەلە سەرەكییەكانی لێكۆڵینەوەی فەلسەفیی سەردەمی خۆی بگۆڕێت، لەوانەی لەم ڕووەشەوە ناویانمان دێتەوە یاد، هایدیگەرو كانت و ڤیتگنشتاین. ڕێگای سێیەم دەكرێ بە بیروباوەڕەكانی فەیلەسووفەكەوە وابەستە نەبێت، ئەو بیروباوەڕانەی كە بە وردی نازانین وەچەكانی دوایی چۆن لێكیانداوەتەوەو گۆڕیویانەو پاشانیش قبووڵیانكردووە. لێرەدا دەكرێ فاكتەری سەرەكی شێوەی دەربڕین و ئەو میتۆدە تازەیە بێت كە فەیلەسووفەكە لە بایەخدانیدا بە مەسەلەو بابەتە جۆراوجۆرەكان پەیڕەویی لێ كردووە.

لەم ڕووەشەوە دەتوانین ناوی دیكارت و سپینۆزاو لایبنیتس و هیوم بهێنین. ڕێگای چوارەم كە دەشێ لە هەموویان سەرسوڕهێنتر بێت ئەوەیە كە: لەوانەیە فەیلەسووفێك، نەك لەبەرئەوەی لای زۆر كەس مایەی قبووڵكردنەو دوای خۆی بووەتە مایەی باس و خواس، یان لەبەر بەهاداریی ڕێگەو میتۆدو تۆژینەوە تازەكانی، بەڵكو لەبەرئەوەی دوای خۆی



بووەتە مایەی خوێندنەوەی جیاوازو ڕەخنەی وەها لە فەلسەفەکەی کە ئەوانی تری بۆ جووڵەی فیکریو هزری جەدەلی هانداوە، تا ئێستاش باسی لێدەکرێ و کاریگەریی ماوە. وا پێدەچێت لەبەر هەر هۆیەك لەو هۆیانەی سەرەوە تا ئێستاش فیکری مارکس زیندوو بێت.

مارکسیزم بە مانای پەرەسەندن (یان داچوون)ی مێژوویی فیکری مارکس کە زەمەنی ژیانی خۆی تێدەپەڕێنێت، هەروەکو لیوتار دەڵێت بریتییە لە "گێڕانەوەی -بالا". تیۆرەی تیۆرەکان، دوا حەقیقەت، دوا قسە. ئێمە بە وەلاوەنانی ئەم جۆرە باسکردنە یەکلایەنەو ئەم گوتارە دەسەلاتخوازە، بە شێوەیەکی ئازادانە، دەچینەوە سەر کارەکانی ئەو بیرمەندە، واتە مارکس و، لە کارە فیکرییەکانی خۆی ورد دەبینەوە. بەم شێوەیە هەر جۆرە گێڕانەوەیەکی-بالا و تیۆرەکی- بالا وەلاوە دەنێین. بە تەنها ئەو گێڕانەوە- بالایانە وامان لێدەکەن بلێین مارکس لەناوچووە. لە دەرەوەی ئەمجۆرە گوتارە دەسەلاتخوازانەش دەتوانین گوێمان لە دەنگی مارکس بێت. کاتێ دوا گێڕانەوەکان دەربارەی مۆدێرنیتە بخەینە لاوە، بمانەوێ بزانین بیرمەندە جیاجیاکان لە بارەی مەرگەساتەکانی جیهانی مۆدێرن و گیروگرفتەکانی ژیانی ڕۆژانەمانەوە چی دەڵێن؛ دەنگی مارکس دەبیستین و، سەرنج ئەدەین کە ڕۆڵی ئەویش لە فراوانکردنی گوتاری ڕەخنەگرانەدا شتێك نییە ئەفەرۆز بکرێ. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە لە هەلومەرجی تازەشداو لە ئاسۆی تێگەیشتنی ئەمڕۆشدا، بەردەوام دەنگی ئەو کارایی خۆی هەیە، واتە دەگۆڕێ و تازە ئەبێتەوە. خوێندنەوە تازەکان لە زۆر ڕووەوە دەبنە مایەی خولقاندنی هزرو مانای تازە. هەر کاتێ گوێی خۆمان لە ئاست ئاخاوتنێکی ڕەخنەگرانەدا نووقاند، مەحکوم دەبین بە ژیان لە نێو هەلومەرجێکدا کە ڕەخنەگر ڕەتیکردوونەتەوە. لەوانەیە مارکس لەسەر حەق بێت و ژیان لەوجۆرە هەلومەرجانەدا ناهەموار و قێزەون بێت. دەنگی ئەو یارمەتیماندەدات تا لە دژایەتی و ناکۆکیەکانی ژیانی واقیعی خۆمان بگەین. تیۆرە ڕەخنەییەکەی ئەو دەکرێ ببێتە هێزێك بۆ ڕزگاربوون، سەبارەت بە فەلسەفەو زانستە کۆمەلایەتیەکانیش، کە ئەم کتێبە لە بواریاندا پۆلێندەکرێ؛ بایەخدان بە نووسین و تیۆرەکانی مارکس ڕێ بۆ مەسەلەیەکی گرنگ خۆشدەکات: مارکس ڕوونیکردۆتەوە کە نابێ قەیرانی زانستە کۆمەلایەتیەکان بە سادەییەوە بە یەکێك لەو قەیرانانە بژمێرین کە لە لایەنگیریی ڕۆشنبیرانەو فیکرییانەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەم قەیرانە ڕەگوڕیشەی وا لە سیستەمەکانی بەرهەمهێنان و سیستەمە ئایدیۆلۆژییەکانی کۆمەلگای سەرمایەداریدا. لەم ڕووەوە، ڕێگەچارەی ئەم قەیرانەش ناتوانێ تەواو تیۆرەیی، یان تێڕامانکەرو ناسێنەر بێت، بەلکو لە ڕیشەی تیۆرە لەناو پراکتیکەوە سەرچاوە دەگرێو، ئەم پراکتیکە ڕزگاریبەخشەش دەبێ لە بواری دەزگا ڕۆشنبیریو ئەکادیمییەکانداو، هەروەها لە قەڵەمڕەوی ڕێکخستن و کردەی بەرهەمهێنانی ماددیدا بەرەوپێش بچێت. ئایا لە هەلومەرجی قەیرانایی ئەمڕۆدا دەتوانین لەم مەسەلەیە هەلێن و بیری لێنەکەینەوە؟ ئایا تۆژینەوەی مارکس دەربارەی جیاوازیی کاری فیکری و کاری دەستی لە کۆمەلگای مۆدێرندا، بە تایبەتیش ئەمڕۆ کە لە بەردەم گۆڕانێکی تازەداین لە ڕەوتی گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژییەکاندا، نرخی ڕامان و لێوردبوونەوەی جیددیی نییە؟

ژاك دێریدا، ئەو فەیلەسووفە سەربەخۆیەی کە ڕەگوڕیشەی نووسینە ڕەخنەییەکانی سەبارەت بە ڕێبازەکان و تەوەرە مانابیەکان و مەیلی بۆ ڕوانگەی ڕێژەیی وا لە کارەکانی نیچەدا، ڕۆڵێکی دیاری هەبوو



لەوەدا کە وەچەیەك لە ڕۆشنبیرانی ئەورووپایی لە مارکسیزمی ئەرتۆدۆکس و، کۆپییە شۆڕشگێڕانەکانی بۆ چارەسەرکردنی گرفت و قەیرانە کۆمەلایەتییەکان بتۆرێن. دێریدا لە یەکێك لە کتێبەکانیدا کە ناوی "تارماییەکانی مارکس"ە. دەنووسێت: "تەواوی ژنان و پیاوان لە سەرتاسەری جیهاندا، بیانەوێ و نەیانەوێ ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی دیاریکراو میراتگری مارکس و مارکسیزمن. میراتگری پرۆژەیەکی تەواو دانسقە (یان بەڵێنێکی دانسقە)ن کە شێوەیەکی فەلسەفی و زانستی‌ی هەیە.

ئەم شێوەیە لە بنەڕەتدا نا- دینی‌یە، بە مانای دینێکی پۆزەتیڤی، ئەم شێوەیە ئەفسانەیی نی‌یە، نەتەوەییش نی‌یە.. شێوەی ئەم بەڵێنە لەگەڵ ئەم پرۆژەیەدا تەواو دانسقەیە" دێریدا لەسەری دەڕوات و دەڵێت ئەمە یەکەمجارە لە مێژوودا کە ڕووداوێك لە شێوەی گوتارێکی فەلسەفی و زانستیدا بە جارێ لە ئەفسانەو دین و نەتەوایەتی و هەموو شتێکی سۆفیانەو ڕەمزئامێزی نەتەوەیی قوتار دەبێت. دێریدا ڕاستدەکات، ئەم شتانە لە کاری مارکسدا نەبوون، بەلام بە پەیدابوونی "مارکسیزم" هەموویان گەڕانەوە.

فیکری مارکس گرنگە لەبەرئەوەی لە توانایدایە لە گفتوگۆی کەلتووریی نێوان بیرمەندان و فەیلەسووفاندا ڕۆڵێکی گرنگ بگرێتە ئەستۆ. لەبەرئەوەی مارکس قسەی تازەی هەبوو بۆ گوتن، ئەم قسانەش ڕێیان بۆ پرسیاری تازە خۆشکرد، پرسیاری وەها کە لە شتە بیرلێنەکراوەکان ئاگادارمان دەکەنەوە، تەنانەت لە کاری خۆیشیدا. ستایشی من بۆ مارکس ستایشکردنێك نی‌یە بۆ مامۆستایەك کە دوا قسەی کردبێت. من باوەڕم بەوە نی‌یە کەسێکی لەمجۆرە هەبێت. حەقیقەت لای مارکسیش نی‌یە، بەلام خوێندنەوەی کارەکانی (بەبێ ئەوەی کە خۆیشی بیەوێت یان هەوڵبدات) یارمەتیمان دەدات تا لە ڕێی گەڕانماندا بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت، لە بری باوەڕهێنان بە حەقیقەتێکی بابەتی و دەرەکی، تێبگەین کە خۆمان لە ڕێی هێزی زمان و، توانای گوتارمانەوە؛ لە حاڵەتی داهێنانی حەقیقەتداین. مارکس دەرمانی ڕزگاربوونمان ناداتێ، بەلام ئەوەمان بیردەهێنێتەوە کە نەخۆشین و، وا چاکترە مشوورێکی چارەسەرکردنی خۆمان بخۆین. ئەو هەندێ دەرمانیشمان بۆ دەستنیشاندەکات. بەلام لەسەر ئێمەیە کە لە ئاستی کاریگەریی ئەو دەرمانانە بتۆژینەوە.

فەلسەفە گفتوگۆیەکە کە لە نێوان فەیلەسووفاندا ڕوودەدات. لەم نێوانەشدا هیچ بیرمەندێك نی‌یە بتوانێ دوا قسە بکات. کەس ناتوانێ بە شێوەیەکی بێ هاوتایانە بڕیاری ئەوانی تر بداتەوە. کەس بە حەقیقەت ناگات. کەس ناتوانێ لە داوی گوتاری هزرئامێزانەی سەردەم، یان وەکو فۆکۆ ناوی لێناوە لە داوی "ئەپستیم" ڕابکات. فەیلەسووفێك نی‌یە کە زۆر پێش سەردەمەکەی خۆی بکەوێت. هەندێ جار مێژوو تاقیگەیەك بۆ تاقیکردنەوەی بیروباوەڕەکان و پێشبینیەکانی فەیلەسووفە بیر قووڵەکان دەسازێنێت. هەروەکو چۆن بە درێژایی سەدەیەك و پاش مەرگی، تاقیگەیەکی لەمجۆرەی لە سەرانسەری زەویدا بۆ مارکس ساز کرد. ئەو دەرسەی کە پێیشیداین سادە بوو: شتێکی بەرزتر لە ناوەڕۆکی کارو، قووڵایی پەیامە فەلسەفیەکەی و میتۆدەکەی هەبوو. ئەو شتەش، ئەو پەیوەندییە بوو کە لە نێوان کارەکانی ئەو و فیکری فەلسەفی‌ی کەسانێکدا دروستبوو کە ماوەیەك دوای ئەو دەستیان بە نووسین کردو، کارەکانی ئەو بە ڕواڵەت لەگەڵ نووسینەکانی ئەوانیتردا جیاوازییەکی زۆریان هەبوو. واتە کەسانێکی وەکو نیچە و ڤیبەرو فرۆید. پەیوەندیی نێوان هزرەکان، نزیکی و دوورییان لە



یەكدی، گرژیو جیاوازییان، هەروەها میتۆدی تۆژینەوەی فەلسەفییان، كۆمەڵێك شتی گرنگن. ئێمە دەبێ لە ڕێی بایەخدانمانەوە بە ناوەرۆكی تۆژینەوەكان و چەند ڕەهەندیی هزرەكانەوە ئەو میتۆدە بناسینەوە. لە ناوماندا زۆر كەس هەن لافی ئەوە لێدەدەن كە ئەم میتۆدەیان ناسیوەتەوە. ئەی كەواتە ئەم بەرگە نەگرتنی بیروبۆچوون و ڕەخنەی یەكترییە لە كوێوە هاتووە؟ ئەو ڕەتكردنەوە جەسوورانەیەی هەندێ فیكری فەلسەفی لە كوێوە هاتووە كە بەری ڕەنجی عومری فەیلەسووفێكن و لەوەش گرنگتر سەر بە نەریتی ئەقڵانییەتی فەلسەفین؟ ئەم ڕەتكردنەوەیەی بونیادی فیكری فەلسەفی لە كوێوە هاتووە؟

فۆكۆ سەروەختێ نووسیبووی: "فەلسەفە چییە جگە لە ڕێگایەك بۆ بیركردنەوە، نەك بە تەنها بۆ ئەوەی كە چی ڕاستەو چی خراپە، بەڵكو بۆ پەیوەندیی ئێمە بە حەقیقەتەوە.. فەلسەفە هەیەو، ئەو بزاڤەی كە هاوشانێتی- هەڵبەت نەك زۆر بە سەختی بگیرێ، یان بە نادڵنیایی و خەون و خەیاڵاتئامێزانە- دەتوانێ لەو شتەی كە وەكو حەقیقەت قبووڵكراوە جیابێتەوەو، بە دوای بنەمای دیدا بگەڕێن. فەلسەفە هەیەو، جێگۆڕكێ و ئاڵوگۆڕی شێوەكانی بیركردنەوەو، گۆڕینی بەها قبووڵكراوەكان و، ئەو كارانەی كە دەبێ ئەنجامبدرێن تا بتوانین بە جۆرێكی دی بیربكەینەوەو، كارێكی تر بكەین و، ببین بە ئادەمیزادێكی تری جیا لەوەی هەین". ئەگەر ئەمە بە پەیامی فەلسەفە بزانین، كەواتە دەبێ بیربكەینەوە، بخوێنینەوە، بتۆژینەوە، زوو باوەڕ بە شت نەكەین، درەنگ لە شت دڵنیابین، یەقینمان كەم بێ، بە گومانەوە لە دەستەواژەو گوتارەكان وردبینەوە. هەر كاتێ بونیادی باوەڕەكانی خۆمان خستە بەر گوتاری فەلسەفی و گفتوگۆ؛ دەگەینە جێیەك. لێگەڕێن با بەر لە هەر شتێك لە ڕێبازە فەلسەفیەكانەوە فێری میتۆدی ڕاستی تۆژینەوە بین، ڕاستی و ناڕاستیی ناوەرۆكەكان دوای ئەوە دێت. ئێمە ئێستا لە سەردەمی گۆڕانكارییە گەورەكان و پەیدابوونی چوونیەكیەكاندا دەژین. لەبری ئەوەی بە شێوەیەكی دۆگماییانەو دەمارگیرانە دوای ئەم فەیلەسووف و ئەو ڕێبازی فەلسەفی بكەوین، ئایا چاكتر نییە خۆمان بە شێوەیەكی سەربەخۆیانە بیربكەینەوە؟ ئەوەشمان لە یاد نەچێت كە هیچ فەیلەسووفێك لە دەرەوەی "دونیای گفتوگۆ"دا نییە.

پەنابردنە بەر بیروڕای ئەم یان ئەو فەیلەسووف بە نیازی وەڵامێكی بنبڕانەو دوا ڕێگەچارەی ئەو پرسیارو كێشە كۆمەڵایەتی و سیاسیانەی كە لە ڕەوتی ململانێماندا دێنە ئاراوە: جۆرێكە لە باوەڕهێنان بە پەیامی مەسیحیانەی فەیلەسووف یان ڕۆشنبیر. من بڕوام بەمە نییە. فێربوونی میتۆدی كاری فەیلەسووفان؛ باوەڕهێنانە بە تێفكرین، بە ڕاستی ئەنجامدانی ئەم ئەركە، ئەم ئەركەی كە پێدەچێ هەرگیز كۆتایی نەیەت.

**پەراوێزو سەرچاوە:**

*1- یەكێك لە بەناوبانگترین نموونەكان كارەكانی فرانسیس فۆكۆیامایە، كە لەم ڕووەوەو بە تایبەتیش لە وڵاتانی ئەنگلۆساكسۆندا ناوبانگێكی زۆری هەیە. بەڕای ئەو پاش هەرەسی كۆمۆنیزم لە یەكێتیی سۆڤێت و ئەوروپای خۆرهەڵات، ئیدی سۆسیالیزم بۆ هەتاهەتایە نەماو، لیبرالیزم بووە تاقە فەلسەفەی سیاسیی ڕەوا.*

*2- ماركس بەوپەڕی ڕاشكاوی و ڕوونیەوە ئەم شتەی ل. نامەیەكدا باسكردووە كە بۆ فریدریش بلت (لە 23ی نۆڤەمبەری 1871دا)ی نووسیوە.*

*3- چەند جارێك ئەنگلز ئەم قسەیەی ماركسی هێناوەتەوە. بۆ نموونە لەو نامانەی بۆ برنشتاین ی نووسیون (لە 3- 2ی نۆڤەمبەری 1882دا)، هەروەها بۆ شمیت (لە 5ی ئۆگستی 1890دا)و، بۆ ئەنجومەنی نووسینی بڵاوكراوەی "سۆسیال دیموكرات" كە بە ئەڵمانی دەردەچوو (لە 7ی سێپتەمبەری 1890دا).*

*ئەم باسەی بابەك ئەحمەدی وەك دەروازەیەك... بۆ ئەو كتێبەی كە لەسەر ماركس نووسیویەتی و لە سەرەتای كتێبەكەدایە كە ساڵی پار چاپكراوەو ئەمەش كتێبەكەیە (ماركس و سیاست مدرن- بابك احمدی- چاپ اول 1379 (2000)، نشر مركز- تهران).*



# لەنێوان تارمایی و بەرجەستەبووندا

## دیرێدا وەك خوێنەرێکی مارکس

● ئامادەکردنی: شاهۆ سەعید

**زەمینە:**

خوێندنەوەی جاك دیرێدا سانا نیە؛ چونکە ئەو کاتەی ئێمە بەدوای بیرۆکەو چەمکە بەرجەستەکاندا دەگەڕێین، دیرێدا لە هەموو پرۆسەیەکی چەمکسازی و هەموو کردەیەکی لە قاڵبدان هەڵدێ، تەنانەت گەر چەمکاندنی خودی شیتاڵگەریش (التفكيكية) بێت. فەلسەفەی شیتاڵگەری لە بنەڕەتدا بۆ ڕەتکردنەوەی چەمکی نێوەندگیری- سەنتراڵیزم دامەزراوە، بە سەنتراڵیزمی وشەو ئایدیاو چەمکەکانیشەوە[1]. ڕستەو دێڕەکانی دیرێدا لەسەر ڕیتمی ڕستەو دێڕە پێشوەختەکان هەڵناقوڵێن، چونکە ئەو مەبەستێتی هەموو پەیوەندییە لۆجیکیە پێشوەختەکانی ناو مێشکمان لە بەریەك هەڵوەشێنێتەوە، هەموو پەیوەندیە دیسپلینکراوەکانی نێوان شتەکان لە بناغەوە هەڵتەکێنێ. ترسناکترین شت -بەبڕوای ئەو- کە هەڕەشە لە کرانەوەی جیهان دەکا ئەو پەیوەندیانەیە کە گریمانە ئینشائیەکان و یاسا هەڵبەستراوەکانی خودی مرۆڤ جڵەویان دەکا.. پەیوەندی و بەردەوامبوونیش شتێك نین جگە لە دوو


ژاك دیریدا



هەرەشەی ترسناك لە تێگەیشتنمان بۆ بوونەوەرەكان و رەسەنایەتییان لەناو خودی خۆیاندا[2]. راستییەكان هەمیشە لە دۆخێكی سەدیمی و نەخەملێوداں.. بۆ ئەوەی لە راستییەوە نزیك بین دەبێ رێگە نەدەین بچێتە دۆخێكی دیسپلینكراو و لەقاڵبدراو.. دەبێ هەمیشە چەمك و ئایدیاكان لە بەریەك هەڵوەشێنین، چونكە هەڵتەكاندنی شتەكان لە بناغەوە تاقە ئەگەری راستییەكی نەخەملێوە[3].

لێرەوە ئێمە لە بەردەم دوو ئەركی سەختداین: یەكێكیان خوێندنەوەی دیریدایە بۆ ماركس، واتە بەریەككەوتنی نێوان ماركسیزم و شیتالگەری؛ دووەمیان خوێندنەوەی ئێمە بۆ دیریدا، واتە خوێندنەوەیەكی ئاسایی بۆ دەقێكی نائاسایی، یان چەمكاندنی دەقێك كە خۆی لە هەموو جۆرە چەمكسازییەك هەڵدێ.. بۆیە ئێمە لە خوێندنەوەی كتێبی (تارماییەكانی ماركس)[4]ی دیریدادا ناچارین پێیەكمان لە ناو شیتالگەری و پێیەكەی ترمان لە دەرەوەی شیتالگەریدا بێت. چونكە ئەگەر لە گۆشەنیگای فەلسەفەی شیتالگەرییەوە دیریدا بخوێنینەوە، ئەوا ئێمە كردەی خوێندنەوە ئەنجام نادەین، بەڵكو كردەی لە بەریەكهەڵوەشاندن ئەنجام دەدەین. بە دیوەكەی تردا ئەگەر بە شێوەیەكی ئاسایی دیریدا بخوێنینەوە ئەوا مەحاڵە ئەو وێنەیەی ماركس بە بەرچاوماندا گوزەر بكا كە دیریدا دەیەوێ تارماییەكانیمان نیشان بدا.

## ماركسیزم/ شیتالگەری

جاك دیریدا هاوسەردەمی فەیلەسوفەكانی پۆست مۆدێرنەیە، هەرچەندە ناكرێ هەموویان لە یەك ئاراستەبەندیدا كۆبكەینەوە، بەڵام رەخنە لە ئەقڵی مۆدێرنە خاڵی هاوبەشی هەموویانە، ئەو رەخنەیەی بەرووی بەهابەندیی مۆدێرنەو یاسا ئەقڵانییە كۆنكرێتییەكانیدا هاتەگۆڕێ. پرسیاری پۆست مۆدێرنە وەك ژان لیوتار دەڵێ لە هەناوی قەیرانێكەوە دێتە دەرێ كە قەیرانی حیكایەتە گەورەكانی مێژووە[5].

بەڵام پرسیاری شیتالگەری لە قەیرانی سەنتراڵیزمە ترسناكەكانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە سەرچاوە دەگرێ. بێگومان ماركسیزم یەكێك بوو لەو حیكایەتانەی كە تا كۆتاییەكانی سەدەی رابردوو خاوەنی سەنتراڵیزمێكی هەژموونداربوو لە دنیای ئەقڵ و لە دنیای سیاسەتیشدا، تا بە شێوەیەكی دراماتیكی شكستێكی گەورەی خوارد. بەڵام دواجار ماركس وەك تارمایی لە دنیای پۆست ماركسیزمدا، لەنێو وشەو دێرەكانی كتێبی (تارماییەكانی ماركس)ی جاك دیریدا دەردەكەوێتەوە، دەركەوتنێك كە لە دەركەوتنەكانی پێشوی ناچێ، ئەوەی دەیبینین ماركسێكی دیكەیە، نتم و سركە، تێزەكانی چەند رەهەندێكی تریان هەیە جیاواز لەو رەهەندانەی كە بە چەند ئاقارێكی دیاریكراودا ئاراستە كراون. دوای تاوانبارکردنی زۆری پۆست مۆدێرنەكان و شیتالگەرەكان و رەخنەگرانی مۆدێرنە بە گشتی بەوەی هەموو جۆرە پابەندبوونێكی ئەخلاقی و سیاسی چەپڕەوانەیان لەدەست داوە، دیریدا دەكەوێتە قسەو ئەو تۆمەتانە رەتدەكاتەوە بەبێ ئەوەی هیچ پابەندبوونێكی ئاشكرا رابگەیەنێ. دیریدا ماركس دەكاتە تەوەری سەرەكی كتێبێك و لە بەرەی هەموو ئەو كەسانە دەچێتە دەرەوە كە ماركس و راگوزەرێكی ناو مۆدێرنە تەماشا دەكەن و، ماركسیزم وەك فەلسەفەیەكی بەسەرچووی مێژوو دەبینن. بەڵام لە هەمان كاتدا بە وریاییەكی زۆرەوە مامەڵە لەگەڵ ماركسدا دەكا بەوەی نامێڵێ بەرجەستە ببێ، لە دۆخی تارماییبوونی بەردەوامدا دەیهێڵێتەوە، چونكە چالاكی ماركس لە مێژوودا وەك تارمایی دەستی پێكردو وەك جەستە كۆتایی هات.. ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێككەیشتنێكی گرنگی ماركسیزمی مۆدێرنە و



شیتالگەریی پۆست مۆدێرنەیە.. مارکس هەوڵدەدا لە جیهانی تارماییەکانەوە بچێتە جیهانێکی بەرجەستە. بەڵام دیریدا لە ڕێگای لە بەریەکهەڵوەشانەوەی جیهانی بەرجەستەکانەوە هەوڵدەدا مارکس بگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی تارماییبوون، دۆخێك کە هێشتا مارکس لە چالاکی ناو زماندایە نەك چالاکی ناو مێژوو.

### مانیفێستی تارماییەکان:

"تارماییەك بەناو ئەوروپادا هاتوچۆ دەکا، تارمایی کۆمۆنیزمە" ئەمە یەکەمین رستەی مانیفێستی پارتی کۆمۆنیستە کە لە سەدەی نۆزدەدا لە لایەن مارکس و ئەنگلزەوە دەرچوو. کاتێ ئەو مانیفێستە دەرچوو چەند ساڵێك بوو ناوی کۆمۆنیزم کەوتبووە ناو ناوانەوە، بەڵام ترسێکی ئەوتۆی لە نێوەندە سەرمایەدارییەکاندا دروست نەکردبوو، تا لەو مانیفێستەدا دۆخێکی تری وەرگرت و بوو بە تارمایی، لە فەرهەنگی زانستی نێودەوڵەتی ئەو سەردەمەدا وتارێك دەربارەی کۆمۆنیزم بڵاوبۆتەوە تیایدا هاتووە: "چەند ساڵێکە لە ئەڵمانیا باس لە کۆمۆنیزم دەکرێ، ئێستا کردوویانە بە تارماییەکی هەڕەشەکەر، هەندێ لێی دەترسن و، هەندێکی تریش خەڵکی پێدەترسێنن". دواتر لە ساڵی **1879**دا مارکس باسی هەمان ئەو تارماییە دەکاو لە نامەیەکدا دەنوسێ: "بۆ ئەوەی بۆرژواکان نەترسن، لەمڕۆوە بۆیان دووپات دەکەینەوە کە لە راستیدا تارمایی سور شتێك نیە جگە لە وەهمی تارماییەك کە لە واقعدا هیچ بوونێکی نیە. بەڵام لای بۆرژواکان ئەو ترسەیە کە لە ئەنجامی ململانێدا لە نێوان ئەوان و پرۆلیتاریادا دروست دەبێ"[6].

لە نێوان ئەم دوو دەقەی مارکسدا دوو وێنە دەبینین کە یەکێکیان تارمایی پیاوێکی گەڕیدەیە بەشوێن ئەو پرسیارانەی کە پرسیاری تازەیان لێدەکەوێتەوە، دووەمیشیان وێنەی پیاوێکی بەرجەستەی داڕێژەری ئایدیۆلۆجیایە. ئەڵبەتە دیریدا وێنەی یەکەمی مارکسی مەبەستە کە تەواو لەگەڵ وشەی (تارمایی)دا یەك دێتەوە. مارکسێك کە ئامادەیەو ئامادەش نیە، ناتوانرێ بەڵگە بۆ بوون یان نەبوونی بهێنرێتەوە.

بەڵام داخۆ پەیوەندی لە نێوان تارمایی ناو مانیفێستەکەو تارماییەکانی لای دیریدا چیە؟ ڕەنگە دیریدا وشەی (تارمایی) وەك خوازەیەك لە مانیفێستەکە وەرگرتبێ، چونکە ئەو باس لە مارکسێك دەکا کە لە هیچ وێنەیەکدا تەنانەت لە وێنەی تارمایی ناو مانیفێستەکەشدا بەند نابێ. چالاکی مارکس چالاکیەکە لەناو بازنەی زماندا، بەڵام زمانێك کە سەرەتا کودەتای دژی خودی مارکس و دواتریش دژی جیهان بەرپاکرد. مارکس جیهانی بەو شێوەیە نەدەبینی کە لە واقعدا هەیە بەڵکو بەو شێوەیەی کە وەك تارمایی لەناو زماندا ئامادەیی هەیە. نووسین ئەو شتانە دروست دەکا کە پێشتر نەبوون و بیریان لێ نەکراوەتەوە. کەواتە ئەگەر مارکس لە بازنەی زماندا کاری کردبێ، ئەوا زمان لە فەزای تارماییەکاندا جوڵاوەتەوە، ئەوەتا مارکس لە کتێبی (سەرمایە)دا دەڵێ: "وردبوونەوەی زانستیانە بەرامبەر فۆرمەکانی ژیانی مرۆیی و، دواتر شیکردنەوەی زانستی بەرامبەر ئەو فۆرمانە ڕێگایەك بە گشتی هەڵدەبژێرن کە دواجار پێچەوانەی گەشەکردنی فیعلی خۆیەتی"[7] لەم رستەیەدا دەردەکەوێ کە زمان - نوسین بیرۆکە دەسەپێنێ، چونکە سەرەتا مارکس وردبۆتەوە لەناو بازنەی نوسیندا، نوسینیش ئەو دەرەنجامەی سەپاندووە کە مارکس تێزەکەی لە دەرەوەی یاساکانی واقعی دەرەکی -سەرمایەداری- لەسەر داڕشتووە.. کەواتە مارکس تەسلیمی تارماییەکانی ناو زمان بووەو، زمان



مارکسی نوسیووە... مارکسیش هەوڵی داوە مێژوی جیهان بە جۆرێکی تر وەك رستە زەینیەکانی ناو زمان بنوسێتەوە. چونکە مرۆڤ تەنها مامەڵە لەگەڵ ئەو شتانەدا دەکا کە خۆی دروستی کردوون، بەڵام وەك ئەوەی هەر هەبووبن و خۆی دەستی نەبووبێت لە دروستکردنیاندا. بۆیە مارکس لە شوێنێکدا دەڵێ: "ئێمە تەنها گرفتاری دەستی زیندووەکان نین، بەڵکو گیرۆدەی دەستی مردووەکانیشین"[8].

**دەرگا:**

"کەسێك دێتە پێشەوە دەڵێ: دەمەوێ فێربیم، دەمەوێ بژیم.. بەڵام دواجار بۆچی؟..". دیرێدا بەم چەند رستە ئاڵۆزو سەیرە کتێبەکەی دەستپێدەکا، خواستی ژیان "دەمەوێ بژیم" خواستی هەموو مرۆڤێکە، بەڵام خواستێکە نهێنییەکی سەیری لە پشتەوەیە، چونکە هەمیشە لە بەرامبەری مەرگدا ئێمە خوازیاری ژیانین.. کەواتە مەرگ ئەو رووبەرەیە کە هەموو شوێنێکی تەنیوەو تەنها دەرەتانێك بۆ دەربازبوون لێی پەنابردنە بۆ تارماییەکانی ژیان. کەواتە ئەو کەسەی خوازیاری ژیانە بوونەوەرێکی نێوان مەرگ و ژیانە، یان راستتر ئەو تارماییەیە کە پێیەکی لەناو مەرگ و پێیەکەی تری لەناو ژیاندایە.. بۆ ئەوەی کاریگەریمان هەبێ دەبێ هەمیشە سەرقاڵی ئەو گەمەیە بین، چونکە هەروەکو دیرێدا دەڵێ کاتێ دەربارەی دادپەروەریی قسەدەکەین ئەوە دەربارەی شتێك قسە دەکەین کە بوونی نیە، دەبێ لەسەر ئەوەش کۆك بین کە ئامادەی نیە ئەوسا دەتوانین قسەی لێبکەین. قسەکردن لە بوونەوەرێکی دادپەروەر واتە قسەکردن لە بوونەوەرێك کە لە هەنوکەدا ئامادەیی نیە لە رابردووشدا ئامادەیی نەبووە، بەو پێیەی ئایندەش هێشتا نەهاتووە کەواتە ئەو بوونەوەرە هیچ ئامادەییەکی نیە، هەر ئەمەشە "ئەو چرکەیەی کە وەك تارمایی سەر بە هیچ زەمەنێك نیە"[9].. "چونکە بەو پێیەی دەرکەوتنی تارمایی کارێکی راگوزەرو لەناکاوە، کەواتە لە کاتێکی دیاریکراودا سنوردار ناکرێ.. تارمایی دێت، دەڕوا، سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە.."[10].

**فەرمانەکان:**

بۆچی دیرێدا دەڵێ: "تارماییەکان" و ناڵێ "تارمایی"، واتە بۆچی شێوازی کۆ بەکاردێنێ، لە کاتێکدا لە مانیفێستی کۆمۆنیستدا شێوازی تاك بەکارهاتووە "تارماییەك بە ئەوروپادا هاتوچۆ دەکا". مارکس پێشنیاری وەسوەسەیەك دەکا لە مێژودا، بەڵام ئەو وەسوەسەیە خۆی مێژو هەڵدەبژێرێ و ناخرێتە چوارچێوەی مێژوییەکی تایبەتەوە. وەسوەسە هەمیشە لە سەردەمێکدایە کە سەردەمی خۆی نیە چونکە ئەو کاتەی کە دەگاتە سەردەمی خۆی لە دۆخی وەسوەسەیی دەردەچێ. لێرەوە دیرێدا بڕوای وایە کە مارکس هێندەی پەنای بۆ فەنتازیای شانۆیی بردووە، کە لە رێگای زمانەوە پرۆسەی دەرهێنانەکەی ئەنجام داوە، هێندە پەنای بۆ رەگەزەکانی واقعی ئەو سەردەمەی ئەوروپا نەبردووە، چونکە واقعی ئەو سەردەمە خوازیاری ئەوە بووە کە شتەکان لە دۆخی بەرجەستەبووندا ب· نەك دۆخی تارمایی.. بۆیە نزیکبوونەوەیەك لە نێوان تیوریزەکردنی مارکس بۆ کۆمۆنیزم و تەوزیفکردنی شکسپیر بۆ تارمایی هەیە:

"هاملێت: سوێند بخۆن

تارمایی ژێر زەوی: سوێند بخۆن

هاملێت: (..) تکایە بێدەنگ بن

زەمەن لە دەرەوەی جەمسەرەکانی خۆیەتی

ئەی ئەو چارەنوسە نەفرەتییەی

کە دەتەوێ لە دایك بم تا پەیوەندیت پێوە بکەم!

وەرە، با پێکەوە بڕۆین.."[11].



بەڵام لە سەردەمی مارکسدا تارماییەکان لە یەکێك زیاترن، لە هەموو شوێنێکی ئەورووپادا ئامادەییان هەیە، بۆیە ئەگەر هاملێت بزوێنەری خەیاڵدانی مارکس بووبێت، ئەوا مارکس بزوێنەری پۆل ڤالێرییە کە دەڵێ:

"ئێستا هاملێتی ئەورووپی تەماشای هەزاران تارمایی دەکا (..) ئەو هاملێتە هاملێتێکی رۆشنبیرە کە بە وردی لە ژیانی پاش مەرگی حەقیقەتەکان رادەمێنێ، ئەو تارماییەی کە دەیبینێ بابەتی هەموو کێشەکانیەتی.."[12].

دیریدا بڕوای بە ئاستە روون و ئاشکراکانی زمان نیە، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە زمان دەبێتە ئامرازێکی بیرکردنەوەو هەموو پاکیزەییەك لە دەست دەدا. تەنها رێگا بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو پاکیزەییە بریتیە لە هەلگرتنی سنوری نێوان زمانی بیرکردنەوە (فەلسەفە) و زمانی خەیاڵ (ئەدەب). ئەگەر نیچەو هایدگەر هەوڵیان دابێ رەگەزەکانی ئەدەب و فەلسەفە موتوربەکەن بە یەکدی، ئەوا دیریدا نەك هەر ئەو ئەرکەی ئەنجام داوە بەڵکو سنورەکانی نێوان ئەدەب و فەلسەفەی بە تەواوەتی لەبەین بردووەو گەمەی لە بەریەکهەڵوەشانەوەو جیاوازیی کردۆتە ستراتیژێك کە لە رێگایەوە شوناسێکی تازەی فەلسەفەو ئەدەب لە نێو جوغزی زماندا دێنێتە ئاراوە[13].

(تارماییەکانی مارکس) بە چەند پرسیارێکی ئاڵۆزو تەم و مژاوی دەستپێدەکا دەربارەی غایەتی ژیان و فێربوون. دەسبەجێ لە بەردەم ئەو پرسیارانەدا توشی وەسوەسەیەك دەبین کە هەموو زانیاریە بەڵگەنەویستەکانی پێشومان دەخاتە بەردەم پرسیاری تازەوە، دەریای کامڵبونی مەعریفی ئێمە ئالودە دەکا. دیریدا سەرلەنوێ هەموو حوکم و تیڕوانینە پێشوەختەکانمان سەبارەت بە مارکس لە بەریەك هەڵدەوەشێنێ و پاکیزەییەکی رەسەن دەگەڕێنێتەوە بۆ پرسیارەکانمان. بۆیە هەمان ئەو میتافۆر و گەمە زمانەوانیانە بەکاربێنێ کە شکسپیر لە (هاملێت)دا بەکاری هێناوە، پەنا بۆ ئەو تارماییانە دەبا کە هەموو مانا بەرجەستەکان لەبەریەك هەڵدەوەشێننەوە. هەرچەندە دواجار کەرەستەی ئەویش هەر وشەیەو، هەرچەندە وشەکانیش بەرهەمی دەزگایەکن کە بێبەری نیە لە فەرمانە ئایدیۆلۆجیەکان، بەڵام بۆ ئەوەی وشە ملکەچی ئەو دەزگایە نەبێ پێویستە وەك بەڵگەنەویست لە رەوتی فرێزە دیسپلێنکراوەکاندا خۆی پێشنیار نەکا.. بەڵکو دەبێ هەمیشە بزوێنەری گومان و وەسوەسە بێت.

کەسایەتی هاملێت رەنگدانەوەی دڵەڕاوکێ و گومانێکی هەمیشەییە، پرسیاری ئەو سەبارەت بە کەینونە (هەبم یان نەبم؟!) زادەی وەسوەسەی ئەو تارماییە پەنهانەی پشت قەناعەت و ئایدیا تەقلیدیەکانی ناو ئەقڵی هەموومانە، چونکە پرسیارە ئەنتۆلۆجیە قوڵەکان هەمیشە لەسەر بنەمای گومان (بوون/ نەبوون)، (واقعی/ ناواقعی).. هتد، دامەزراون[14]. ئەگەر مارکس عاشقی شکسپیر بووبێت هەروەکو دیریدا دەڵێ[15]، ئەوا دیریدا لەژێر کاریگەری عەشقی هەردووکیاندایە، خوازیاری ئەوەیە ئەو عەشقە لە نێوان مانیفێستی مارکس و هاملێتی شکسپیردا بە گەرمی بمێنێتەوە. دیریدا گریمانەیەکی بەراوردکاریانە لە شێوازی لێکۆڵینەوە بەراوردکارەکان لە نێوان مارکس و شکسپیردا ئەنجام نادا، بەڵکو تارمایی هاملێت دەخاتە ناو مانیفێستی مارکس و هاوشوناسی لە نێوانیاندا دەدۆزێتەوە[16].

چەمکی رۆح یان دەرون کە هەمیشە لە بەرامبەر جەستەدا قسەی لێدەکرێ لە سێ رەگەزی سەرەکی پێکدێت. پەیوەندییەکی زۆر لە نێوان رۆح و تارماییدا هەیە بە شێوەیەك جیاکردنەوەیان لە یەکتری کارێکی سەختە. بەڵام خاڵی لێکترازان لەو شوێنەوە دەست



پێدەکا کە ڕۆح جەستە وەك پۆشاکێك دەپۆشێ.. تارمایی هەمیشە شتێکی نەبینراوە، چونکە مەرج نیە ئێمە ئەوانە ببینین کە دەمانبینن. لێرەوە دژیوونێکی مێژوویی لە نێوان ئێمەی بینراو و ئێمەی نەبینراودا دروست دەبێ، ئێمە ئەو کاتانە هەست بە بینراوی خۆمان دەکەین کە چالاکین و لە بزاوتاین، بەلام ئەو کاتانەی کە تەنها فەرمان وەردەگرین ئەوا کەسی بینراو ئێمە نین بەلکو کەسی فەرمان دەرکەرە. هاملێت بە تارماییەکە دەڵێ: "بەرەو کوێ دەمبەی؟!.. قسە بکە چیتر لەوە زیاتر لەگەڵت نایەم".. تارماییەکە وەلام دەداتەوە: "گوێ بگرە من تارمایی باوکتم!". ئێمە باوەڕ بە تارمایی دێنین بێئەوەی هیچ بەلگەیەکمان بداتێ، چونکە کاتێ بەلگەمان دەداتێ لە دۆخی تارمایی بوون دەترازێ. هەموو باوەڕکردنێکی کوێرانەش بەرامبەر تارمایی ملکەچبوونە لە بەرامبەر فەرمانەکانیدا. بەلام با بزانین ئەو سێ شتە چین کە تارمایی پێکدێنن.؟

1-ماتەم: ئەم ڕەگەزە هەوڵێکە بۆ دانانی ئەنتۆلۆجیای شتە بەجێماوەکان بە مەبەستی هێشتنەوەیان لە ئێستادا، هەموو گەڕانەوەیەك بۆ رابردو گەڕانەوە نیە بۆ خودی رابردو، بەلکو گەڕانەوەیە بۆ تارماییەکان، پشکنینی پێناسی تەرمەکانە. هەموو لێکۆڵینەوە ئەنتۆلۆجی، سیمانتیکی، فەلسەفی، هێرمنۆتیکی، سایکۆلۆجی، شیکاریەکان.. دەچنە خزمەتی ئەو جۆرە ماتەمانە.

2-زمان: تەنها مەرجێك بۆ بەرجەستەکردنی تارماییەکان زمانە. هەر ئەو تارماییانەش بوون کە هیگڵ و دواتر مارکسیان ئەفراند.

3-ڕۆح: لە دوا قۆناغدا خودی بەرهەمی تارماییەکان، واتە مارکس، تارماییەکی تر، واتە ڤالیری، بەرهەم دێنێ. چونکە ڕۆح تەنها ئاستێکی ئایدیالی بوون نیە، بەلکو هەروەکو ڤالیری دەڵێ: "ڕۆح توانای وەرچەرخانە (..) ڕۆح کردارە.."[17].

**مارکسیزم بەرەو کوێ؟**

ئەمە ناونیشانی ئەو کۆنگرەیە یە کە دیرێدا بە لێکچەری (تارماییەکانی مارکس) بەشداری تێدا کردووە. ڕەنگە لێکچوون و نزیکییەك لە نێوان ناونیشانی کۆنگرەکەو ناونیشانی لێکچەرەکەی دیرێدادا هەبێت، چونکە فرێزی (بەرەو کوێ؟) وێنەی تارماییەکی راگوزەر لە زەیندا دروست دەکا کە دێت و لە ناکاو ون دەبێ. پرسیاری (بەرەو کوێ؟) ئەنگێزەیەکی لە پشتە، ئەنگێزەی گەڕان بە دوای جەستەیەکدا کە چۆتە دۆخی تارماییبوونەوە.

ئەو دۆخە دەخوازێ مارکس لە یەك وێنەدا گیرنەخوا، چونکە هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر مارکس بە شێوەیەکی بەردەوام نەخوێندرێتەوەو وتووێژی بەردەوام سەبارەت بە تێزەکانی ئەنجام نەدرێ. ئێستا دوای ئەوەی ماشێنە دۆگما بەرهەمهێنەکان و کەرەستە ئایدیۆلۆجیە مارکسیستەکان (دەوڵەتەکان، حیزبەکان، شانەکان، سەندیکاکان..) بەرەو کالبوونەوەو لە ناوچوون دەچن، هیچ بەهانەیەکمان بە دەستەوە نەماوە بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیارییەك، کە بەرپرسیارێتی ئایندەیە، چونکە هیچ ئایندەیەك بەبێ مارکس و میراتەکەی وێنا ناکرێ.. ئەمەش هەروەکو دیرێدا دەڵێ. "گریمانەیەکە، یان راستتر لایەنگیرییەکە"[18] کە لە تەنها وێنەیەکدا دەرناکەوێ بەلکو زیاتر لە ڕوویەکی هەیە.

دیرێدا ئیعتراف بەوە دەکا کە یادەوەری ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە هێشتنەوەی وێنەکانی مارکس لە زەیندا، بە تایبەتی یادەوەری دیرێداو هاوتەمەنانی کە سەردەمانێکی دوورو درێژ سەرقاڵی حیکایەتی مارکسیزم و ئەزموونکردنی ئەو حیکایەتە بوون لە دنیای فیکرو ئایدیۆلۆجیادا.. مارکس لای ئەو نەوەیە لە وێنەی پاتریارکێکدا بوو، کوڕەکان لەسەر



میراتەکەی دەژیـان و بـە شـەڕ دەهـاتن.. ڕەنگـە سـەرلەنوێ خوێندنـەوەی مـارکس و سـەرلەنوێ ڕاڤەکردنی دەقەکانی درێژبوونەوەی ئـەو یادەوەرییـە بێت. مرۆڤ بۆ ئەوەی مارکس بخوێنێتەوە مەرج نیە مارکسی بێت، چونکە هەمیشـە کوڕە ڕەسـەنەکان نابنە میراتگری شتە بەجێماوەکان. مارکسیزم موڵکی یـەکێتی سـۆڤێت و دەوڵەتـەکانی کـامپی خۆرئـاواو حیزبـە ئەنتەرناسیۆنالیستە کۆمۆنیستەکان نـەبوو، دواتر داڕمانی ئەوان لە پەنجاکانـەوە چاوەڕواندەکرا، بۆیـە ئـەو پرسـیارەی کـە ئامـادەبوانی کۆنگـرەی (مارکسیزم بەرەو کوێ؟!) کۆدەکاتەوە پرسـیار نیـە سەبارەت بە چارەنوسی وڵاتە کۆمۆنیستەکان بـەڵکو پرسیارە سەبارەت بە چارەنوسی مارکس و وێنەکانی لە ئایندەدا.

پێـش داڕمـانی کـامپی خۆرئـاوا زۆرجـار ئـەو پرسیارە –پرسیاری گەڕانـەوەی تارمـایی مـارکس– لای لاوەکانی هاونەوەی دیریدا دەورووژێنرا، پرسیارێك بـوو زرنگانـەوەی هـەبوو، بـەڵام زرنگانەوەکـەی وەك ئەوەی ئێستا نەبوو. چونکە پرسـیاری هەنوکـەیی لـە سـەردەمێکدایە کـە فۆکۆیامـاو خوێنـەرە لاوەکـانی سـەرقاڵی قسـەکردنن سـەبارەت بـە حیکایـەتی کۆتاییـەکان. بـەڵام هـەروەك دیریـدا دەڵـێ ئـەو بابەتانەی سەبارەت بە کۆتاییەکان قسەیان لێدەکـرێ وەك "کۆتایی مێژو"، "کۆتایی مارکسیزم"، "کۆتایی فەلسـەفە"، "کۆتاییـەکانی مرۆڤایـەتی" و "دوا مـرۆڤ".. بابـەت گـەلێکی تـازە نـین، بـەڵکو لـە پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە هەمیشە لەسـەر زاری هاونەوەکانی ئەودا بوون "دنیا ئـاخری شتەکان وەك نان لە دەمی هەمووماندا بوو، (ئەو دیاردەیە) هێنـدە ئاسایی بو لامـان تـا ئـەو ئەندازەیـەی.. سـاڵی ***1980*** ناوم لێنا: ستریسی دنیا ئاخری لە فەلسەفەدا.."[19].

گرێدانی داڕمانی مارکسیزم بـە گوتـاری "کۆتـایی مێـژو"ەوە، هەوڵێکـە بـۆ شـاردنەوەی پەشـێویە گەورەکانی ئـەم سەردەمە، کـە بـە بـڕوای دیریـدا سەردەمی دەرچوونە لە ئاراستەی ئاسایی مێـژو، کە تیایدا کەپیتالیزمی گەردوونی ڕووبەڕووی دە قـەیرانی ترسناك دەبێتـەوە (بێکـاری، ئـاوارەبوون، کێـبڕکێی ئابوری، کێشـەکانی بـازاڕی ئـازاد، قـەرزی دەرەکـی، چاکسـازی، چـەکی ئـەتۆمی، جەنگـە ئەتنیـەکان، تارمـایی مافیـاو مـادە بێهۆشـکەرەکان، باڵادەسـتی خۆرئاوا لـە جێبـەجێکردنی یاسـای نێودەوڵەتیدا..). دیریدا لەسەر ئەم کێشـانە زۆر ناوەسـتێ، تەنها وەك نمونـەی پەشێوی ئـەم سـەردەمە نیشانی دەدا کـە ناکرێ وەك سـەردەمێکی ئـارام وێنـای بکـەین[20]. هەروەها بـڕوای وایە هـەوڵدان بـۆ دەستنیشـانکردنی سەردەم وەك سەردەمێکی ئارام هەڵەیـەکی گەورەیـە چونکـە "دەبێتـە هـۆی بەرجەسـتەکردنێکی ئەنتۆلۆجی، یان سەپاندنی جەستە بەسەر ڕۆحدا یان بەسەر پەیمانێکدا کە لـە شێوەی تارماییدایەو، هـەر هەوڵێك بۆ بەرجەسـتەکردنی مادیانـەی دەبێتـە هـۆی پەشێوی و تێکچوونی.."[21].

دیریدا لە خوێندنـەوەی مارکسدا تیشك دەخاتـە سەر زۆربەی ئەو دەقانەی مارکس کە پەیوەندیان بـە بابەتەکەی ئەوەوە هەیە. لە ئایدیۆلۆجیـای ئـەڵمانیدا دیریدا بایەخێکی تایبەت دەدا بە وەڵامەکانی مـارکس بۆ شتێرنەر، ئەو بەشەی کە تـا ئێسـتا زۆر کـەس بە بەشـێکی کەمبایـەخی دەزانـن و تەنانـەت زۆرجـار سەیریان لێهاتووە مارکس ئەو هەموو کاتەی خۆی بە وەڵامدانـەوەی شتێرنەرەوە سـەرف کردووە. بـەڵام دیریدا بـە پێچەوانـەوە ڕای وایـە ئـەو بەشـە گرنگـی خۆی هەیە، چونکە پەیوەندی بە کێشەی فەردانیەت، یـان (خودگـەری *Egoism*) ەوە هەیـە لـە دیـدی مارکسدا.. ئەو دەمە مارکس لە ململانێیەکی سەختی ناو خودی خۆیدا بوو.. لـە کـاتێکدا ڕۆڵـی تاکەکەسـی بەکـەم دەگـرت، لـە نـاخی خۆیـدا هەسـتی بـە تارماییـەکانی خـودی خـۆی دەکـرد کـە وەك تـاك



بەرجەستە دەبوو.. واتە هەستی بە تارماییەکی دووفاقەیی دەکرد، یەکێکیان لایەنگری خودو ئەوی تریان لایەنگری فەلسەفەکەی بوو کە دوور بوو لە خود. بە مانایەکی تر شتێرنەر مارکسی توشی نیگەرانیەکی زۆر کردبوو، چونکە ناچاری کردبوو کە لە یەک کاتدا بەرگری لە دوو شتی پێچەوانە بکا یەکێکیان فەردانیەتی خود بەرامبەر تۆتالیتاریەتی سیستم، دووەمیان گرنگیدان بە کۆمەڵ بەرامبەر هەڵپەی تاکەکەس.

رەنگە هۆکاری گرنگیدانی دیریدا بە ململانێی مارکس –شتێرنەر بگەڕێتەوە بۆ هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شێوەیەک لە وەسوەسەی شیتالگەری لە خودی مارکسدا، چونکە مارکس لە وەڵامدانەوەی شتێرنەردا وەک ئایدیۆلۆجیستێک قسە ناکا بەڵکو وەک کەسێکی شیتالگەر (تفکیکی) لە یەک کاتدا بەرگری لە تاک دەکا کاتێ کە ڕووبەڕووی مەترسی توانەوە دەبێ لە بۆتەی کۆمەڵدا، هەروەها بەرگری لە تێزە پێچەوانەکانیش دەکا[22].

هەر سەبارەت بە حیکایەتەکانی کۆتایی مێژو، دیریدا کتێبێکی بلانشۆ بەیاد دێنێتەوە کە پێش زیاتر لە **30** ساڵ، بە دیاریکراوی لە ساڵی **1959**دا، لەژێر ناونیشانی "کۆتایی فەلسەفە"دا نوسیویەتی. لەو کتێبەدا فەلسەفە لە وێنەی تەرمێکدا بەڕێ دەکرێ، بەڵام لە چرکەی بەڕێکردنیەوە وەسوەسەی زیندوبوونەوەی دەست پێدەکا. بلانشو لەو کتێبەدا بڕوای وایە کە مەرگی فەلسەفە لە سەدەی بیستەمەوە دەست پێناکا، بەڵکو لەو کاتەوە دەستی پێکردووە کە مارکس کودەتایەکی دژی ڕەوتی ئاسایی مێژو بەرپا کردو، تێزەکەی خۆی وەک دەسکەوتێکی مەعریفی ڕەها ڕاگەیاند، بەڵام هاوکات لەگەڵ بەرجەستەبوونی کردەیی ئەم فەلسەفەیەدا ڕەهەندە تیۆرییەکانی ڕەتکرایەوە.. لەگەڵ هەموومەرگێکی جەستەییەدا مەیلێک هەیە بۆ دەرکەوتنەوەی ڕۆح لە وێنەیەکی شەفافدا. دیریدا دەپرسێ داخۆ ئەو دەرکەوتنە تازەیە دەرکەوتنی تارماییە؟ لە وەڵامدا دەڵێ نازانین. بەڵام ئەو نەزانینە هیچ کەلێنێک دروست ناکا، بەڵکو بە پێچەوانەوە کرانەوەیەک بەسەر داهاتوودا دروست دەکا.. چونکە ئاینده ناتوانێ خۆی ڕابگەیەنێ، یان تەعبیر لە بێگەردی خۆی بکا ئەگەر پێشتر ڕابردوو کۆتایی خۆی ڕانەگەیاندبێ.

زیاتر لە سەدەو نیوێکە مارکس و ئنگلز مانیفێستیان نوسیوە، ترسناکترین وێنەی مانیفێستەکە تارمایی کۆمۆنیزمە کە ساڵانێکی دوورو درێژ ئەورووپای کەپیتاڵیستی دەترساند، لە ڕاستیدا ئەو تارماییە شتێک نەبوو جگە لە ترسێک لە ئاینده نەک ترسێکی هەنوکەیی.. بەڵام هەموو تارماییەک خۆی لە خۆیدا ئاییندەیە، ترسە لە ئەگەری بەرجەستەبوونی تارمایی لەو چرکەو ڕۆژو مانگ و ساڵانەی کە دێن و بە ڕێگاوەن.. پرسیاری (مارکسیزم بەرەو کوێ؟!) پرسیارە لە وێنەکانی مارکسیزم لە ئاییندەدا، واتە پرسیارە لە چارەنوسی ئەو تارماییەی کە ڕەنگە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرجەستە ببێتەوە.

ئێستا دوای مردنی جەستەیی کۆمۆنیزم لە یەکێتی سۆڤێت و جیهان بە گشتی، مارکسیزم گەڕاوەتەوە دۆخی تارمایی.. بەڵام شەڕکردن لەگەڵ جەستەدا ساناترە لە شەڕکردن لەگەڵ تارماییدا. دیریدا ئەو دوو دۆخە بە دوو دۆخی تارمایی دەچوێنێ: تارمایی هەنوکەیی و تارمایی ئاییندەیی.. یەکەمیان هەڕەشەیەکە لە ئێستادا، کە دەکرێ شەڕی لەگەڵدا بکرێ: بەڵام دووەمیان هەڕەشەیەکە لە ئاییندەدا، کە شەڕی لەگەڵدا ناکرێ بەڵکو چاوەڕوانی ئەگەری هاتنی دەکرێ. دۆخی دووەمیان ئامادەیی و چالاکی هەنوکەیی نیە، چونکە ئەو سەر بە زەمەنێکی دواخراوە.



هەموو زەمەنێکی دواخراو مـوژدەی فریادرەسـی پێیـە، چونکـە تارماییـەکانی ئـاینده لای هـەندێك ترسناکن و لای هـەندێك مـوژدە بەخشـن.. مەحاڵـە بتوانین وێنای جۆرێك لـە ئاکـار یـان جۆرێـك لـە سیستمی سیاسی شیاو بۆ مرۆڤ بکـەین، ئەگـەر ئاینده هەڵگری بەشێك لەو موژدانە نەبێ کە وزەی مانەوەو بەردەوامی دەبەخشن بە ئێمە لـە ئێستادا.. لـێرەوە دیریـدا بـۆ یەکـەمین جـار فەلسـەفەی شـیتاڵکەری، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان گـرێ دەداتەوە بە ئاکارناسی و سیاسەتەوە. چونکە تاقە شـتێك کـە شـیتاڵکەری پێـی نـاوێرێ و ناتوانـێ لەبەریەکیهەڵوەشێنێتەوە بنەمای ئەو بەمایانەیـە کە ئایندەمـان بـۆ رۆشـن دەکەنـەوەو مـوژدەی سـبەینێیەکی باشـترمان پێدەبەخشـن. هـەموو سیاسەتێك لە پێناو ئازادبووندا پێویستی بە وێنـەی فریادرەسـێك هەیـە کـە روبـەرەکانی دادپـەروەری فراوانـتر بکـا، تەنانـەت دیریدا لـە شـوێنێکدا دەڵـێ: "تەنها شتێك کە ناتوانین شیتاڵی بکەین و لەبەریەکی هەڵوەشێنین و خۆی نادا بـە دەستەوە، وەك خـودی شـیتاڵکەری قـابلی شـیتاڵکاری نیـە، بریتیـە لـەو ئەزموونـە دیـاریکراوەی کـە مـوژدەی ئـازادبوونی پێیە.."[24].

دیریدا دەڵێ ئەوەی مارکس و دوژمنانی کۆمۆنیزم پێکەوە کۆدەکاتەوە، ترسی بەردەوامـە لـە تارمـایی، تـرس لـەوەی کۆمۆنـیزم گۆشت و ئێسـك بپۆشـێ و ئامادەییەکی بەرجەسـتە پـەیدا بکـا، هـەروەها تـرس لـەوەی ئـەو پرۆسـەیە روونەداو کۆمۆنـیزم هـەروەك تارمـایی بمێنێتـەوە. بـەڵام دیریـدا پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێ کە دەبێ ترسی راستەقینەمان بەرامبەر ئەو کەسانە بێت کە خوازیـاری دەرکردنـی تارماییـەکانن، یـان دەیانـەوێ گۆشـت و ئێسـك بـبڕن بـە بـەری تارماییـەکانداو.. ئـەو فریادرەسـەی کـە ئێمـە چاوەڕوانی دەکەین بکەن بە قەوارەیەکی بەرجەستەو هەستپێکراو. کەواتە دەبێ هەمیشە تارماییمان خۆش بوێ و لـە ئـامێزی بگریـن، واتـە دەبـێ هەمیشـە بیرکردنـەوەو کردەوەکانی ئێمـە لـە فـەزای ئایدیـا باڵاکاندا بێت. بە مانایەکی تـر لۆجیکـی تارمـایی داوامان لێدەکا بڕوا بەو بیرۆکەیـە بێنـین کـە پێیوایـە خۆشنودی لە سیاسەتدا تەنها ئەگەره[26].

## ئەفسانەی کۆتـایی مێژو:

ئـەمڕۆ لـە جیـهاندا شـێوازێك لـە شـێوازەکانی باڵادەستی پـەیڕەو دەکرێ کە وێنـەی لـە رابـردوودا نیـە، باڵادەستی لـە پێنـاو دامـەزراندنی سیسـتمێکی سەرانسەری ئەوتۆدا کە هەموو خەونـەکانی دەرەوەی بازنەی خۆی وەك خەونی بزڕکاو وێنادەکا. مارکسیزم یەکێکە لەو گریمانانەی کە هەمیشە دەشێ لە رێگـای خـوازە (اسـتعارة) یەکـەوە بێتـەوە ئـارا.. خـودی مارکسیش هەمیشە حەزی بە وشەی خوازە دەکرد لە دەقەکانیدا، بەڵام لەوە دەچێ چیتر نەوێرین تەنانەت وەك خـوازەش بـاس لـە مارکسیزم بکـەین. ".. لـەو بڕوایەدام کەس ناتوانـێ نکوڵـی لـەوە بکـا کـە جـۆرە دۆگماتیزمێك دەیەوێ لە رێگای چـەند مـەرجێکی دژو گومانلێکراوەوە باڵادەستیەکی گـەردونی پـەیدا بکـا. لە جیهانی ئەمڕۆدا گوتارێکی هـەژموندار هەیـە، یـان لە دۆخی پەیداکردنی هەژموندایە.."[26]. یەکێك لـەو سـەرکەوتنانەی کـە ئـەو دۆگماتیزمـە نوێیـە شـانازی پێوە دەکاو، ئاهەنگی بۆ دەگێڕێ، داڕمـانی وێنـەی ئـەو شۆڕشانەیە کـە لـە مارکسیزمەوە سـەرچاوەی دەگرت و، داڕمـانی خـێرای ئـەو سیستمانەی کـە بـە نیـاز بـوون مارکسـیزم تەرجەمـە بکـەن. بـەڵام ئـەم شانازیکردن و ئاهەنگگێڕانە شـێوەیەك لـە هیستریای پێوە دیارە، کە فرۆید دەیگەڕێنێتـەوە بـۆ دۆخـی تێکەڵاوبوونی شایی سەرکەوتن و شینی ماتەم.. ئـەم دۆخە وردە وردە دەبێتە سروتێکی تایبەت کە تیـایدا هاوارێك دووبارە دەبێتەوە: "مارکس مرد.. کۆمۆنیزم



مرد.. لە راستیدا مرد، هەموو خواستەکانی، گوتارەکانی، تیۆرەکانی، کردەوەکانی.. مردن. بژی کەپیتالیزم، بژی بازاڕ، بژی لیبرالیزمی ئابوری و سیاسی"[27].

کاتێ ئێمە دەڵێین ئەو ئایدیۆلۆجیایەی بانگەشە بۆ کۆتایی مارکسیزم دەکا بەرجەستەبوونی گوتارێکی باڵادەستە، ئەوا بێ ئەوەی بزانین بە هەمان میکانیزم کاردەکەین کە مارکسیزم بەرهەمی هێناوە. بۆیە دیریدا سەرنجمان بۆ گرفتەکانی ئەو میکانیزمە رادەکێشێ کە هەمیشە لە مارکسیستەکانەوە بە میرات بۆ نەوەکان بەجێ دەمێنێ. لە هەمان کاتدا سەرنجمان بۆ مەترسیەکانی ئەو ئایدیۆلۆجیا باڵادەستە رادەکێشێ کە لەسەر بنەمای ململانێ دروست بووە. واتە دەبێ گومان لە هەردوو لایەنی هاوکێشەکە بکەین: لایەنی باڵادەست و، ئەو لایەنەی کە باڵادەستی بەسەردا پراکتیزە دەکرێ "نیچەو بنجامین، هەریەکەیان بە شێوازی خۆیان هانیان داین گومان بکەین. بەتایبەتی بنجامین کە بەشداری لە ماتریالیزمی مێژوویی و میراتێکی مەسیحی لاوازدا دەکا"[28]. واتە بۆ ئەوەی تەسلیمی ئەفسانەکانی کۆتایی مێژو نەبین، کە هەموو جارێك لە نێوان چەند سەدەیەکدا بەرگوێمان دەکەوێ، دەبێ چاوەڕوانی ئەو فریادڕەسانە بین کە بۆ تێکشکاندنی کۆتاییەکان و بنیاتنانەوەی سەرەتاکان دێن. ئەو فریادرەسانەی هەندێکیان لای نیچەو، هەندێکیان لای مارکس و، هەندێکی تریان لای مەسیحەوە دێن. رەنگە ئەو چاوەڕوانکراوە هەرگیز پەیدا نەبێ، بەڵام مرۆڤ بە بێ چاوەڕوانی و بەبێ خەونی تێکشکانی ئەفسانەی سیستمە کامڵەکان، کە لە پاشیانەوە مێژو دەوەستێ، ناتوانێ بژی.

بەڵام بە شێوەیەکی کاتیش بێت نابێ ئەوە لە یاد بکەین کە خەریکە گوتاری باڵادەست بەسەر دیمەنی تازەی جوگرافیای سیاسیدا سەردەکەوێ. لە راگەیاندنە سیاسی و شاشە بینراو و بریقەدارەکانی فەزای ئەقڵانی و ئەکادیمیدا، بە هێمنی و متمانەیەکی زۆرەوە، نەك هەر باس لە کۆتایی مارکسیزم دەکرێ، بەڵکو باس لە کۆتایی هەموو مەرجەعیەتە پەیوەندیدارەکان بە مارکسیزمەوە دەکرێ.. واتە باس لە کۆتایی مێژو دەکرێ لە بەرگێکی دۆگمایی و ئاڵۆزدا. لێرەدا دیریدا ئاماژە دەدا بە کتێبەکەی فرانسیس فۆکۆیاما "کۆتایی مێژو.. دوا مرۆڤ" کە وەك ئینجیلێکی تازە خۆی دەخاتەڕوو کە چەندین هەڵای ئیعلامی بۆ کراوە، بەتایبەتی سەبارەت بەو بەشەی کە پەیوەندیی بە مەرگی مارکسیزمەوە هەیە وەك نیشانەیەکی کۆتایی مێژو. بەڵام دیریدا ئاماژەی بەوەش دەدا کە ئەو کتێبەی فۆکۆیاما بە شێوەیەکی خراپ و ساویلکانە نەنوسراوە، بەڵکو جوانترین رووی ئایدیۆلۆجیای کەپیتالیزمی براوەیە لە دیموکراسی لیبرالیدا، کە بەم دواییە گەیشتۆتە ئاستی کەماڵێکی ئایدیالی، یان بە دەربڕینێکی تر گەیشتۆتە کەماڵێکی واقعی[29].. چونکە فۆکۆیاما بڕوای وایە "دیموکراسی لیبراڵی تاقە خواستێکی سیاسییە کە ژمارەیەك ناوچەو کولتور لە سەرانسەری جیهاندا کۆدەکاتەوە" و "هاوپەیمانی دیموکراسی لیبراڵی لەگەڵ بازاڕی ئازاددا (..) هەواڵێکی مژدەبەخشی دواچارەکی سەدەی بیستەمە.."[30].

ئەو هەواڵە مژدەبەخشەی فۆکۆیاما وێنەی مژدەکانی ئینجیل دێنێتەوە یادی دیریدا.. بەڵام پرسیاری (مارکسیزم بەرەو کوێ؟) زرنگانەوەی ئەو هەواڵە کپ دەکاتەوە.. هەرچی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشە سێ عەقیدە چاوەڕێی گەڕانەوەی مەسیح دەکەن.. هەموو سوپاکانیشیان بۆ جەنگێکی گەورەی ئایندە سازداوە، لەگەڵ مێزەکانی تەلەفزیۆن و تەکنەلۆجیاو ئامرازە زانستیەکان.. واتە بە بەشداری تارماییە زانستیە زۆر مۆدێرنەکان. بۆیە



ئەو جەنگ و کارە توندوتیژانەی بە ڕێگاوەن ناکرێ هیچ گرەوێکی پێش وەختیان لەسەر بکرێ.. بە تایبەتی ئێستا دوای بڕانەوەی ململانێی نێوان کامپی خۆرئاواو کامپی خۆرهەلات شەڕ لەسەر بەرجەستەبوونی سێ وێنەی مەسیح لە سێ خەیاڵدانی ئاینی جیاوازەوە (ئیسلام، مەسیحی، جولەکە) دەکرێ.. کە لە راستیدا ململانێی سێ هێزە لە پێناو (قودس)دا، بۆیە "ئەمڕۆ شەڕ لە پێناو قودسدا شەڕێکی جیهانییە"[31]. بەلام بە بڕوای دیرێدا تاقە شتێك کە ڕێگا لە بەرجەستەبوونی تارمایی ئەو جەنگە دەگرێ هاتنەوە مەیدانی تارماییەکی کۆسمۆپۆلیتیستە، بەلام دەبێ دەرکەوتنەکانی ئەمجارەی جیاواز بێت، زیاتر توانای خۆگونجاندنی لەگەڵ مەرجە تازەکاندا هەبێ، دەبێ ململانێ لەگەڵ مۆدیلێکی جیهانی کەپیتالیزمدا بکا کە لەسەرو کەپیتالیزمی دەولەتەوەیە. بۆیە دیرێدا دەڵێ ئیدی لەمەودوا لەگەڵ ئەوەی کە دەپرسین (مارکسیزم بەرەو کوێ؟) دەشپرسین "مارکسیزم بەرەو کوێ دەبەین کاتێ تەئویلی دەکەین؟ چونکە مارکسیزم نابزوێ ئەگەر گۆڕانکاری تێدا نەکرێ!"[32]. ئەم قسەیەی دیرێدا ئاماژەیە بۆ قسەیەکی خودی مارکس: "تا ئێستا فەیلەسوفەکان هیچیان نەکردووە جگە لە تەئویلی جیهان بە شێوازی جۆراوجۆر.. بەلام ئەوەی ئێستا گرنگە گۆڕینی جیهانە"[33].

فۆکۆیاما ئەو هەواڵە موژدەبەخشە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەبەستێتەوە بە زانستەوە بە تایبەتی بە فیزیای هاوچەرخەوە وەك تەکنەلۆجیای ولاتە دیموکراسیە لیبرالیەکان، بەلام دیرێدا دەڵێ "ئەو دیارییە فیزیکی و تەکنیکی و سەربازییە نامانگەیەنێتە دەروازەکانی خاکێکی وادەئامێز – الارض الموعودة"[34]، چونکە ئەگەر زانستەکانی فیزیای مۆدێرن بمانگەیەنێتە دەروازەکانی دیموکراسی لیبراڵی، ئەوا لە هەمان کاتدا ڕێگەمان نادا دەروازەکان تێپەڕێنین و بچینە ژوورەوە، چونکە تاقە فاکتەرێکی ئابوری لە ئارادا نیە کە پێشکەوتنی پیشەسازی ئاراستە بکا بەرەو بەرهەمهێنانی ئازادیی سیاسی.

کاتێ دیرێدا گوتاری کۆتایی مێژو شیتاڵدەکا، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە لە نێوان سێگۆشەی ئەو سێ ئاینە کیتابیەدا فۆکۆیاما نموونەیەك هەڵدەبژێرێ کە نەك هەر نمونەیەکی هیگڵییە لە پێناو ڕێنیسانسدا، بەڵکو هەمان نمونەیە لە پێناو دیدێکی مەسیحیدا بۆ جیهان "دەولەتێك کە لە هاتنی یەزداندا بۆ جیهان بەرجەستە دەبێ" هەروەکو لە فەلسەفەی حەقدا هاتووەو فۆکۆیاماش پشتی پێبەستووە. لێرەوە کۆتایی مێژو لە گەوهەردا عەقیدەیەکی مەسیحییەو لەگەڵ گوتاری پاپا دەربارەی ئوممەتی ئەورووپی یەك دێتەوە کە بڕیارە دەولەتێکی مەسیحی مەزن پێکبێنێ –لە ئاماژەیەکدا بۆ ئەورووپای یەکگرتو–، واتە تەنها بەرژەوەندیی ئابوری لە پشتی ئەو هاوپەیمانێتیە ئەورووپییەوە نیە بەڵکو مەرجەعیەتێکی ئاینی پیرۆزیشی هەیە، کە پاپا وەك نوێنەری فاتیکان و، فۆکۆیاماش وەك بیریارێکی لیبرالیزمی دیموکراسی/ مەسیحی شەرعیەتی ئاینی و ئایدیۆلۆجی پێدەبەخشن. بەلام ئەم هاوپەیمانییە تەنها دژی دوژمنە دەرەکیەکانی لیبرالیزمی دیموکراسی/ مەسیحی نیە.. بەڵکو دژی ئەو تارماییانەشە کە خودی ئەورووپا بەرهەمی هێناوە، بۆیە لە مانیفێستدا ئاماژەیەك بۆ جۆرە هاوپەیمانیەك کراوە کە دژی بەرجەستەبوونی تارماییەکان لە ئارادان و ناوی پاپاش وەك خۆی هاتووە. جگە لەوە فۆکۆیاما جیاوازی لە نێوان مۆدێلی ئەنگلۆ-ساکسۆنی بۆ دەولەتی لیبرالی (هۆبز، لۆك) و لیبرالیزمی هیگڵیدا دەکا، مۆدێلی دەولەتی جیهانی زیاتر پشت ئەستورە بە لۆك و مۆدێلی



ئەنگلۆساکسۆنی کە هیگڵ قبوڵی نەبوو. بەڵام دواجار بۆچونی ئەو سەبارەت بە هارمۆنی پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکاو کۆمەڵەی ئەورووپی لە پێناو دەوڵەتێکی جیهانیدا، واتە دەوڵەتی ڕێنیسانسێکی گەردوونی، ئەنجامێکی گەوهەری و لۆجیکی دەدا بە دەستەوە کە بریتیە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی مەسیحی، واتە دامەزراندنی هاوپەیمانیەکی پیرۆز، کە تەنها ئەنگێزەیەکی ئابوری لە پشتەوە نیە وەك ئەوەی زۆرجار ئاماژەی بۆ دەکرێ بەڵکو ئەنگێزەیەکی میتافیزیکیشی لە پشتەوەیە. بۆیە دواجار دیریدا ئەو (دوا مرۆڤ)ەی کە فۆکۆیاما باسی دەکاو کردویەتیە ناونیشانی کتێبەکەی *The Last Man* بە (مرۆڤێکی مەسیحی) ناودەبا، بەڵام دیسانەوە وەسوەسەیەك ئەو مرۆڤە دەترسێنێ –کە مرۆڤی سەر بە ئاینەکانی تر نیە– بەڵکو تارمایی مرۆڤێکی ئەورووپییە لە جۆرێکی تر کە هاوپەیمانیەکی بان ئاینی دەخوازێ، ئامێلێ مێژو لە فۆرمە لیبراڵیە مەسیحیەکەیدا کۆتایی بێت، لەوە دڵنیایە ئەو فۆرمە دوا قۆناغی مێژو نیە، بەڵکو قۆناغی پێش دوا قۆناغە کە سەرمایەدارییە و هەڵگری ڕەگەزەکانی لە ناوچوونی خۆیەتی. بۆیە دیریدا بڕوای وایە کە کتێبەکەی فۆکۆیاما لە تێزەکانی دوو مامۆستای گەورەی کۆتایی مێژووەوە سەرچاوەی گرتووە کە یەکێکیان هیگڵ و ئەوی تریان مارکسە، بەڵام دوای بەراورد لە نێوان ئەم دوو مامۆستایەدا مامۆستای یەکەمیان واتە هیگڵ هەڵدەبژێرێ کە بیریاری دەوڵەتی لیبراڵی موتوربەکراو بە ترادیسیونی مەسیحییە[35].

فۆکۆیاما تەنها نیگاری دوا مرۆڤ و دوا مێژو ناکێشێ، بەڵکو وەسوەسەی ئەو تارماییانەش دێنێتەوە ئارا کە هەڕەشە لەو دوا مۆدێلەی مرۆڤ و ئەو دوا مۆدێلەی دەوڵەتی جیهانی دەکەن، چونکە دەوڵەتی لیبراڵی/ جیهانی تا ئەو شوێنە لە گەشەدایە کە خەبات بۆ گەیشتن بە لوتکەیە دوا قۆناغ دەگا.. بەڵام لەگەڵ گەیشتنیدا بە دوا قۆناغ، سەرەتای سەرەتایەکی تر دەستپێدەکاتەوە.. واتە لەگەڵ دەسپێکی هەموو قۆناغێکدا وەسوەسەی سەرەتای قۆناغێکی تر دەستپێدەکا. لێرەوە بایەخی فۆکۆیاما لەوەدا دەردەکەوێ کە باسی ئەو مۆدێلەی دەوڵەتی جیهانی ناکا کە لە قۆناغی بزاوت و جوڵەدایە بەڵکو باسی ئەو قۆناغەی فۆرمی دەوڵەت دەکا کە لە دۆخی وەستاندایە (کۆتایی مێژو).

**میوانداریيەکی کراوە:**

هەموو دۆخێکی وەستاو هەڵگری ئەو ڕەگەزانەیە کە جوڵە دروست دەکەن و بەدوای بەهای باڵاتر لە بەها وەستاو و جێگیرەکاندا دەگەڕێن. ڕەنگە ئەو بەها بڕۆکانە ئیدیاڵی بن و قابلی جێبەجێ بوون نەبن، بەڵام ئیدیاڵی بوونیان بەندە بە بڕۆکییانەوە، ئەوکاتەی بەهاکان دەبن بە بەهای واقعی واتە دەبن بە بەهای وەستاو و جێگیر. پێویستە چاوەڕێی هیچ واقعێکی ئاڵتەرناتیف نەکەین کە مژدەی جێبەجێبوونی بەهاکانمان پێببەخشێ، چونکە -بۆ نموونە- دادپەروەری شتێك نیە بەرقەراربێ بەڵکو شتێکە چاوەڕێ دەکرێ. دیریدا بە دوای فۆرمێکی دواخراوی دادپەروەریدا دەگەڕێ کە ناوی دەنێ (دادپەروەری بەخشین) و، ئاکارەکانی پشتئەستورن بە پرەنسیپی قبوڵکردنی نەناسیاو بۆ میوانداریيەکی ڕەهای بێ قەیدو مەرج، میوانداریەك دژی هەموو بەرجەستەبوونێکی شوناسی ئاینی و نەتەوەیی و جوگرافیە، واتە ناپرسێ میوان هەڵگری چ شوناسێکەو، خاوەنی هیچ ئایدیۆلۆجیایەکی پێشوەخت نیە بۆ حوکمدان بەسەر ئەو میوانە ناوەختەدا کە ڕەنگە لە هەر ساتەو وەختێکدا بێت ڕوومان تێبکا[36].

قبوڵکردنی نەناسیاو، پێشوازیکردن لەو میوانانەی کە لە دەرگاکانمان دەدەن، تێکشکاندنی



کۆتە مەرجدارەکان و، چاوەڕوانی ئەو ئایندەیەی کە شوناسێکی باڵاتر لە شوناسە فەرعیەکان دەبەخشن بە مرۆڤ.. دەچنە خانەی پرۆسەی لەبەریەکهەڵوەشاندنی گوتاری خۆرئاوایی هەنوکەیی، کە لە رواڵەتدا خۆی وەك گوتارێکی هیومانی گەردونی نیشان دەدا، بەڵام لە گەوهەردا گوتارێکی باڵاخوازی ئاینی – خۆرئاواییە نەك یەکسانخوازی. بۆ نمونە کاتێك رێکخراوە خۆرئاواییەکانی مافی مرۆڤ باس لە دۆخی نالەباری مرۆڤ دەکەن لە کیشوەرەکانی تری جیهاندا، ئەوە کار بۆ بەراوردکاری نێوان دوو سیستم دەکەن کە یەکێکیان خۆرئاوایی و ئەوی تریان غەیرە خۆرئاواییە؛ لە یەکێکیاندا مافی مرۆڤ پارێزراوەو لەوی تریاندا پێشێل کراوە. بەڵام لە راستیدا کاتێك ئێمە بە یەکێك دەڵێین تۆ چەوساوەیت و تۆ هەمیشە ئازار دەچێژیت، ئەوە پێش ئەوەی رزگاری بکەین و دەربازی بکەین لەو دۆخە زیاتر برینداری دەکەین و چەوسانەوە دەکەینە قەدەری شوناسەکەی[37]، "رەنگە باشتر وابێت دەست لەو کاروبارە وەرنەدەین.. جا ئەی رێکخراوی لێبوردنی جیهانی وریابە!"[38].

رەنگە بوترێ ئەوەی کە دیریدا داوای دەکا کارێکی مەحاڵەو، تەنانەت خۆیشی دان بەوەدا دەنێ کە مەحاڵە. ئەمە بە مانایەك لە ماناکان راستە، چونکە خودی دیریدا دەربارەی کرانەوە لە پێشوازی فریادرەسدا دەڵێ: "کارێکی ئاسانە، بەڵکو زۆر ئاسانە، ئەوە روونبکەینەوە کە ئەو میواندارێتیە کراوەو بێسنورە کارێکی مەحاڵە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەرجی رووداوەکان و مەرجی خودی مێژووە (..)، مەرجی جێبەجێبوونی هەموو رووداوێکیش مەرجی ئاستەم بوونیەتی"[39]. بەڵام ئەم دان پێنانەی دیریدا لە چوارچێوەی بیرۆکەیەکدا هاتووە کە دەڵێ: گەر ئێمە مەحاڵ تاقی نەکەینەوە، ئەوا مرۆڤ دەستبەرداری هەموو خەونێکی داپەروەری دەبێ و، دەستبەرداری داواکردنی هەموو سیاسەتێك دەبێ کە لەسەر بنەمای ویژدانێکی دروست دامەزراوە.

### تابلۆی جیهانێکی بێ تەمەن؛

زەمەن لە دەرەوەی چەمسەرەکانی خۆیەتی و، جیهان لە دۆخی بەرخواردن (استهلاك)دایە. کەس نازانێ جیهان لاوە یان پیر، چونکە جیهان بێتەمەنە. دەزگایەکمان نیە بۆ پێوانی تەمەنی مێژو، کە ئایا لە تەمەنی لاوێتیدایە یان لە قەیران و سەرەمەرگدایە؟

دیریدا لە وەڵامی (تێزی کۆتایی مێژو)دا، باس لە جیهانێك دەکا کە ئێمە لە ناوەوە ناتوانین تەمەنی بپێوین. ئێمە ئەو کەسانەین کە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودایـن.. نازانین لە چ تەمەنێکی مێژوی مرۆڤایەتیداین، بەڵام لەوە دڵنیاین کە دیاردەکان تا زیاتر بچنە تەمەنەوە زیاتر دەچنە دۆخی بەرخواردنەوە. لێرەدا دیریدا ئاماژەیەك بۆ پەیڤینی نێوان شاعیرێك و نیگارکێشی یەکێك لە شانۆگەریەکان دەکا "شاعیر: سەردەمانێکی دوورو درێژە ئێوەم نەبینیوە، جیهان لە چ دۆخێکدایە؟.. نیگارکێشەکە: گەورەم جیهان تا زیاتر بە ساڵا بچێ زیاتر دەچێتە دۆخی بەرخواردنەوە"[40].

جیهان لە دۆخێکی خراپدایەو، تابلۆکەش تاریکە، نازانین داخۆ ئەوەی دەبینرێ کامیانە؟! چونکە دەکرێ لەسەر هەموو تابلۆیەکی رەش نیگاری تابلۆیەکی رەشی دیکە بکێشین. بەڵام ئەو تابلۆیانەی کە دەربارەی حیکایەتی کۆتاییەکان دەکێشرێن رەشکردنەوەی رەنگەکانی ترن لە پێناو پیاهەڵدان بە شان و باڵای کەپیتالیزمی لیبراڵی، ئابوری، سیاسی و لە پێناو ئەنتەرناسیونالیزمێکی خۆرئاواییدا وەك دوا فۆرمی حکومەتی مرۆڤایەتی کە لە سایەیدا کۆتایی بە کێشەی چینە کۆمەڵایەتیەکان دەهێنرێ. ئەمەش



بە بڕوای دیریدا بێ ئەزاکەتییەکە کە ئەو جۆرە هوشیارییە بەرهەمی دێنێ. هەروەها سەرنجمان بۆ لای وەهمی کۆتایی شەڕ رادەکێشێ کە هاوزەمان لەگەڵ بڕانەوەی شەڕی ساردداً باسی لێوە دەکرێ، بەڵام ئەو فۆرمە جیاوازەکانی دیکەی شەڕمان دێنێتەوە یاد، وەك شەڕە ئابوری و نەتەوەییەکان، شەڕی کەمینەکان، هەڵچونی رەگەزپەرستی دژی بیانیەکان، ململانێ ئەتنیەکان، ململانێ کولتوری و ئاینیەکان. چەندین ئامرازی تری دەسەڵاتخوازی لە ئارادان وەك (تەکنیکی راگەیاندنەکان، پاسەوانی گشتگیر لە رێگای مانگە دەستکردەکانەوە، هەڕەشەی ئەتۆمی. هەروەها دیریدا -وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد- باس لە (دە) برین دەکا کە بە جەستەی سیستمی تازەی جیهانییەوەن و لە بروسکەیەکی (دە) وشەییدا کۆدەبنەوە:

-بێکاری لە دنیای تازەدا کە تا ئاستێکی زۆر پەیوەندیی بە نەریتەکانی بازاڕی ئازادو تەکنیکە مۆدێرنەکان و دەسەڵاتە گەردونیە تازەکانەوە هەیە، پێویستە لەمڕۆوە ناوێکی تازەی لێبنرێ.. چونکە چیتر رێگەچارە کۆنەکان دەستەبەری چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ناکا.

-ئاوارەبوونی بە کۆمەڵی هاولاتیان و، بێبەشبوونیان لە پرۆسە دیموکراتیەکان و، دەرکردن و گرتنی کەسانێکی زۆر، دابڕانێکی دەستەجەمعی مرۆڤگەلێك لە سەرانسەری جیهاندا ئەزموونێکی نوێ دێنێتە ئاراوە کە فۆرمێکی نوێ دەبەخشێ بە سنورو شوناسە نەتەوەیی و شارستانیەکان.

-ئەو شەڕە ئابورریە سەختەی کە وڵاتە ئەورووپیەکان لەناو خۆیانداو، لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات لە لایەك و، ئەمریکاو ژاپۆن لە لایەکی ترەوە بەرپایان کردووە.. تەئویلێکی تازەو پراکتیزەکردنێکی دوور لە لۆجیك و یەکسانی بۆ یاسای نێودەوڵەتی دەدۆزێتەوە.

-زۆرجار بازاڕی لیبراڵی بە پێچەوانەی یاساکانی خۆیەوە جوڵە دەکاو، دژی دەسکەوتە کۆمەڵایەتیەکانی لیبراڵیزمی ئابوریی کاردەکا.. بەتایبەتی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان هێزی کاری ئەورووپی کە خاوەنی هەموو زەمانەتێکی کۆمەڵایەتییەو، هێزی کاری غەیرە ئەورووپی کە بە نرخێکی هەرزان کاریان پێدەکرێ و زۆرجار خاوەنی زەمانەتی کۆمەڵایەتیش نین.

-کەڵەکەبوونی قەرزی دەرەکی وڵاتە هەژارەکان و فراوانبونی قەیرانە پەیوەندیدارەکان، کە دەبێتە هۆی برسێتی لە رویەرێکی بەرفراوانی جیهانداو دواتر چەندین گۆڕانکاری جوگرافی لێدەکەوێتەوە کە رەنگە وەك بەرهەمی گوتاری دیموکراسی و مافی مرۆڤ وێنابکرێ.

-پیشەسازی و بازرگانی چەك (بە چەکی تەقلیدی و چەکی زۆر تازەشەوە) گەیشتۆتە ناو سیستمی توێژینەوەی زانستی، ئابوری، کۆمەڵایەتی وڵاتە دیموکراتیەکانی خۆرئاوا.

-بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن وڵاتانی جیهانەوە، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە باس لە پاراستنی سەروەری خۆیان دەکەن. ئێستا وەك جاران چالاکیەکانی چەکسازی ئەتۆمی کۆنترۆڵ ناکرێ و سانسۆرکردنی کارێکی زەحمەتە.

-بازنەی جەنگە ئەتنیەکان رۆژ بە رۆژ لە فراوانبووندایە. چونکە هەموو رەسەنایەتیەکی نیشتمانی لە یادەوەرییەوە یان لە نیگەرانی میللەتێکەوە دەستپێدەکا کە دەشێ هەمیشە لە گۆڕاندا بێت.

-بڵاوبوونەوەی باندەکانی مافیاو .زەك دنیان بۆ ناو هەموو شوێنەکان، کە ئێستا لە خۆرئاوا بە گشتیی، وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات بەتایبەتی بۆتە دیاردەیەك کە نەك هەر هەڕەشە لە سیستمی



کۆمەلایەتی و ئابوری دەکا، بەڵکو دزەی کردۆتە ناو دەزگا رەسمیەکانی دەوڵەتانیشەوە.

-قەیرانی یاسای نێودەوڵەتی کە لە ژێر دەسەلاتی چەند زلهێزێکدایەو گرفتاری دەستی کێشەیەکی ریشەییە، پەیوەندیی بە پێوەرەکانی ئەو یاسایەوە هەیە کە لە تەنها مەرجەعیەت و کولتورێکی مێژووییەوە سەرچاوەی گرتووە[41].

بەلام لەگەڵ ئەم برینانەشدا نابێ کار بە ئاراستەی رەتکردنەوەی دەزگا نێودەوڵەتیەکاندا بکرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ کار بۆ چەسپاندنی یاسایەك بکرێ کە لەسەرو یاسای دەوڵەتەکانەوە بێ. دەکرێ مارکس بکرێتە مەرجەعیەتێکی ئەو پرۆسەیە بۆ رەخنەگرتن لە وەهمی سەربەخۆیی یاسای نێودەوڵەتی کە هەمیشە لە لایەن چەند نێوەندێکی خاوەن هێزی ئابوری، زانستی، تەکنەلۆجی، سەرمایەدارییەوە پێشێل دەکرێ و لە بەرژەوەندیی ئەواندا راڤە دەکرێ. ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی تازە هەیە کە لە هەناوی قەیرانەکانی یاسای نێودەوڵەتیەوە دێتەدەرێ. هەرچی گوتاری مافەکانی مرۆڤیشە تا ئێستا شیاوی پراکتیزە کردن نیەو، زۆر جاریش بە مەبەستی شاردنەوەی هەندێ کێشەی جەوهەری دەهێنرێتە ئاراوە. لە سایەی بازاڕی ئازادو کەڵەکەبوونی قەرزی هەندێ وڵات و ناهاوتایی لە پێشکەوتنی زانستی، تەکنەلۆجی، سەربازی، ئابوریی وڵاتاندا، گوتاری مافەکانی مرۆڤ تەنها لە دروشمەکاندا ئامادەیی هەیە. بۆیە لەبری ئەوەی لە پێشوازی ئایدیالیزمی دیموکراتی لیبراڵیداو، لە بەخێرهاتنی بازاڕی سەرمایەداری و کۆتایی مێژوودا، لە چاوەڕوانی کۆتایی ئایدیۆلۆجیەکان و کۆتایی گوتارە رزگاری خوازە گەورەکاندا شایی بگێڕین.. لەبری ئەوانە دەبێ هەرگیز ئەو بەڵگەنەویستانە پشت گوێ نەخەین کە لەبەرچاوماندان و بە ئاشکراو بێ پەردە دەیانبینین: چەندین پیاو، ئافرەت، منداڵ رۆژانە دەکرێن بە کۆیلەو لەژێر باری برسێتیدان. بۆیە ئێستا سەرلەنوێ وەسوەسەی ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی نوێ لە دۆخی دروستبووندایە، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لەوەی سالی *1848* دەچێ. بەلام خاوەنی هیچ یاسایەك، هیچ ناوێك، هیچ حیزبێك، هیچ نیشتمانێك، هیچ چینێك نیە. کەسانێکی زۆر لەدەوری ئەم هاوپەیمانێتیە کۆبوونەتەوە بەبێ ئەوەی یەکتر بناسن یان لەژێر سەقفی رێکخراوێکدابن. مەرج نیە تێزەکانی مارکس، بە تایبەتی تێزە تەقلیدیەکانی وەك دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو یەکگرتنی کرێکارانی جیهان، ئەنگێزەکانی پشتەوەی ئەو هاوپەیمانێتیە بن.. بەڵکو زادەی پەرچەکرداری ئەدەبیاتی ئەو سیستمە نێودەوڵەتییەیە کە درێژبوونەوەیەکی مێژوویی هەیە، نەك یاسایی[42].

**برینی مێژو:**

لەگەڵ هەموو شۆکێکدا مرۆڤ غروری خۆی بریندار دەکا. مێژوی مرۆڤایەتی مێژوی زنجیرە شۆك و برینێکە لە جەستەی نەرجسیەتی ئینساندا، یان هەروەکو فرۆید دەڵێ زنجیرە راچەنینێکە لە دیدی سێنتراڵی مرۆڤدا بەرامبەر دەرون و بایۆلۆجیاو گەردون[43]. بەلام دیریدا باس لە گەورەترین شۆك دەکا کە هەر ئەو سێ شۆکە پێکەوە گرێ دەدا، ئەویش شۆکی مارکسە لە مێژودا، مارکس تەنها لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا نەرجسیەتی مرۆڤ بریندار ناکا، بەڵکو وێنەی فریادرەسەکانیش کە موژدەی دنیایەکی ئایدیالی خۆشتریان پێیە، وێنەی ئەوانیش بریندار دەکاو وێنەی فریادڕەسێکی تازەمان نیشان دەدا کە تەواو جیاوازە. "سەدەی مارکسیزم سەدەی داماڵینی سەنترالیزمی تەکنیکی و زانستی و فیعلیە لەسەر زەوی و لە جوگرافیای سیاسیدا"[44]، سەدەی برینداکردنی "خودی وێنای نەرجسیەتە کە



تیایدا بۆچوونە دژەکان بابەتی دیاری شیتاڵکارییە.. ئێمە ئەمە دەڵێین بۆ ئەوەی بە خێرایی بڕۆین و کەمتر لەسەر سەرچاوەکان بوەستین. بەمجۆرە، ئەم شۆکە کۆتاییەك بۆ ئەو ڕەتکردنەوەیە دەدۆزێتەوە کە لە لایەن بزاوتێکەوە ڕوویەڕووی دەبێتەوە، بزاوتێك تێدەکۆشێ خامۆشی بکا..."[45]. بەڵام دیریدا ئاماژەش بۆ ئەوە دەکا کە ئێستا کۆمەڵگا سەرمایەدارەکان دەتوانن هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژن و بەخۆیان بڵێن: هاوزەمان لەگەڵ داڕمانی ئاراستە سەراپاگیرەکانی سەدەی بیستەمدا، کۆمۆنیزم کۆتایی هات. بەڵکو لەوەش زیاتر دەڵێن نەك هەر کۆتایی پێهات بەڵکو لە بنەڕەتدا بوونی نەبوو، ئەوەی هەبوو لە تارماییەك زیاتر هیچی تر نەبوو. واتە ئەو کۆمەڵگانە باس لە مەرگی مارکسیزمێکی بەرجەستە دەکەن بەڵام ناتوانن نکوڵی لەوە بکەن "کە تارمایی هەرگیز نامرێ و، بەردەوام لە مانەوەو گەڕانەوەدایە"[46]، چونکە تارمایی ئەوە نیە کە هەیە بەڵکو ئەوەیە کە بە زەینماندا ختورە دەکاو، وا دادەنێین کە لە دەرەوە بوونی هەیەو، هەمیشە چاودێریمان دەکا. ئێمە تارماییەکان نابینین بەڵام ئەوان هەمیشە دەمانبینن و ناتوانین لە دەستیان هەڵبێین. واتە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی تارمایی لە دەرەوەڕا وێنا دەکرێ لە ناوەشەوە لەناو زەینی مرۆڤەکانیشدا وێنا دەکرێ. بۆیە لە لاپەڕەی یەکەمی مانیفێستدا سێ جار وشەی تارمایی دووبارە بۆتەوە، ئەو تارماییەی سەرەتا مارکس دروستی دەکاو، دواتر لە لایەن سەرمایەداریەوە سەرلەنوێ وەك کەسێك بەرهەم دێتەوە[47].

مانیفێست لە یەك کاتدا دوژمنەکان و داڕێژەرەکانی خۆیشی ترساند. چونکە خودی ئۆنتۆلۆژیای مارکسیزم لە ململانێدایە لەگەڵ تاریماییەکاندا. بەناوی ئامادەییەکی زیندو و چالاکیەکی ماتریالییەوە هەمیشە دژی دۆخی تارماییبوون بوو، لە حاڵەتێکی واشدا تارماییەکان تەنها دژی سەرمایەدارەکان نەبوون بەڵکو دژی مارکسیەکانیش بوون. واتە مارکس و هیگڵ هاوکات لەگەڵ ئەوەی دەیانویست تارماییەك بۆ تۆقاندنی ئەورووپای پیر دروست بکەن، تارماییان لە ناخی خۆشیاندا دروست کرد، واتە لە کەسێك دەترسان کە لە ناخی هەردوکیاندا بوو. هەر لێرەوە بە بڕوای هەندێك نەدەبوو بەو ئاراستەیەدا کاربکەن، بەڵام ئەوە رویدا کە بینیمان: بۆ نمونە نازیزم و فاشیزم وەك دوو سیستمی تۆتالیتار سەرەڕای ئەوەی دژی دوژمنەکانی کۆمۆنیست بوون، دژی خودی کۆمۆنیستیش بوون، جارێك لەملاو جارێك لەولا بوون بۆ شەڕکردن دژی ئەو تارماییانە.

مرۆڤ خۆی مێژوی خۆی دروست دەکا، بەڵام لە ڕێگای بزاوتی خۆیەوە ئەو کردەیە ئەنجام نادا، واتە لە چوارچێوەی ئەو مەرجانەدا کار ناکا کە خۆی هەڵیدەبژێرێ، بەڵکو لە چوارچێوەی ئەو مەرجانەی کە ئامادەن و هەن. مرۆڤ هەمیشە لە دۆخێکدا ئیش دەکا کە بە میرات بۆی بەجێماوە، نەك دۆخێك کە هەڵیبژاردووە. لێرەوە ترادیسیۆن و نەریتەکانی ئەوە مردووەکان بارێکی قورسی ناو دەماغی زیندووەکانن[48]. ئێستا مارکس کە مردووە داخۆ دەیەوێ چی بڵێ؟ واتە داخۆ دەیەوی وەك مردوو قسە بکاو ئێمەی زیندوش گوێڕایەڵی بین؟ یان دەبێ ئێمەی زیندو سەرلەنوێ وێنەی تازە بۆ ئەو بەرهەم بێنینەوە، کاراکتەر بین نەك کارلێکراو، لەبری ئەوەی ملکەچی میرات بین واتە ملکەچی حوکمەکانی رابردوو بین.. دەبێ ملکەچی هەڵبژاردنەکانی ئێستا بین.

### سیماکانی تارمایی:

رەنگە زۆر کەس تەماشای تێزەکانی مارکس لە "ئایدیۆلۆجیای ئەڵمانی"ەوە تا "سەرمایە" بکا وەك



چەند تێزێکی یەکانگیر، نەك وەك چەند تێزێکی فیکری جیاواز، یان تێزێك کە هەلگری دژبوونە لەناو خودی خۆیدا. بەلام لە راستیدا مارکس لە لایەکەوە سوورە لەسەر رێزگرتنی رەسانەیەتی و چالاکی تایبەتی ئیدیالێکی سەربەخۆ، کە تەنها لە فەنتازیادا دەرناکەوێ بەلکو رەنگە لە شێوەی جەستەیەکی تەکنیکی و دروستکراویشدا خۆی نمایش بکا، لەگەلّ ستراکتوری دۆخە تازەکانیشدا خۆی بگونجێنێ. کەچی لە لایەکی ترەوە دەیەوێ رەخنەکانی خۆی سەبارەت بە وێنەی تارمایی لەسەر بنەمایەکی ئۆنتۆلۆژی دابمەزرێنێ[49]. ئەگەر بە وردی لەسەر چەمکی (تارمایی) بوەستین دەبینین رەخنەگرتن لەو چەمکە رەخنەگرتنە لە کارەکتەرێکی زاتی و ئەبستراکت کە تەنها ئامادەیی لەزەیندا هەیە نەك لە واقعدا، بەلام لە راستیدا مارکس ئەم جۆرە کارەکتەرە شەفافەی ناوێ، بەلکو کارەکتەرێکی مەبەستە کە بە هەموو قورسایی خۆیەوە تارمایی وەهمەکان راوبنێ.. واتە مارکس خۆی بە دەستی خۆی دژ بوونێکی دروست کردووە سەبارەت بە وێنەی تارمایی فریادرەس/ تارمایی دوژمن، تارمایی تاکێکی خاوەن ئیرادەو تارمایی فاکتەرە دەرەکی و بابەتیەکان، تارماییەك بەرهەمی خەیالدانی خودەو تارماییەك بەرهەمی ئەو ترسانەیە کە کۆمەلّ لە دەرەوە پێمان دەبەخشن.. واتە "تارماییەك لەناو سەر -زەین- و دەرەوەی سەریشدایە، مارکس خۆی ئەمەی دەزانی، بەلام وا دەردەکەوت کە نایەوێ ئاگاداری ئەم خالە بێت"[50]. هەر ئەم دژبوونەش بوو کە شتێرنەر لە مارکسدا ئاشکرای کردوو، لە بەرامبەریشدا -هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا- مارکسی زۆر نیگەران کرد.

دەکرێ گریمانەیەك پێشکەش بکەین سەبارەت بە تارمایی - لۆجیا لای مارکس، چونکە چەند هەسارەیەکی گرفتئامێز هەن کە کەنارێکی ئارام شك نابەن بەلام لەژێر چەند ناوێکی تایبەتی وەك مارکس، فرۆید، هایدگەر-دا دەبریسکێنەوە. بەلام هایدگەر نەیدەویست فرۆید و مارکس بناسێ، ئەوەش رێکەوت نەبوو، چونکە مارکس هێشتا پێشوازی نەکراوەو، هێشتا ئاوارەیەکی کۆچکردووە کە لە یەك کاتدا نهێنی و ئاشکرا، پیرۆزکراو و نەفرەت لێکراویشە. ئەو لە زەمەنێکدا هاتووە کە زەمەنی خۆی نیە، ئەو لە دەرەوەی چەمسەرەکانی خۆیەوە هاتۆتە ناو مێژوو. ئەگەر مارکس وەك فرۆیدو هایدگەر و کەسانێکی زۆر لە شوێنێکەوە دەستیان پێکردبێ کە نەدەکرا بکرێتە دەسپێك.. ئەوا هەلەکە هەلەی ئەوان نیە بەلکو هەلەی ئەوانەیە کە دەبنە میراتگریان. "بۆیە وریابوون پێویستە، بە تایبەتی باجێکی زۆر خراوەتە سەر شانی مرۆڤایەتی کە دەبێ بیدا (..) باجی بڕوابوون بەوەی کە دەکرێ لەگەلّ گەوهەری گشتی مرۆڤدا کۆتایی بە مێژوو بهێنین، بە بیانوی ئەوەی ئەو گەوهەرە شتێك نیە جگە لە تارمایی (..) یان وەکو ساویلکەو دۆگماییەکان بێ دوودلّی بڕوای تەواو بەو تارماییە بێنین.. بەهەر حالّ هەمیشە لە نێوان بڕواکاندا دەرگاکان بەرتەسکن"[51].

**سێ چرکە:**

چرکەی یەکەم: مارکس تارمایی کۆمۆنیزمی دروستکرد، هاوکات لەگەلّ بەرجەستەبوونی ئەو تارماییە لە واقعدا، ئیدی شتێك نەما ناوی تارمایی کۆمۆنیزم بێت.. چونکە تارمایی سروشتێکی سەدیمی و گەوهەرێکی نەخەملیوی هەیە، هەموو بەرجەستە بوونێکیش واتە مەرگ.

چرکەی دووەم: فۆکۆیاما لیبرالیزمی خۆرئاوایی لە دۆخێکی نەخەملیوەوە، کە لە دەرەوەی تەمەنی مێژوو بوو، گواستەوە بۆ دۆخێکی بەرجەستە.. چونکە ئەو سەرلەنوێ تەمەنی کردەوە بە بەری مێژوودا. واتە لە دایکبوونی دوامۆدێلی لیبرالیزمی



خۆرئـاوایی وەك مـەرگی زەمـەن (كۆتـایی مێـژو) وێناكرد.

چركـەی سێیەم: دیرێدا ماركسی لـە دۆخێكـی بەرجەستەوە گەڕاندەوە بۆ دۆخی تارمایی. ئیـدی ماركسێك نـەما قسـەمان بـۆ بكـاو ئاراستەمان بكـا.. بەڵكو دەكرێ ماركسێك هەبێت بەزەیندا ختورە بكاو، هەر جارەی بە شێوەیەك خۆی نمایش بكا.

## پەراوێزەكان:

1–ئەلسـەفەی شـیتالكەری لەسـەر بنـەمای لـە بەریەكهەڵوەشانەوەی هەموو ئەو چەمكانە دامەزراوە كە سەنتراليزمی ئەقڵ بە درێژایی مێژوی مرۆڤایەتی بەرهەمی هێنـاوە. ئـەركی شـیتالكەری بریتیـە لـە گواستنەوەی چەمكە ئەقڵانییە پێكەوە گونجاوەكان بۆ ئـەو ئاستـە رەسـەنانەی بـوون كـە هـەموو هـەستەكان لـە دۆخێكـی نەخەملیودان. بڕوانە: نديـم نجدي، بيـان الأطيـاف.. أمـا وقد مـات ماركس ديريدا مـازال حيـاً. (ط 1، بـيروت: دار الفارابي، 1999)، ص 201– 203.

2–م. س. پ، ل 31.

3–م. س. پ، ل 31.

4–ناونیشانی ئەم كتێبە بەم جۆرەیە:

جاك دیریدا، أطیاف ماركس. ت: د. منذر عیاشـي. (ط 1، حلب: مركز الانماء الحضاري، 1995).

5–لەمبارەیەوە بڕوانە: جان فرانسـوا ليوتـار، الوضـع مـا بعـد الحداثـي. ت: أحمـد حسـان. (ط 1، القـاهرة: دار الشرقيات، 1994)، ص 23–26.

6–دەربارەی ئـەم دوو دەقـە بڕوانـە: نديم نجدي، بيـان الأطياف، ص36–37.

7–أطياف ماركس. مقدمة: منذر عياشي، ص 5.

8–م. س. پ، ل 8.

9–جاك دیرێدا، سەرچاوەی پێشو، ل 19–20.

10–م. س. پ، ل 20.

11–م. س. پ، ل 23.

12–م. س. پ، ل 26.

13–بڕوانە: نديم نجدي، بيان الأطياف، ص 101–102.

14–بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل 109.

15–دیرێدا دەڵێ: "ئاهـ.. ماركس عاشقی شكسپیر بوو، ئەمە ئاشكرایەو (كریس هانی)ش هـەمان سۆزی هـەبوو (..) مانیفێستیش هەر لە سەرەتاوە تارماییەكی بێدەنـگ ئامادە دەكاو هەر لە دەسپێكەوە دەیهێنێتـە ئـاراوە..". بڕوانە: أطياف ماركس، ص 36–36.

16–لەمبارەیەوە بڕوانە: بيان الأطياف، ص 109.

17–دەربارەی ئـەو سـێ رەگـەزە پێكهێنـەرە بڕوانـە: دیرێدا، تارماییەكانی ماركس، ل 28–35.

18–م. س. پ، ل 41.

19–م. س. پ، ل 43.

20–دیرێدا بە درێژی سەبارەت بە پەشێوی سەردەمەكان قسە دەكاو ئاماژە بۆ هاملێت –ی شكسپیر دەكا كە لـە پەرچەكرداری دەركـەوتنی تارمـایی بـاوكیدا دەكەوێتـە قسە، دەركەوتنێك كە لە زەمەنـی خۆیدا نیـە " – ئـای ع فێڵێكی نەفرینە من لـە دایكبووم تـا ئاراستـەی (زەمـەن) راستبكەمەوە..."، لەمبارەیەوە بڕوانە: پـەراوێزی ل 231: كیـت سـوبر، الماركسـية و التفكيكيـة، ت: سـعدي عبداللطيف. النهج، شتاء 1996.

21–م .س. پ، ل 231.

22–بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: س. پ، ل 232.

23–دیرێدا جیاوازی لـە نێوان دوو زەمـەنی دەركـەوتنی ماركسدا دەكـا، زەمـەنی یەكـەمیان ناودەنـێ زەمـەنێكی واقعی كە تیایدا ماركسیزم لە دۆخـی پراكتیكردندایە.. دووەمیان ناودەنێ زەمەنێكی دواخراو كە ماركسیزم تەنها لە زەیندا ئامادەیی هەیە نەك لە دنیـای واقعدا. "ئـەوەی كە ئێستا دژی ئەوە: نائامـادەیی و نەبوونی چالاكی و نەبوونی پەیوەندیی ئـەوە بە زەمـەنی ئێستـاوە.." واتـە رۆڵی نێگەتیڤی ئەو پەیوەندیی بە زەمەنەوە هەیە نەك بە خودی خۆیەوە. بڕوانە: أطياف ماركس، ص 84.

24–الماركسية و التفكيكية..، ص 232–233.



25–س. پ، ل 233.

26–جاك دريدا، أطياف ماركس، ص 105.

27–هـ. س. پ، ل 105.

28–هـ. س. پ، ل 111.

29–بڕوانە هـ. س. پ، ل 113.

30–س. پ، ل 115–116.

31–س. پ، ل 117.

32–س. پ، ل 119.

33–س. پ، ل 104.

34–س. پ، ل 119–120.

35–لەمبارەیەوە بڕوانە لاپەڕەکانی 120 تـا 130، هـەمان سەرچاوەی پێشو.

36–لەمبارەیـەوە بڕوانـە: کیـت سـوبر، الماركسـية و التفكيكية. النهج، ص 234.

37–زۆرجار لە دنیای ئێمـەدا بـەم میکانیزمـە بـەراورد لـە نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا، موسڵمان و مەسیحی، کورد و غەیرە کورد.. هتد، دەکرێ. واتە لەبری ئەوەی بەراورد لە نێوان دۆخە جیاوازەکاندا بکەین، کەچی بەراورد لە نێوان شوناسە جیاوازەکاندا دەکەین وەك ئـەوەی دۆخـەکان خەسڵەتی ئەزەلی و ئەبەدی شوناسەکان بن. بۆ نمونە زۆرن ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئێمە لەبەر ئـەوەی خـەڵکی خۆرهەلاتین و موسڵمانین ئیتر ئەوە قەدەرمانە تا هەتایـە یەکتر بکوژین. ئەو کەسانەی کەبەم نەغمە ترسناکە قسـە دەکەن دەیانەوێ پێمان بڵێن کە شەڕو کوشتار لە لایەك و ئاشتی و پێکەوە ژیان لە لایـەکی تـرەوە دوو هـەڵبژاردن نین بەڵکو دوو قەدەرن پەیوەندییان بە شوێنی جوگرافـی و رەنگی پێست و رەگەزو ئاینەوە هەیە، لێرەوە بە بڕوای ئەو جۆرە کەسانە تەنها دوو هەڵبژاردنمان لە بەردەمدایە: یان دەبێ هەموو خەونەکانمان بە سبەینێیەکی شادترەوە بکوژین، یان دەبێ نکوڵی لە شوناسەکانی خۆمـان بکـەین و، لە خۆرهەلاتیەوە ببین بە خۆرئاوایی، لـە موسڵمانەوە ببین بە مەسیحی، لە گەنم رەنگەوە ببین بـە سـوورو سپی تاکو لە رەگەزی ئەو مرۆڤە باڵایە نزیك ببینەوە کـە نـاوی خۆرئاواییە. بـە کورتـی بـە هـەمان ئـەو ئەندازەیـەی ئـەو گوتارە خۆرئاواییەی –کە دیریدا شیتاڵی دەکاو رەخنـەی لێدەگرێ– ئێمەی خۆرهەلاتی بە پرۆژەیـەکی بـەردەوامی شەڕو ناشرینی دەبینی. دارێژەرانی ئـەو گوتـارەی لەمـەڕ خۆشمـان خۆرئـاوا بـە پرۆژەیـەکی بەردەوامی ئاشـتی و جوانی دەبینن. واتە ئەو گوتارەی دنیای خۆمان تەرجەمە کردنێکی سەقەتی رووە ناشرینەکەی کولتوری خۆرئاوایە، نەك رووە هیومانیستەکەی.

38–هـ. س. پ، ل 236.

لێرەدا دیریـدا مەبەستی ئەوەیە کـە بەشێکی زۆری ئـەو رەخنانـەی لـە خۆرئـاواوە ئاراستەی خۆرهـەلات دەکرێـن سـەبارەت بـە رەوشـی مافـەکانی مـرۆڤ بـە مەبەسـتی تۆخکردنـەوەی شوناسـی هیومانیسـتی خۆرئـاوایی بـەکاردێن، نـەك بـە مەبەسـتی یارمـەتیدانی گـەلانی خۆرهـەلات و چاککردنی رەوشـی مافـەکانی مـرۆڤ لـە وڵاتەکانیاندا. هـەر دوور مـەڕۆ تـا ئێستا سـەدان راپۆرت سـەبارەت بـە رەوشـی مافـەکانی مـرۆڤ لـە عـێراقدا بەرزکراوەتەوە بۆ نەتـەوە یەکگرتووەکان و، لـە هـەموو بۆنەیەکدا لە کەناڵەکانی میدیاوە باس لە دڕندەیی سەدام حسێن و رژێمەکەی دەکرێ.. تا ئـەو ئەندازەیـەی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ لـە عـێراقدا بۆتـە دۆخێکـی جێگیرو، خەریکە ناشرینی و دڕندەیی لە عێراقدا دەبێتە شوناسێك کە مەحاڵە کەس بتوانێ لێی هـەڵبێ، چونکـە شوناسێکە تەنها لـە نـاوەوە بەرهـەم نایـەت.. بـەڵکو لـە دەریشـەوە هەمیشـە لـە لایـەن ئـەو گوتـارە خۆرئاواییـەوە بەرهـەم دێتەوە. واتە ئەو گوتارە هێندەی مەبەستێتی وێنەیـەکی جوانی خۆی لە رێگەی وێنەیـەکی ناشـرینی بەرامبـەرەوە دروست بکـا، هێنـدە مەبەستی نیە وێنـە ناشـرینەکەی بەرامبەر جوان بکـا.. چونکـە ناشـرینی بەرامبـەر مـەرجی پێویستی جوانی ئەوە. بۆیە دیریدا جـەخت دەکا لەسـەر ئەوەی کە پێویستە چیتر بەو میکانیزمە پراگماتیە مامەڵ لەگەڵ مرۆڤدا نەکرێ.



39–کیت سوبر، الماركسية و التفكيكية..، ص 236.

4–جاك دیریدا، سەرچاوەی پێشو، ل 150.

41–دەربارەی ئەم نیاردانەی کە دیریدا بە (دە) بریینی جەستەی سیستمی نێودەوڵەتی تازە ناوی دەبا بڕوانە: س. پ، ل 156–162.

42–بڕوانە: س. پ، ل 162–165.

43–لێرەدا دیریدا ئاماژە بۆ شۆکی سایکۆلۆجی، شۆکی بایۆلۆجی، شۆکی گەردونی دەکا، کە بە بڕوای فرۆید لە سێ قۆناغی جیاوازدا غروری سینترالیزمی مرۆڤیان بریندار کردووە. بڕوانە: س. پ، ل 187–188.

44–م. س. پ، ل 189.

45–م. س. پ، ل 189.

46–م. س. پ، ل 191.

47–بڕوانە: س. پ، ل 191–194.

48–بڕوانە: س. پ، ل 208.

49–بڕوانە: س. پ، ل 312–313.

50–م. س. پ، ل 316.

51–م. س. پ، ل 323.



# کاری نامۆبوو[1]

■ کارل مارکس

● و. لەفارسییەوە: ڕێبین هەردی

ئێمە لە پێشگریمانەکانی ئابوری سیاسییەوە دەستمان پێکرد و زمان و یاساکانیمان قبولکرد. مولکیەتی تایبەتی، هەڵوەشاندنی (تفکیک) کار، سەرمایەو زەمین، هەڵوەشاندنەوەی کرێ، سودی سەرمایەو بەکرێدانی بەهای زەوی و هەروەها دابەشکردنی کار، ململانێ و چەمکی نرخی ئاڵوگۆڕ و ئەوانی دیمان بە پێشگریمانەی خۆمان دانا. بەپێی بنەماکانی ئابوری سیاسی و بە وشەکانی ئەو، دەرمانخست کە کرێکار تا سنوری کاڵایەك و لە ڕاستیدا نزیوترین جۆری کاڵا دادەبەزێ، دەرمانخست کە بێچاری و بەدبەختی کرێکار لەگەڵ دەسەڵات و مەزنی ئەو کاڵایانەی بەرهەمی دێنێ، پەیوەندیەکی پێچەوانەی هەیە. دەرمانخست کە دەرئەنجامی ناچاری ململانێ، کەڵەکە بوونی سەرمایەیە لە دەست کۆمەڵێکی دیاریکراو و لێرەوە پەیدابوونی مۆنۆپۆلکردن بە دڕندانەترین شێوە مومکینە، دواجار دەرمانخست کە جیاوازی سەرمایەداران و بە کرێدەرانی زەوی وەك جیاوازی کرێکارانی وەرزێڕی و کرێکارانی پیشەسازی لەناو دەچێ و سەرجەم کۆمەڵگا دابەش دەبێت بۆ دوو چینی خاوەن مولك و کرێکارانی بێ مولك.

ئابوری سیاسی کاری خۆی لە واقعیەتی کۆنکرێتی مولکایەتی تایبەتیەوە دەست پێدەکات، بەڵام ئەو واقعیەتە ڕوون ناکاتەوە. ئابوری سیاسی ڕەوتی **مادیەتێك** کە مولکیەتی تایبەتی دەیبڕێ، لە فۆرمولگەلێکی هەمەکی و تەجریدیدا کە دواتر بە شکڵی **یاسا** پێشکەش دەکرێ، ئاشکرا دەکات. ئابوری سیاسی ئەم یاسایانە لە ئێمە **ناگەیەنێت**: واتە دەریناخات کە ئەم یاسایانە چۆن لە خودی مولکیەتی تایبەتیەوە دروست بوون. ئابوری سیاسی هیچ ڕونکردنەوەیەك لە بارەی سەرچاوەی دابەشبونی کارو سەرمایەو زەوی، نادات بە دەستەوە. بۆ نمونە کاتێك کە پەیوەندی کرێ بە قازانجەوە پێناسە دەکات، بەرژەوەندی سەرمایەدار بە هۆی ئامانجی



(علە غانیە) دەزانێ، واتە ئەو شتەی کە بڕیارە رونی بکاتەوە، بە شتێکی بەڵگەنەویست دەزانێ. هەر بەم شێوەیە ململانێ (لە بەڵگاندنەکانیدا "استدلال") بە فراوانی بەکار دەبرێت و بەپێی هەلومەرجی دەرەکی روندەکرێتەوە. ئابوری سیاسی لەو بارەیەوە کە ئەم هەلومەرجە دەرەکی و بە روکەش لاوەکیانە تا چ ئەندازەیەك دەرکەوتی رەوتی ناچاری پەرەسەندنە، هیچ بە ئێمە نالێت. ئێمە بینیمان کە چۆن ئاڵوگۆڕ لە روانگەی ئابوری سیاسیەوە وەك واقعیەتێکی لاوەکی دەردەکەوێت. تەنها هێزێکی بزوێنەر کە ئابوری سیاسی پشتی پێدەبەستێ **تەماع** و **چاوچنۆکی** و شەڕی نێوان **چاوچنۆکان** واتە ململانێیە. بە وردی لەبەر ئەوەی کە (ئابوری سیاسی شێوەی پەیوەندی ئەم جوڵەیە دەرك ناکات). دەتوانێ بۆ نمونە شێوازی ململانێ لە بەرامبەر شێوازی مۆنۆپۆلکردندا، شێوازی ئازادی خاوەنانی پیشە لە بەرامبەر شێوازی پۆلێنەکان، شێوازی دابەشکردنی موڵکیەتی زەوی لە بەرامبەر شێوازی موڵکە گەورەکاندا، دابنێ. چونکە ململانێ، ئازادی خاوەن پیشەکان و دابەشکردنی موڵکیەتی زەوی بە دەرئەنجامی ناچاری و سروشتی، سیستمی پۆلێن و موڵکیەتی دەرەبەگایەتی نازانێ، بەڵکو وەك دەرئەنجامە لاوەکی و لە پێشەوە بیرلێکراوەو توندەکانی ئەو حاڵەتانە، رونیان دەکاتەوە.

کەوابوو هەنوکە دەبێ پەیوەندی زەروری نێوان موڵکیەتی تایبەتی، چاوچنۆکی و تەماع و هەڵوەشاندنەوەی کار، سەرمایەو موڵکیەتی زەوی، ئاڵوگۆڕو ململانێ، بەهادانان یان سوکایەتیپێکردنی مرۆڤ، مۆنۆپۆلکردن و ململانێ و ئەوانی دیو بە دەربڕینێکی دی پەیوەندی سەرجەم ئەم سیستەمە لەخۆ نامۆکەرو سیستمە پارەییە، تاوتوێ بکەین.

نیازمان نیە باسەکەمان وەك (شێوازی باوی) ئابوریزانانی سیاسی لە تاوتوێکردنی هەلومەرجی سەرەتایی خەیاڵیەوە، دەست پێبکەین. هەلومەرجێکی وا سەرەتایی هیچ شتێك روون ناکاتەوە و تەنها مەسەلەکە بۆ خاڵێکی دوردەست و نەزانراو، دەگەڕێنێتەوە. ئەم هەلومەرجە ئەوەی کە بڕیارە ئابوریزان هەڵیهێنجێن واتە پەیوەندی ناچاری نێوان دوو شت، بۆ نمونە نێوان دابەشکردنی کارو ئاڵوگۆڕ، بە واقعێکی بەڵگەنەویست و روداو دەژمێرێ. هەر بەم شێوەیەش یەزدانناسی رەگ و ریشەی خراپە بە هاتنە خوارەوەی ئادەم روندەکاتەوە، واتە ئەوەی کە دەبێ روون بکرێتەوە لە شکڵێکی مێژوییدا وەك واقعیەتێکی بەڵگەنەویست، پیشان دەدات.

(بەڵام) ئێمە لە واقعیەتی ئابوری هاوچەرخەوە دەست پێدەکەین. هەرچەند کرێکار سامانێکی زۆرتر بەرهەم بهێنێ و بەرهەمەکانی لە روی دەسەڵات و هەندەوە زیاتر بێت، کرێکار فەقیرتر دەبێت. هەرچەند کرێکار کاڵای زیاتر دروست بکات، خۆی زیاتر دەبێ بە کاڵایەکی هەرزانتر. زیادبوونی نرخی جیهانی شتەکان پەیوەندیەکی راستەوخۆی بە دابەزینی نرخی جیهانی مرۆڤەکانەوە هەیە. کرێکار تەنها کاڵا بەرهەم نامێنێت، بەڵکو خۆی و کرێکاریش وەك کاڵایەك بەرهەم دێنێ، ئەمەش بە هەمان ئەو رێژەیەی کە بە شێوەیەکی گشتی کاڵا بەرهەم دێنێ.

ئەو راستیەی سەرەوە بە مانای ئەوەیە شت کە کار بەرهەمی دێنێ واتە بەرهەمی کار، لە بەرامبەر کاردا وەك **شتێکی نامۆو دەسەڵاتێکی سەربەخۆ**، سەر بەرز دەکاتەوە. بەرهەمی کار، کارێکە کە لە شتێکدا بەرجەستە بووە، واتە بووە بە مادەیەك. ئەم بەرهەمە **بەرجەستە بوونی** کارە[2]. بە واقعیبوونی (*realozation*) کار، بەرجەستەبونی کارە. بە واقعیبوونی کار لە بواری ئابوری سیاسیدا بۆ کرێکاران لە شێوەی **لە دەستدانی واقعیەت**[3]، بەرجەستەبوون لە شێوەی لە دەستدانی شت و



کۆیلەیەتی لە بەرامبەریدا، موڵکداری (بەرهەم) بە شێوەی **جیابوونەوە** یان نامۆ بوون (لە بەرهەم)، دەردەکەوێت[4].

بە واقعیبوونی کار وەك لە دەستدانی واقعیەت تا ئەو سنورەیە کە کرێکار واقعیەتی خۆی تا سنوری مردن لە برسانا، لەدەست دەدات. بەرجەستەبوون وەك لە دەستدانی شت تا ئەو سنورەیە کە لە کرێکار شتگەلێك دەرفێنرێ کە نەك هەر بۆ ژیانی بەڵکو بۆ کارەکەی پێویستە. لە راستیدا خودی کار دەبێ بەشتێك کە کرێکار تەنها بە هەوڵێکی بێوچان و بە راوەستانی نارێك و پێك دەتوانێ بە دەستی بهێنێ. موڵکداری شت بە شێوەی نامۆبوون لێی تا ئەو سنوورەیە کە کرێکار هەرچەند زیاتر شتەکان بەرهەم بهێنێ، کەمتر دەبێتە خاوەنی و زیاتر دەچێتە ژێر رکێفی بەرهەمەکەی خۆی، واتە سەرمایەوە.

سەرجەم ئەم دەرئەنجامانە لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرن کە پەیوەندیی کرێکار بە **بەرهەمی کارەکەی خۆیەوە**، پەیوەندیە **بە شتێکی نامۆوە**. بە پێی ئەم پێشگریمانەیە گومانی تیا نیە کە هەرچی کرێکار زیاتر خۆی بەکار دەبەخشێ، جیهانی نامۆی شتەکانی کە دروستی دەکات بەسەرخۆی و دژی خۆی بەهێزتر دەبێ و ژیانی دەرونی بەتاڵ دەبێ و شتگەلێکی کەمتر دەبێ بە موڵکی ئەو. هەر ئەم شتانەش لە دیندا روودەدات. هەرچی مرۆڤ خۆی زیاتر بەخودا دەبەخشێ، کەمتر گوێ بەخۆی دەدات. کرێکار ژیانی خۆی تەرخان دەکات بۆ بەرهەمهێنانی شتێك بەلام ژیانی چیدی نەبەستراوە بە خۆیەوە، بەڵکو بەستراوە بەو شتەوە (کە بەرهەمی دێنێ). لێرەوە هەرچی ئەم چالاکیە فراوانتر بێت کرێکاران شتگەلێکی کەمتر بەدەست دێنن. بەرهەمی کاری ئەو هەرچی بێت، ئەو چیدی خۆی نیەو لە ئەنجامدا هەرچی ئەم بەرهەمە زیاتر بێت، ئەو کەمتر خۆی دەبێت. **نامۆبوونی** کرێکار لەو بەرهەمانەی بەرهەمی دێنێ، نەك هەر بە مانای ئەوەیە کە کارەکەی دەبێ بە شتێك و بە بوونێکی **دەرەکی** بەڵکو بەو مانایەشە کە کارەکەی لە **دەرەوەی** ئەوە، سەربەخۆ لەو و وەك شتێکی نامۆ لەگەڵیدا هەیەو دەسەڵاتێکە کە لە بەرامبەریدا رادەوەستێ. شتەکان بەو ژیانەی کرێکار پێیاندەبەخشێ، وەك شتێکی نامۆ لە بەرامبەریدا، رادەوەستێ.

ئێستا وردتر تەماشای چەمکی بەرجەستەبوون و ئەو بەرهەمەی کرێکار بەرهەمی دێنێ و تیایدا تەماشای **نامۆبوون و لە دەستدانی شت** واتە بەرهەمەکەی، دەکەین.

کرێکار ناتوانێ شتێك بێ **سروشت**، بێ **جیهانی هەستپێکراوی دەرەکی**[6] دروست بکات. ئەوە مادەیەکە کار لەسەر بناغەی دەبێ بە واقعی و شتێکی فیعلی و لە مادەو بەهۆی مادەوەیە شتەکان بەرهەم دێنێ.

سروشت وەك چۆن **ئامێرەکانی ژیان** ***Means of life*** بۆ کار دەستەبەر دەکات (بە مانای ئەوەی کە کار بێ ئەو شتانەی کە کاریان لەسەر دەکات، ناتوانێ ژیانی هەبێت) بە مانایەکی سنوردارتر **ئامێرەکانی** ژیانیش دەستەبەر دەکات.. واتە ئامێرگەلێك کە بۆ زامنکردنی ژیانی مادی خودی کرێکار، پێویستە.

لێرەوە هەرچی کرێکار لە جیهانی دەرەکی و لە ئەنجامدا سروشتی هەستپێکراو، بەکاری خۆی دەکات بە موڵکی خۆی، خۆی بە شێوەیەکی دوچەندان لە ئامێرەکانی ژیان مەحروم دەکات، یەکەم: لەبەر ئەوەی جیهانی هەست پێکراوی دەرەکی چیدی نابێتە شتێکی بەستراو بەکاری ئەوەوە یان بە دەربڕینێکی دی **ئامێری ژیانی** نابێت، دوهەم ئەم جیهانە هەسپێکراوە دەرەکیە چیدی **ئامێری ژیان** بە مانای راستەوخۆ واتە ئامێرێك بۆ زامنکردنی گوزەرانی کرێکاریش نابێ.



**کەوابوو لە هەردوو لایەنەوە، کرێکار دەبێتە** کۆیلەی شتەکە، سەرەتا لەو رووەوە کە ئوبژێکتی کار وەردەگرێ واتە لەو رووەوە کە کار (و ئیشێك) پەیدا دەکات و دوهەم لەو روەوە کە ئامێری گوزەرانی ژیانی *Meuns of subsistence* خۆی وەردەگرێ. لێرەوە دەتوانێ کە سەرەتا وەك کرێکار و دوهەم وەك **بونێکی جەستەیی** *Physical subject* بوونی هەبێ. لوتکەی ئەم کۆیلەیەتیە کاتێکە کە تەنها لە پلەی کرێکاردا دەتوانێ **بوونی جەستەیی** بپارێزێ و تەنهاش وەك **بونێکی جەستەیی**، بە **کرێکار** دەژمێرێ. نامۆبونی کرێکار لە بەرهەمەکەی خۆی لە یاساکانی ئابوری سیاسیدا بەم شێوەیە دەردەبرێ: (هەرچی کرێکار زیاتر بەرهەم بهێنێ، کەمتر مەسرەف دەکات،.. هەرچەند نرخی زیاتر بەرهەم بهێنێ، خۆی بێ بەهاتر و بێ نرختر دەبێ.. هەرچی بەرهەمەکانی زیاتر پوختە کراو بێت، خۆی کورتر دەبێ.. هەرچی بەرهەمەکەی شارستانیتر بێت، خۆی دڕندەتر.. هەرچی کار بەهێزتر، خۆ بێ تواناتر.. هەرچی کار هوشیارانەتر، خۆی دەبەنگ ترو زیاتر دەبێتە کۆیلەی سروشت).

**ئابوری سیاسی بە لە بەرچاوگرتنی پەیوەندی راستەوخۆی نێوان کرێکار** (کار) **و بەرهەمەکانی، نامۆبونی زات لە خەسڵەتی کاردا دەشارێتەوە.** راستە کە کار بۆ دەوڵەمەندان شتگەلێکی سەرسوڕهێنەر بەرهەمدێنێ، بەڵام بۆ کرێکار فەقیری و دەستکورتی بەرهەم دێنێ. کار دروستکەری کۆشکەکانە، بەڵام بۆ کرێکار کەپرێك دروستدەکات. کار جوانی دروستدەکات بەڵام بۆ کرێکار ناشرینی بەرهەم دێنێ. ماشێن لەبری کار (ی دەستی) دادەنێ بەڵام بەشێك لە کرێکاران بۆ کاری دڕندانە پاڵێوە دەنێ و کرێکارانی دیش دەکات بە ماشێنێك. کار بەرهەم هێنی هوشیاریە بەڵام بۆ کرێکاران گەمژەیی و بێ هەستی بەرهەم دێنێ.

**پەیوەندی راستەوخۆی کار بە بەرهەمەکانیەوە، پەیوەندی کرێکارە بەو بەرهەمانەی خۆی بەرهەمی دێنێ.** ئەو پەیوەندیەی کە موڵکدار بە بەرهەمەکانی بەرهەم هێنانەوەو خودی بەرهەم هێنانەوە دروستی دەکات، تەنها **دەرئەنجامێکی** ئەم پەیوەندیە سەرەتاییەیەو دەیسەلمێنێ. ئێمە پاشتر ئەم لایەنی دووهەمە تاوتوێ دەکەین.

کاتێك دەپرسین پەیوەندی بنەڕەتی کار چیە، لە راستیدا مەبەستمان پەیوەندی کرێکارە بە بەرهەمهێنانەوە.

تا ئێستا جیابونەوەو نامۆبونی کرێکارمان لەیەك لایەنەوە واتە لە رووی پەیوەندی کرێکار بە بەرهەمهێنانی کارکردنەوە تاوتوێکرد، بەڵام نامۆبوون نەك هەر لە دەرئەنجامی بەرهەمهێناندا بەلکو لە خودی ئیشی بەرهەمهێنانداو لە چوارچێوەی چالاکی بەرهەمهێنانیشدا روودەدات. ئەگەر کرێکار لە خودی ئیشی بەرهەمهێناندا خۆی لەخۆی نامۆ نەکردبێ، چۆن دەتوانێ سەبارەت بە بەرهەمی چالاکیەکەی نامۆ بێت؟ بەرهەمی بەرهەمهێنان، دەرئەنجام و بەرهەمی چالاکی و بەرهەمهێنانە، کەوابوو گەر کرێکار نامۆ بێت بە بەرهەمی کار، ئەوا دەبێ خودی بەرهەمهێنان نامۆبونێکی چالاك، نامۆییەکی چالاکی و یان بە دەربڕینێکی دی چالاکی نامۆکەر بێت. نامۆبوری بەرهەمی کار لە کار، تەنها لە جیابونەوەو نامۆبوونی خودی چالاکی کاردا کورت ئەبێتەوە.

بەم پێیە چ شتێك دەبێتە هۆی نامۆ بوونی کار؟

یەکەم لەبەر ئەوەی کار سەبارەت بە کرێکار بووە بە رەگەزێکی دەرەکی، واتە نەبەستراوە بە بوونی خودی کرێکارەوە، لە ئەنجامدا لە کاتی کارکردندا نەك هەر خۆی ناسەلمێنێ، بەڵکو خۆی نەفی دەکات.. لەبری خۆشنودی، هەست بە رەنج دەکات.. نەك هەر وزەی جەستەی و زیهنی خۆی ئازادانە پەرەپێنادات، بەڵکو جەستەی خۆی پەك



دەخات و زیهنی خۆی بەرەو لەناوبردن و دەبات. کەوابوو کرێکار تەنها کاتێك لە دەرەوەی فەزای کارە لەخۆی دەگات و کاتێکیش لە فەزای کاردایە، لە دەرەوەی خۆی دەبێت. کاتێك ئاسایشی هەیە کە کار ناکات و کاتێکش کە کار دەکات، هەست بە ئاسایش ناکات. لە ئەنجامدا کارەکەی لە ئەنجامی هەڵبژاردنەوە نیە، بەڵکو بەسەریدا سەپێنراوە. ئەم کارە، **کاری ئیجبارییە**. لەبەرئەوە **پێداویستیەك** جێبەجێ ناکات، بەڵکو ئامێرێکی رووتە بۆ دەستەبەرکردنی ئارەزووگەلێك کە سەبارەت بەو دەرەکین. خەسڵەتی نامۆبوونی کرێکار بە روونی لەو راستیەدا دەبینرێ کە هەر ئەوەندە کە ناچاریەکی فیزیایی یان ناچاریەکی دی لە ئارادا نەبێت، لە کارکردن وەك تاعونێك رادەکات. کاری دەرەکی، کارێك کە مرۆڤ تیایدا خۆی نامۆ دەکات، کارێکە کە بەهۆیەوە خۆی قوربانی دەکات و خۆی بەرەو وێرانی دەبات. دواجار خەسڵەتی دەرەکی کار بۆ کرێکار لەو راستیەدا دەردەکەوێت کە ئەم کارە موڵکی ئەو نیەو موڵکی کەسی دیەو کرێکار نەك موڵکی خۆی بەڵکو موڵکی کارە. دروست وەك دین کە تیایدا چالاکی خۆ بزوێنەری خەیاڵی مرۆیی واتە چالاکی مێشك و دڵی مرۆڤ، سەربەخۆ لە تاکەکەس کاردەکات واتە وەك چالاکی بونەوەرێکی نامۆ ▪ خودایی یان شەیتانی، کاری تێدەکات، چالاکی کرێکاریش چالاکیەکی خۆ بزوێنەر نیە و موڵکی ئەوی دیە. ئەم چالاکیە ئاشکراکەری لە دەستدانی خودێتی خودە.

کەوابوو مرۆڤ (کرێکار) تەنها لە کارکردنە ئاژەڵیەکانی خۆیدا وەك خواردن و نۆشین و بەرهەمهێنانی رەگەز و یان ئەوپەڕی لە جێگەی نیشتەجێبوون و شێوازی جلوبەرگی خۆیدا، ئازادانە رەفتار دەکات و لە کارکردە مرۆییەکانی خۆیدا، لە ئاژەڵ زیاتر نیە. ئەوەی کە ئاژەڵیە، مرۆیی دەکرێت و ئەوەشی مرۆییە ئاژەڵی دەکرێت.

دیارە خواردنو نۆشین و بەرهەمهێنانی رەگەز و شتی لەم بابەتە، کارکردنی بە راستی مرۆڤانەن، بەڵام کاتێك لە چالاکیە مرۆییەکانی دی دادەبڕێن و دەبن بە ئامانجێکی رووت، ئەوا کارکردنێکی ئاژەڵین.

ئێمە تا ئێستا ئیشی نامۆبوونی چالاکی مرۆڤ واتە کارمان لە دوو رویەوە تاوتوێکرد.

*1*)پەیوەندی کرێکار بە بەرهەمی کارەوە وەك شتێکی نامۆ کە دەسەڵاتی بەسەر کرێکاردا هەیە. ئەم پەیوەندیە لە هەمانکاتدا پەیوەندی بەجیهانی هەستپێکراوی دەرەوە، واتە بە شتەکانی سروشتیشەوەیە کە لە شێوەی جیهانێکی نامۆدا لە بەرامبەر کرێکاردا، رادەوەستێ.

*2*)پەیوەندی کار بە کرداری بەرهەمهێنانەوە لە چوارچێوەی پرۆسەی کاردا. ئەم پەیوەندیە، پەیوەندی کرێکارە بە چالاکی خۆیەوە وەك چالاکیەکی نامۆ کە پەیوەست نیە بەوەوە. ئەم چالاکیە، چالاکیەکی سەخت، هێزێکی لاوازکەر، خولقاندنێکی نەزۆك کەرە کە وزەی جەستەیی و زیهنی کرێکار، یان لە راستیدا ژیانی تایبەتی کرێکار –ئاخر ژیان جگە لە چالاکی چی دیە؟– دەکات بە چالاکیەکی دژ بە خۆی، سەربەخۆو ناپەیوەست بەوەوە. ئێمە لێرەدا شایەتی **لەخۆ نامۆبونین** *Self-estangment* کە پێشتر وەك نامۆبوون لە شتەکان بینی بومان.

لایەنێکی سێهەم لە **کاری نامۆبوودا** هەیە کە دەرئەنجامی دولایەنەکەی دیە کە پێشتر تاوتوێمانکرد.

مرۆڤ بونەوەرێکی نەوعیە *Species being* نەك هەر لەبەرئەوەی کە لە تیورەو پراکتیکدا، رەگەزەکان (رەگەزی خۆی و رەگەزەکانی دی) وەك ئۆبژێکتێکی خۆی هەڵدەبژێرێ، بەڵکو –ئەمەش دەربرینێکی دی هەمان بابەتە– لەگەڵ خۆیدا وەك رەگەزێك کە واقعی و زیندووە، واتە لە پلەی



بونەوەرێکی گەردونی و لێرەوە ئازاددا، رەفتار دەکات.

ژیانی رەگەزی، چ ژیانی مرۆیی و چ ژیانی ئاژەڵەکان، لە رووی مادیەوە لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێ کە مرۆڤ (وەك ئاژەڵەکان) لە لای سروشتێکی نائۆرگانیەوە دەژی و لەبەرئەوەش کە مرۆڤ بە بەراورد لەگەڵ ئاژەڵەکاندا گەردونی ترە، ئەوا سنوری ئەو سروشتە نائۆرگانیکەی لە لایەوە دەژی، گەردونی تر دەبێت. وەك چۆن گیاکان، ئاژەڵەکان، بەرد، هەواو روناکی و لەم بابەتانە لە رووی تیوریەوە هەندێکیان وەك بابەتەکانی زانستە سروشتیەکان و هەندێکیان وەك بابەتەکانی هونەر، بەشێك لە هوشیاری مرۆڤ پێك دەهێنن و سروشتی مەعنەوی نائۆرگانیو خۆراکی فکری ئەون کە سەرەتا دەبێ بۆ هەرسکردنی ئامادە بکرێن، لە بواری پراکتیکیشدا بەشێك لە ژیان و چالاکی مرۆڤ دروست دەکەن. مرۆڤ لە روی فیزیاییەوە لە تەنیشت بەرهەمەکانی سروشتەوە دەژی، گەرچی بە شێوەی خواردن، گەرما، و ماڵ و هتد، دەرکەون. گەردونی بوونی مرۆڤ لە پراکتیکدا بە شێوەی ئەو گەردونی بوونە دەردەکەوێت کە سەرجەم سروشت دەکات بە قاڵبێکی نائۆرگانی مرۆڤ، چونکە سروشت هەم 1) ئامێری راستەوخۆی ژیانێتیو هەم 2) مادەو شت و ئامێری چالاکی ژیانێتی. سروشت قاڵبی نائۆرگانی مرۆڤەو ئەمەش تا ئەو جێگەیەی کە خودی سروشتی قاڵبی مرۆڤ نیە. ئەوەی کە دەڵێین مرۆڤ لە تەنیشت سروشتەوە دەژی بە مانای ئەوەیە کە سروشت قاڵبی ئەوەو ئەگەر دەیەوێت نەمرێ، دەبێ بەردەوام پەیوەندی پێوەی هەبێت. بەستنەوەی ژیانی مەعنەوی و مادی مرۆڤ بە سروشتەوە، رێك بە مانای ئەوەیە کە سروشت لەگەڵ خۆیدا پەیوەندی هەیە.. چونکە مرۆڤ خۆی بەشێکە لە سروشت.

کاری نامۆ بوو، بە نامۆکردنی مرۆڤ 1) لە سروشت و 2) لە خودی خۆی واتە لە کارکردنە عەمەلی و چالاکیە زیندوەکانی، **رەگەزی مرۆڤ** لە مرۆڤ نامۆ دەکات. کاری نامۆ بوو ژیانی نەوعی بە ئامێرێك بەرەو ژیانی فەردی دەگۆڕێت. لە چرکەی یەکەمدا ژیانی نەوعی و ژیانی فەردی، نامۆ دەکات و پاشان ژیانی فەردی لە شکڵی موجەرەدی خۆیدا دەکات بە ئامانجی ژیانی نەوعی لە هەمان شێوەی موجەرەدو نامۆدا.

لە راستیدا کار واتە چالاکی زیندو ژیانی بەرهەمهێنان، لە چرکەی یەکەمدا لە حوکمی **هۆکارێکدا** بۆ تێرکردنی پێداویستیەك واتە پێداویستی مانەوەی بونی فیزیای (مرۆڤ) دەردەکەوێت. لەگەڵ ئەمەشدا ژیانی بەرهەمهێنان، ژیانی نەوعیە. ئەم ژیانە، ژیان دروستکەرە. خەسڵەتی گشتی رەگەزەکان، خەسڵەتی نەوعی (مرۆڤ) لە سروشتی چالاکی زیندویدا دەردەکەوێت و چالاکی ئازادو هوشیارانە، خەسڵەتی رەگەزی مرۆڤە. ژیان تەنها وەك ئامێرێك بۆ ژیان دەردەکەوێت.

ئاژەڵ لەگەڵ چالاکی زیندووی خۆیدا بێ هیچ نێوەندێك تێکەڵاو بوە و خۆی لەم چالاکیە جیاناکاتەوە. ئەم چالاکیە بە چالاکی زیندوی ئەو دەژمێرێت. بەڵام مرۆڤ چالاکی زیندوی خۆی، ملکەچی ئیرادەو هوشیاری خۆی دەکات و خاوەنی چالاکیەکی زیندووی هوشیارانەیە. ئەم چالاکیە زیندوە مەبەست و ئامانجێك نیە کە مرۆڤ راستەوخۆ خۆی لەگەڵیدا کردبێت بە یەکێك. چالاکی زیندوی هوشیارانە، مرۆڤ بێ نیوەندێك لە چالاکی زیندوی ئاژەڵ جیادەکاتەوە، هەر ئەمەیە کە مرۆڤ بونەوەرێکی نەوعیە یان بە زمانێکی دی، لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤ بونەوەرێکی نەوعیە، بونەوەرێکی هوشیارە واتە ئەوەی کە ژیانی خۆی بۆ ئەو لە حوکمی ئوبژێکتێکدایە. هەر لەبەر ئەوە، چالاکی ئەو،



چالاکیەکی ئازادە. کاری نامۆ بوو ئەم پەیوەندیە پێچەوانە دەکاتەوە واتە لەبەر ئەوەی مرۆڤ بونەوەرێکی هوشیارە، چالاکی زیندووی خۆی، **بونی زاتی خۆی** ***essenticll*** دەگۆڕێت بە ئامێرێکی روت لە خزمەت **بونیدا**.

مرۆڤ بە خولقاندنی **جیهانی شتەکان**[7] لە رێی چالاکی عەمەلی خۆی و لەو **کارەدا** کە لەسەر سروشتی ئانۆرگانی دەیکات، خۆی وەك بونەوەرێکی نەوعی هوشیار دەسەلمێنێ واتە وەك بونەوەرێك کە لەگەڵ نەوعی خۆیدا وەك بونێکی زاتیو یانی لەگەڵ خۆیدا وەك بونەوەرێکی نەوعی، رووبەڕو دەبێتەوە. بێگومان ئاژەڵەکانیش بەرهەمهێنن. بۆ نمونە هەنگ، سەگی ئاوی و مێروولەکان، هێلانەو ماڵ بۆ خۆیان دروستدەکات، بەڵام ئاژەڵ شتێك بەرهەمدێنێ کە پێویستی خێرای خۆی یان بێچوەکەیەتی. بەرهەمهێنانی ئەوان تاك رەهەندانەیە لە کاتێکدا کە مرۆڤ هەمەلایەنە (و بەربڵاو) بەرهەمدەهێنێ. ئاژەڵەکان لە ژێر ناچاریی راستەوخۆی پێداویتسیە هەستیەکانیاندا دەست بە بەرهەمهێنان دەکەن، لە کاتێکدا کە مرۆڤ سەرجەم سروشت بەرهەم دەهێنێتەوە. بەرهەمی ئاژەڵ راستەوخۆ بەستراوە بە بوونی فیزیاییەوە، لە کاتێکدا مرۆڤ ئازادانە رووبەڕووی بەرهەمەکەی دەبێتەوە. ئاژەڵ بەرهەمەکەی خۆی بە گونجان لەگەڵ پێوەرەکان و پێداویستیەکانی ئەو رەگەزەی کە سەر بەوە، دروست دەکات. لە کاتێکدا مرۆڤ لە توانایدایە بە گونجان لەگەڵ جۆرەکانی دیدا بەرهەم بهێنێ و دەزانێ چۆن لەهەر جێیەکدا پێوەری گونجاو لەگەڵ شتەکاندا، بەکار بهێنێ. لەم روەوە مرۆڤ شتەکانیش بە پێی یاساکانی جوانیش، دروستدەکات.

لێرەوە مرۆڤ تەنها بەکاری خۆی لەسەر جیهانی بەرجەستەیە کە لە چرکەی یەکەمدا خۆی وەك بونەوەرێکی **نەوعی** دەسەلمێنێ. ئەم بەرهەمهێنانە، ژیانی چالاکی نەوعی ئەوە. لە رێگەو بەهۆی ئەم بەرهەمهێنانەوەیە کە سروشت وەك کار و واقعیەتی ئەو دەردەکەوێت. لێرەوە ئوبژێکتی کار، بە بابەتبوونی ژیانی نەوعی مرۆڤە، چونکە (لەم رێگەیەوە) نەك تەنها لە رووی زیهنیەوە واتە لە هوشیاری خۆیدا، بەڵکو لە واقعیەتیشدا چالاکانە خۆی بەرهەمدەهێنێتەوەو لە جیهانێکدا کە بەرهەمیهێناوە، خۆی ئەندێشە دەکات. بەم پێیە کاری نامۆبوو بە جیاکردنەوەی بەرهەمی بەرهەمهێنانی مرۆڤ لە مرۆڤ، لە راستیدا ژیانی نەوعی و بابەتبوونی واقعی خۆی وەك ئەندامێك لە رەگەز (ی مرۆڤ) جیادەکاتەوەو مەزنی ئەو بەسەر ئاژەڵدا هێندە بەرەو لاوازی دەبات کە (تەنانەت) قاڵبی ئانۆرگانی ئەو واتە سروشتیشی لێدەستێنرێ. هەر بەم شێوەیە کاری نامۆبوو بە دابەزاندنی چالاکی خۆبزوێنەرو ئازادی (مرۆڤ) بۆ ئامێرێك، ژیانی نەوعی مرۆڤ دەکات بە ئامێرێك بۆ ژیانی جەستەیی خۆی. ئەو هوشیاریەی مرۆڤ لە نەوعی خۆی هەیەتی، لەم نامۆبونەدا بە جۆرێك دەگۆڕێت کە ژیانی نەوعی بۆ ئەو تەنها وەك ئامێرێکی لێدێ.

لێرەوە کاری نامۆ بوو:

*3*)**بوونی نەوعی مرۆڤ**، چ خەسڵەت و چ تایبەتمەندی نەوعی مەعنەوی مرۆڤ، دەگۆڕێت بۆ بونێکی نامۆو ئامێرێك لە خزمەت ژیانی فەردیدا (و بەمشێوەیەش) مرۆڤ لە قاڵبی خۆی و هەروەها لە سروشتی دەرەکی و زاتی مەعنەوی واتە **بوونی مرۆڤانەی**، نامۆ دەکات.

*4*)دەرئەنجامی راستەوخۆی ئەم واقعیەتە کە مرۆڤ لە بەرهەمی کاری خۆیو لە چالاکی زیندوانەی خۆیو لە بونی نەوعی خۆی نامۆ دەبێت، **نامۆبوونی مرۆڤە لە مرۆڤ**. کاتێ مرۆڤ روبەڕوی خۆی دەبێتەوە، وەك ئەوەی روبەڕوی مرۆڤەکانی دی



بوبێتەوە، ئەوەی پەیوەندیدارە بە پەیوەندی مرۆڤ بە کارو بەرهەمی کارەکەی و بەرهەمی کاری مرۆڤەکانی دیەوە، بڵاودەبێتەوە.

لە راستیدا ئەو مەسەلەیەی کە خەسڵەتی نەوعی مرۆڤ لێی نامۆ بووە، بەو مانایەی کە مرۆڤەکان لە یەکدی و هەریەکەشیان لە خەسڵەتی مرۆڤ، نامۆ بوون.

نامۆبوونی مرۆڤ و لە راستیدا هەر پەیوەندیەك کە مرۆڤ بەخۆیەوە دەیبەستێت، لە چرکەی یەکەمدا لەو پەیوەندیەدا دەردەکەوێت و دەسەلمێ کە بە مرۆڤەکانی دیەوە، دەیبەستێت.

لێرەوە هەموو کەسێك لە چوارچێوەی پەیوەندی کاری نامۆبوودا ئەوی دی لەسەر بناغەی ئەو پێوەرو پەیوەندیانەی کە تیایدا خۆی وەك کرێکارێك دەرك دەکات، رەچاو دەکات.

ئێمە لێکۆڵینەوەکەمان لە واقعیەتێکی ئابوری سیاسیەوە واتە لە نامۆبوونی کرێکارو بەرهەمهێنانیەوە، دەستپێکرد (و) ئەم واقعیەتەشمان لەسەر بناغەی چەمکی **کاری نامۆبوو**، رونکردەوە (و) بە شیکردنەوەی ئەم چەمکە، واقعی ئابوریمان تاوتوێکرد.

هەنوکە دەمانەوێت ببینین چۆن چەمکی کاری نامۆ بوو لە ژیانی واقعیدا ئامادەو دەردەکەوێت.

ئەگەر بەرهەمی کار لە من نامۆیە، ئەگەر ئەم بەرهەمە وەك هێزێکی نامۆ لە بەرامبەر مندا رادەوەستێ، کەوابوو، مولکی چ کەسێکە؟ ئەگەر چالاکی خۆم مولکی من نەبێت، ئەگەر ئەم چالاکیە، چالاکیەکی نامۆو لە روی ناچاریەوە بێت، کەوابوو ئەم چالاکیە مولکی کێیە؟

(مولکی) بونەوەرێکی جیا لەخۆمە.

ئەم بونەوەرە کێیە؟

خواکان؟ ئەڵبەتە لە سەردەمە سەرەتاییەکاندا، بەرهەمی سەرەکی (وەك بیناکردنی پەرستگاکان و لەم بابەتە لە میسر، هند و مەکسیکدا) لە خزمەتی خواکاندا بوو و بەرهەمیش دەبووە مولکی ئەوان، بەڵام خواکان بۆ خودی خۆیان هەرگیز خاوەنی کار نەبوون. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بە **سروشتیش** راستە. شایەتی چ دژایەتیەکین! مرۆڤ هەرچی زیاتر سروشت بەکاری خۆی دەستەمۆ دەکا و موعجیزەکانی پیشەسازی موعجیزەکانی خواکان زیاد لە پێشوو زیادەو ناپێویست، دەبێ زیاتر واز لە لەزەتی بەرهەمهێنان و چێژوەرگرتن لە بەرهەمەکەی بۆ ئەم هێزانە، بهێنێ. ئەو بونەوەرە **نامۆیە** کە کارو بەرهەمی کار مولکی ئەوەو کار لە خزمەتی ئەودایە و قازانجی بەرهەمی کاریش دەچێتە ژێر دەستیەوە، تەنها دەتوانێ خودی مرۆڤ بێت.

ئەگەر بەرهەمی کار مولکی کرێکار نەبێت، ئەگەر ئەم بەرهەمە وەك هێزێکی نامۆ لە بەرامبەریدا سەربڵند دەکاتەوە، تەنها لەو رووەوەیە کە مولکی مرۆڤێکی ترە جگە لە کرێکار. ئەگەر چالاکی کرێکار مایەی ئازارو ئەشکەنجەیەتی، کەوابو دەبێ بۆ ئەوی دی سەرچاوەی لەزەت و خۆشبەختی ژیانی بێت. نە خوداو نە سروشت، بەڵکو تەنها خودی مرۆڤە کە دەتوانێ ئەم هێزە بێگانەیە بێت بەسەر مرۆڤەوە.

دەبێ گریمانەی پێشومان لەیاد بێت کە هێنابومانە ئاراوە: پەیوەندی مرۆڤ بەخۆیەوە تەنها لە رێگەی ئەو پەیوەندیانەوە کە بە کەسانی دیەوە دەیگرێت، بابەتیبوون و فیعلیەت پەیدا دەکات[١٠].
لێرەوە ئەگەر بەرهەمی کاری مرۆڤ واتە کاری بە بابەتبووی ئەو، وەك شتێکی نامۆ، دوژمن و بەهێزی لێدێت کە سەربەخۆیە لە مرۆڤ، ئەوکات هەلومەرجی ئەو سەبارەت بەو کار بە شێوەیەکە کە وەك ئەوەی کەسێکی دی خاوەنی ئەم کارەیە، کەسێك کە سەبارەت بەو بێگانە، دوژمن، بەهێزو سەربەخۆیە. ئەگەر پەیوەندی ئەو بە چالاکی خۆیەوە وەك چالاکیەکی نائازادنە بێت، ئەوکاتە ئەم پەیوەندیە



چالاکیەکە کە لە خزمەت و لەژێر دەسەڵات، ناچاریو کۆنترۆڵی مرۆڤێکی تردایە.

هەموو شێوە لە خۆ نامۆبونێکی مرۆڤ، لەخۆی و لە سروشت، لە شێوەی پەیوەندیەکدا دەردەکەوێت کە ئەو لە نێوان خۆی و سروشت لەگەڵ مرۆڤەکانی دیدا، دەیگرێت. هەر لەبەر ئەمە لەخۆ نامۆبونی دینی بە ناچاری لە پەیوەندی مرۆڤی ئاساییدا بە قەشەوەو لەبەر ئەوەش کە لێرەدا سەروکارمان لەگەل جیهانی زیهنیدا هەیە، لە پەیوەندی مرۆڤی ئاسایی بە نێوان کارێکەوە و لەم بابەتە، دەردەکەوێت. لە جیهانی واقعی عەمەلیدا، لە خۆ نامۆبوون تەنها لە ڕێی پەیوەندی عەمەلی و واقعی بە مرۆڤەکانی دیەوە، دەتوانێ دەربکەوێت. ئەو نێوانکارەی لە ڕێگەیەوە نامۆبوون سیمای خۆی پیشاندەدات، خۆی هۆکارێکی **عەمەلیە**. لێرەوە مرۆڤ بەهۆی کاری نامۆ بوەوە نەک هەر پەیوەندی خۆی بە شتەکان و ئیشی بەرهەمهێنانەوە لە شکڵی پەیوەندی بە مرۆڤە نامۆکان و ڕوبەڕوی ئەو مرۆڤانەوە، دروست دەکات، بەڵکو پەیوەندیەکیش دروست دەکات کە تیایدا مرۆڤەکانی دی لە بەرامبەر بەرهەمهێنان و بەرهەمی ئەودا، سەربڵند دەکەنەوە.. پەیوەندیەك کە خۆشی تیایدا لە بەرامبەر ئەم مرۆڤانەدا دادەنێ. مرۆڤ وەك چۆن بەرهەمهێنانی خۆی لە شکڵی لە دەستدانی واقعیەت و سزادانی خۆی و بەرهەمەکەشی وەك زیان واتە وەك بەرهەمێك کە موڵکی ئەو نیە، دروست دەکات، لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی مرۆڤێك کە بەرهەم ناهێنێت بەسەر بەرهەمهێنان و بەرهەمەکەیدا، دروست دەکات. مرۆڤ وەك چۆن چالاکی خۆی لەخۆی نامۆ دەکات، چالاکیەکەی بە بێگانەیەك دەبەخشێ کە موڵکی ئەو نیە.

تا ئێستا ئەم پەیوەندیەمان تەنها لە ڕوانگەی کرێکارەوە تاوتوێکرد، دواتر ئەم مەسەلەیە لە ڕوانگەی ئەو کەسەوە تاوتوێ دەکەین کە کار ناکات.

کەوابوو کرێکار بەهۆی **کاری نامۆ بووەوە** پەیوەندی کەسێك بەم کارە بەرهەمدێنێ کە سەبارەت بەو بێگانەیە و لە دەرەوەی ئەو ڕاوەستاوە. پەیوەندی کرێکار بە کارەوە، پەیوەندی سەرمایەدار (یان هەر ناوێکی کە بە خاوەن کار دەدرێ) بەو (کارە) دروست دەکات. لێرەوە **موڵکایەتی تایبەتی**، بەرهەم و دەرئەنجامی ناچاری کاری نامۆ بووە و (هەروەها بەرهەم و دەرئەنجامی) پەیوەندی دەرەکی کرێکارە بە سروشت و خۆیەوە.

بەم شێوەیە **موڵکایەتی تایبەت** لەسەر بناغەی شیکردنەوەی چەمکی **کاری نامۆبوو** واتە **مرۆڤی نامۆ بوو**، کاری نامۆ بوو، ژیانی نامۆ بوو و مرۆڤی (لەخۆ) نامۆ، هەڵدەهێنجێنرێ.

ڕاستە کە ئێمە لە جوڵەی **موڵکایەتی تایبەتیەوە** چەمکی **کاری نامۆ بوو** (یان **ژیانی نامۆ بوو**) مان لە ئابوری سیاسیەوە هەڵهێنجا، بەڵام بە شیکردنەوەی ئەم چەمکە ڕوندەبێتەوە کە ئەگەرچی پێدەچێت کە موڵکایەتی تایبەتی بنەماو هۆی کاری نامۆ بوو بێت، بەڵام لە ڕاستیدا دەرئەنجامێتی.. وەك چۆن خواکان لە بنەڕەتدا هۆی پەشێوی زیهنی مرۆڤەکان نین بەڵکو دەرئەنجامی ئەو پەشێویەن. ئەم پەیوەندیە پاشان دولایەنە دەبێت.

تەنها لە لوتکەی کۆتایی پەرەسەندنی موڵکایەتی تایبەتیدایە، نهێنیەکەی واتە ئەوەی لە لایەك بەرهەمی کاری نامۆ بووەو لە لایەکی دی هۆکارێکە کە بەهۆیەوە، کاری خۆی نامۆ دەکات یان بە دەربڕینێك **بە واقعیبوونی ئەم نامۆ بوونە**، ئاشکرا دەبێت.

ئەم تەفسیرە یەکسەر تیشکێکی ڕوناک دەخاتە سەر زوربەی ئەو وتوێژانەی تا ئێستا بێچارەسەر ماونەتەوە.



**1)ئابوری سیاسی کار بە تەنها سەرچاوەی واقعی بەرهەمهێنان دەزانێت بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ شتێك بۆ کاری تایبەت ناکات و هەموو شتەکان بە مولکایەتی تایبەتی دەدا. پرۆدۆن بۆ کارو دژی مولکایەتی تایبەتی، هەڵوێستی وەرگرتووە*. بەڵام بینیمان کە ئەم دژایەتیە روکەشە، دژایەتی کاری نامۆ بووە لەگەڵ خۆیداو ئابوری سیاسی تەنها یاساکانی کاری نامۆ بووی نوسیوەتەوە.**

هەروەها تێگەیشتین کە **کرێ** و **مولکایەتی** تایبەتی یەکسانن چونکە بەرهەم وەك ئوبژێکتی کار (بەشی) خۆی دەدات و لە دەرئەنجامدا کرێ هیچ نیە جگە لە دەرئەنجامی ناچاری نامۆ بوونی کار. دواجار لە کرێی کاردا، کار وەك ئامانجێك بۆ خۆی دەرناکەوێت، بەڵکو لە خزمەتی کرێدایە. پاشتر ئەم خاڵە زیاتر روندەکەینەوەو لێرەدا تەنها هەندێك لە دەرئەنجامەکان دەهێنینەوە[9].

زیادبوونی سەپێنراوی کرێکان (بەدەر لە هەندێك مەسەلەی وەك ئەو راستیەی کە تەنها "لەژێر هەلومەرجی" ناچاریدایە کە کرێی زیاتر کە پێچەوانەی رێسایە، دەدرێت) جگە لە **بەخشینێکی باشتر بە کۆیلەکان** نیەو هەلومەرج و پایەی مرۆیی بۆ کرێکاران یان بۆ کار بەدیاری ناهێنێت.

لە راستیدا تەنانەت **یەکسانی کرێکان** کە پرۆدۆن خواستارێتی، تەنها پەیوەندی کرێکاری ئەمڕۆیی بەکارەکەیەوە دەگۆرێت بە پەیوەندی هەموو مرۆڤەکان بەکارەوە. کۆمەڵگا لە حاڵەتێکی وادا وەك سەرمایەدارێکی تەجریدی، دەرك دەکرێت.

کرێ دەرئەنجامی راستەوخۆی کاری نامۆ بووەو کاری نامۆ بوو هۆی سەرەکی مولکایەتی تایبەتیە. کەوتنی یەکێکیان بە ناچار کەوتنی ئەوی دیان بەدوادا دێت.

2)لە پەیوەندی کاری نامۆ بووەوە بە مولکایەتی تایبەتیەوە، وا دەردەکەوێت کە رزگاری کۆمەڵگا لە مولکایەتی تایبەتی و کۆیلەیەتی، **شکڵی سیاسی رزگاری کرێکاران** بەخۆیەوە دەگرێت، نەك بەو مانایەی کە تەنها مەبەست رزگاری کرێکارانە، بەڵکو بەو مانایەی کە رزگاری کرێکاران، رزگاری سەرجەم مرۆڤەکانە، چونکە سەرجەم کۆیلەیەتی مرۆڤ دەرئەنجامی پەیوەندی کرێکارە بە بەرهەمهێنانەوەو هەموو شێوەیەك پەیوەندی کۆیلەیەتیش جگە لە برین و چاککردن و دەرئەنجامی ئەم پەیوەندیە، هیچی دی نیە.

وەك چۆن بە **شیکردنەوە** چەمکی **مولکایەتی تایبەتیمان** لە چەمکی **کاری نامۆ بووەوە** هەڵهێنجا، ئەنوکە دەتوانین هەموو **وتەزایەکی** ئابوری سیاسی بە یارمەتی ئەم دو چەمکە رون بکەینەوەو لەهەر وتەزایەکدا بۆ نمونە بازرگانی، ململانێ، سەرمایە، پارە،.. ئەم رەگەزە سەرەتاییانە سەرلەنوێ بدۆزینەوە.

بەر لە باسکردنی ئەم خاڵە، هەوڵدەدەین بۆ ئەوەی دوو مەسەلە چارەسەر بکەین.

1)پێناسی **ماهیەتی مولکایەتی تایبەتی** بە شێوەیەك کە دەرئەنجامی کاری نامۆ بوەو هەروەها پەیوەندی بە **مرۆڤی راستەقینە** و **مولکایەتی کۆمەڵایەتیەوە.**

2)ئێمە **نامۆ بوونی کاری نامۆ بوونیمان** [illegible] واقعیەتێکی بەڵگەنەویست قبوڵ کردو هەر ئەم واقعیەتە بەڵگەنەویستەشمان شیکردەوە. ئەنوکە دەبێ ئەم پرسیارە بهێنینە ئاراوە کە [illegible] **چۆن کاری خۆی نامۆ** دەکات؟ ئەم نامۆ بونە چۆن رۆچۆتە ماهیەتی پەرەسەندنی مرۆڤەوە؟ ئێمە بە گۆرینی شکڵی ئەم پرسیار[illegible] کە رەگی مولکای[illegible]ی تایبەتی چیە بەم پرسیارە کە **پەیوەندی کاری نامۆ بوو** بە رەوتی پەرەسەندنی مرۆڤەوە چیە، بەشیکی زۆر لە رێگەکەمان بریوە. چونکە ئەو کاتەی باسی **مولکایەتی تایبەتی** دەکرێ، روبەروی شتێکین کە



سەبارەت بە مرۆڤ دەرەکیە، بەڵام کاتێك باسی کار دەکرێ راستەوخۆ سەروکارمان لەگەڵ مرۆڤدایە. ئەم شێوە تازەیەی هێنانە ئارای مەسەلەکە، رێگەچارەی خۆشی لەگەڵدایە. سەبارەت بە 1) ماهیەتی مولکایەتی تایبەتی و پەیوەندی بە مولکایەتی راستەقینەی مرۆڤەوە.

کاری نامۆ بوو دابەش دەبێ بۆ دوو رەگەز کە بە شێوەیەکی دوولایەنە یەکدی دەستنیشان دەکەن یان بە دەربڕینێکی دی دەرکەوتی جیاوازیی یەك پەیوەندین. مولکداری وەك **نامۆبوون** و **جیابونەوە** لە (بەرهەم) دەردەکەوێت و **نامۆبونیش** وەك مولکداری؛ **نامۆبوون** پیشەکیەکی واقعیە بۆ قبولکردن لە کۆمەلگادا.[10]

ئێمە لایەنێك **لە کاری نامۆبوو** واتە پەیوەندی بە **خودی کرێکارەوە** یان بە دەربڕینێکی دی **پەیوەندی بەخۆیەوەمان** شیکردەوەو **پەیوەندیەکانی مولکایەتی جگە لە کرێکار بە کرێکارو کارەوە** وەك دەرئەنجام و بەرهەمی ناچاری ئەو پەیوەندیەمان هەڵهێنجا. **مولکایەتی تایبەتی** وەك دەرکەوتی مادی و کۆکراوەی کاری نامۆ بوو، دوو پەیوەندی دەگرێتەوە: **پەیوەندی کرێکار بەکار و بە بەرهەمی کاری خۆیەوە جگە لە کرێکارو پەیوەندی بە کرێکارو بەرهەمی کارەکەیەوە.**

بینیمان کە لە پەیوەندی بە کرێکارەوە، کە بە کارەکەی **سروشت دەکاتە مولکی خۆی**، ئەم موڵك گرتنە لە شێوەی نامۆبوون، چالاکی خۆ بزوێنەری وەك چالاکی بۆ ئەوی دی و مولکی ئەوی دی، هێزی حەیانی ئەو بە شێوەی قوربانیکردنی ژیان؛ بەرهەمهێنانی بەرهەم لە دەستدان و (سپاردنی بە) هێز و **کەسێکی بێگانە**، دەردەکەوێت. هەنوکە دەبێت پەیوەندی ئەم کەسە کە بە کرێکارو **کاری نامۆ بووەوەیە**، بە کرێکار، کارو بەرهەمی کارەوە، تاوتوێ بکەین.

سەرەتا پێویستە بڵێین کە ئەوەی بۆ کرێکار وەك **چالاکی نامۆ** دەردەکەوێت، بۆ جگە لە کرێکار، وەك **هەلومەرجی نامۆبوون** دەردەکەوێت.

دوهەم: دیدی واقعی و کرداری (عملی) کرێکار بۆ بەرهەمهێنان و کار (وەك روانگەیەك) لای، جگە لە کرێکار وەك دیدێکی تیۆری دەردەکەوێت.

سێهەم: جگە لە کرێکار ئەوەی کرێکار دژ بە خۆی ئەنجامیدەدا، بە دژی ئەو ئەنجامیدەدا، بەلام ئەوەی کە خۆی دژی کرێکار ئەنجامی دەدا، بە دژی خۆی رەوا نازانێت.

ئێستا ئەم سێ پەیوەندیە بە وردی دەخەینە ژێر لێکۆڵینەوە.

(یەکەم دەستنوس هەر لێرەدا بە ناتەواوی، دەبڕێت).

**یاداشتەکان:**

*1)کاری نامۆ بوو یان بە زمانی ئەڵمانی Die Entfremdete Arbeit.*

*2–بەرجەستەبوون یان بە بابەتبوو. یان بە زمانی ئەڵمانی Vergegen stcindlichvng پرۆسەی "سەربووردەی" شتێك.*

*3)لە دەستدانی واقعیەت یان بە زمانی ئەڵمانی Entwirklichung رەنگە وەرگێڕانی باشتر "نزمبوونەوەی بەها" (deralvation) بێت. مارکس لەسەر شێوازی هیگل Verwirklichvng بە مانای بە واقیعبوون وەك دژی Entwriklichvng بە مانای لەدەستدانی واقعیەت، بەکاردەهێنێ. لێرەدا بە واقیعەت بوون بە مانای بەدیهاتن، ئەنجامدان و دروستکردنی شتێکی واقعیە. مارکس دەڵێ کە بەدیهاتنی کار دەگۆڕێ بۆ دژی خۆی.*

*4)نامۆبوون (لەخۆ نامۆبوون) بە زمانی ئەڵمانی Entausserung.*

*5)هەستپێکراو بە زمانی ئەڵمانی Sinnlich.*



6)بونەوەری نەوعی بە زمـانی ئـەڵمانی Gattvngswessn زاراوەیەکە کە فویرباخ بـەکاری دەهێنـێ و مەبەسـتی رەگـەزی مرۆڤـە (Guttung) خەسـڵەتی نـەوعی (وەك بونـەوەری نـەوعی) Guttungyeesen: خەسـڵەتی زاتـی مـرۆڤ. ئـەم پەرەگرافانـەی خـوارەوە کـە لـە کتێبـی "جەوهـەری مەسـیحیەت"ی فویرباخـەوە وەرگـێراوە، رەنگە یارمەتی خوێنەر بدات بۆ تێگەیشتن لـە زەمینـەی ئایدیۆلۆژی ئەم بەشە لە بیری مارکس و هەروەها ئـەوەی کە چۆن مارکس هاوکات لەگـەڵ وەرگرتنـی چەمکـەکانی فویرباخ، هیگڵ و ئابوریزانانی سیاسی، ناوەڕۆکی تازەیان پێدەبەخشێ.

"جیاوازی چارەنوسسـازی نێـوان مـرۆڤ و ئاژەڵـەکان چیـە؟. هوشیاری! بـەڵام هوشیاری بـە مانـای راشـکاو. چونکـە نـاتوانین ئـەو هوشـیاریەی کـە لـە ئـەنجامی هەستکردن بە خۆی وەك تـاکێك دەردەکەوێت، یان لـەو جیاکردنـەوەدا کـە لەسـەر بناغـەی هەستەکان فۆرمەڵـە دەبێت، یان لە تێگەیشتن و تەنانەت هەڵسەنگاندنی شتە دەرەکیەکان لەسـەر بناغـەی ئامـاژە هەسـتپێکراوەکان، دەردەکەوێت، لە ئاژەڵدا لەبەرچاو نەگرین. هوشـیاری بە مانای راشکاو کاتێك لە بونەوەرێکدا ئامادەیە کە بۆ ئـەو رەگـەزو خەسـڵەتی زاتـی خـۆی وەك ئوبژێکتێکـی بیرکردنەوە بێت. لە راسـتیدا ئـاژەڵ هوشیارە بـە بوونـی خۆی وەك تاکێك و بەم شـێوەیەش هەستێکی بـە بوونـی خۆی هەیە وەك ناوەندی گشتی هەسـتەکان.. بـەڵام نـەك وەك رەگـەزێك.. لـە ژیانی عەمـەلیدا، ئێمـە سـەروکارمان لەگەڵ تاکەکاندایە و لەزانستدا لەگەڵ رەگەزەکان.. بەڵام تەنها ئەو بونەوەرەی کە رەگەزو خەسڵەتەکەی ئوبژێکتی بیرکردنەوەیە، دەتوانێ خەسڵەتی زاتی شتەکانی دی یان بونەوەرەکانی دی بکات بە ئوبژێکتی بیرکردنەوە. ئـاژەڵ تەنها ژیانێکی سادەی هەیە؛ مرۆڤ ژیانێکی دولایەنە.. لە ئاژەڵدا ژیانی دەرونی هەمان ژیانی دەرەکیە. بـەڵام هـەم ژیانی دەرونی هەیەو هەم ژیانی دەرەکی. ژیـانی دەرونـی مرۆڤ، ژیانێکـە کـە پـەیوەندی بـە رەگەزەکەیەوە هەیـە واتـە بـە خەسـڵەتی گشتیەوە کەلـە خەسـڵەتی فـەردی جیابۆتـەوە.. ئـاژەڵ ناتوانـێ بـێ بوونـی تـاکێکی تـر کـە سـەبارەت بـەو دەرەکیـە، کـارکردنێکی هـەبێت کـە پەیوەندی بە رەگەزەکەیەوە هەیە، بەڵام مرۆڤ دەتوانـێ جیا لە تاکێتیەکی تـر، کارکردنـەکانی بیرکردنـەوەو قسـە ئـەنجام بدات کـە بـە راشـکاوی دەلالـەت لـە بوونـی ئـەم پەیوەندیـە بـە رەگـەزی مرۆڤـەوە دەکـات.. لـە راسـتیدا مرۆڤ لە هـەمان کـاتدا هـەم "مـن"ە و هـەم "تـۆ": ئـەو دەتوانـێ خـۆی لـە جێـی کەسـێکی دی دابنـێ و لەبـەر ئەمەش ئەوەی بۆ ئەو بە رەگـەز، خەسڵەتی زاتـی، نـەك هـەر تـاکێتی دەژمـێرێت، ئوبژێکتـی بیرکردنەوەیـە. ئوبژێکتەکـە خۆبەخۆو بـە زەرورەت بکـەرێك پەیوەسـت بێت پێوەی، شتێك جگە لـەم بکـەرە نیـە واتـە سروشـتی بابـەتی.. "لێرەوە پـەیوەندی خـۆی بـە زەویـەوە"، لـە هـەمان کـاتدا پـەیوەندی زەوی بـە خـۆی و بـە ماهیـەتی خۆیەوە دەبێت، چونکە رادەو توندی روناکیـەك کـە خـۆر وەك ئوبژێکتـی زەوی بەدەسـتی دێنـێ، یەکسـانە بـە ماوەیـەك کـە ماهیـەتی تایبـەتی زەوی دەستنیشـان دەکات.. لەبەر ئـەوە مرۆڤ بـە لێکۆڵینـەوەی ئوبژێکت، ئاشنایەتی لەگەڵ خۆیدا پەیدا دەکات.. هێزی ئوبژێکت بەسەر ئەودا هەمان هێزی خەسڵەتی خۆیەتی. (جەوهەری مەسیحیەت، وەرگێڕانی لـە چاپی دوهـەمی بـە زمـانی ئەڵمانی بە هۆی ماریان ئیڤانوس، لـەندەن 1854، لاپـەڕە 1–5).

7)زاراوەی Se yehstundich ی مـارکس دەکـ... بـە "بابەتی" وەریگێڕین بەڵام ئەوەی کە مەبەسـ... سیەتێکە کە پـەیوەندی بـە Gegenstand یـە بـە مانـای "بابـەت" هەیـە، ئێمـە پێمـان وایـە کـە باشـترین وشـە بـۆ yegenstandiche welt جیـهانی شـتەکان (جیـهانی ئوبژێکتەکان)ە.

8)بۆ تێگەیشتن لە مانـای wirklich gegenstunlich لای مارکس بگەڕێینەوە بـۆ یاداشتی پێشـوو. وەك چۆن کـە gegenstundlich پەیوەسـتە بـە Gegenstund،



Wirklich پەیوەستە بە wirkeh بــە مانــای کــارکردن. وەرگێڕانی باشتری ئەم رستەیە رەنگە بەم شێوەیە بێت. "پەیوەندی مرۆڤ بە خۆیەوە تەنها بە شێوەی پەیوەندی بە بابەتەکان و کارەوە دەبێت".

9)ئەگەر بە بیرمــان بێتــەوە کە لــە زاراوە تەکنیکیــەکانی هیگلیدا" وەك یەکی (این همانی) لە بەرامبەر "یەکێتی"دا رادەوەستێ، رەنگــە ئــەم رستــە ئــاڵۆزە تــا رادەیــەك رون بێتەوە. پێدەچــێ مەبەستی مــارکس لــەم رستەیە ئــەوە بێت کە یەکێتی دژەکــان لــە نێوان کرێکــان و موڵکایەتی تایبەتیدایــە چونکــە کرێکــان دەرئــەنجامی موڵکایــەتی تایبەتین و موڵکایەتی تایبــەتیش دەرئــەنجامی سیستمی کرێ گرتەیە. لەم پرۆسەیەدا کار تەنها دەوری ئێوانکارێك دەبینێ. کرێکان و موڵکایەتی جەمسەرگەلێکی واقعین.

10)مــارکس نــامۆبوون بــە die Wuher Eintrgerung ناودەنێ کە ماناکــەی "بەشێکی راستەقینەی کۆمەڵگای بوون"ە. پێدەچێ مانای ئەم رستەیە لە دەستنوسـەکاندا ئەوەیە کــە لــە خــۆ نــامۆبوون کلیلی چونــە ژوورەوە بــۆ کۆمەڵگایە.

*ئەم بەشە فەسڵێکە لــە وتارەکــانی دەستنووســەکان کــە لەم کتێبەی خوارەوە، وەرگیراوە:

کارل مارکس: دست نوشتەهای اقتصادی و فلسفی 1844.

ت: حسن مرتضوی: تهران: اگاه چاپ اول 1377.

# وێستگەکانی سەردەم






- سەرهەڵدان و ڕووخانی سیستمی کۆمۆنیزم
- شەڕو زیندانی و ئەزموونی نووسین
- دیالۆگێک لەگەڵ ئەناتۆلی ڕیباکۆڤ دا
- شانۆی ئینتیم
- سێکسواڵیتی لەنێوان مەرگ و ژیاندا








# ترس و تۆقاندنی ستالینیزم..

# سەرچاوەکەی لینینیزمی دایکە

## "سەرهەڵدان و روخانی سیستمی کۆمۆنیزم لە روسیا"

■ جۆرج تەرابیشی

● و. لە عەرەبییەوە: بڕوا عەلادین

لەگەڵ داڕمانی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی **1991**دا سیستمی کۆمۆنیزم لە بابەتێکی ئایدیۆلۆژیەوە گۆڕا بۆ بابەتی زانستی مێژوو. قسەیەکی باو هەیە کە دەڵێت: مێژوو رەحم بە کەس ناکات، بەڵام زانستی مێژوویش لەوە دوورترە رەحم بە مێژوو خۆیشی بکات. یەکەم ئارەزووی زانستی مێژوو ئارکیۆلۆژیایە. هەروەها هیچ شتێك نیە ببێتە بەربەست لە بەردەم هەڵکۆڵینەکانیدا -کە چین لە دوای چین بەداری لێکدانەوەی قوڵتردا دەگەڕێ- تەنانەت گەر حورمەتی مردووانیش بێ، هەروەها سڵ لە هیچ تابۆیەك ناکاتەوە گەر تابۆکە گۆڕهەڵدانەوەی مردووەکانیش بێ. بەر لە روخانی سیستەمی کۆمۆنیزم، زانستی مێژووی سۆڤیەتی تا چەندە پێی بکرایە هەوڵی دەدا حورمەتی گۆڕەکەی (لینین) بپارێزێ.

بەلام لەگەڵ روخانی سیستمەکەو لە کۆتاییەکانی **1991**دا دوا بەربەست روخاو جۆرێك کودەتای کۆپەرنیکی بە ئاراستەی پشکنین و لێکدانەوە روویدا، زۆر لە لێکۆڵینەوەکانی پێشو، ستالینیزم و بێرژنیڤیزمیان بە لادەر لە بنەچە پاك و بێگوناهەکە (لینینیزم) لە قەڵەم دەداو، خرۆشۆفیزم و گۆرباتشۆفیزمیان وەکو کۆمەڵێك هەوڵی شکستخواردوو خوێندەوە کە ئامادجیان گەڕانەوە بوو بۆ ئەو بنەچە پاك و بێگوناهە.

تایبەتمەندێتی (مارك فرۆ)یش لە کتێبە تازەکەیدا -کە خۆی یەکێکە لە دیارترین مێژوونوسەکای شۆڕشی **1917** ئەوەیە کە خەریکی ئارکیۆلۆژیایەکی مێژوویە بۆ ئەفسانەی ئەو پاکی و پێگوناهیەی سەرەتا.

ئەو دەڵێت: ئەگەر گوناهبارێك هەبێ تەنها (لینین) خۆیەتی، بەدوایشیا تەواوی ئەو بەلشەفیانەی راستەوخۆ لە دوای لینینەوە لە ریزی پێشەوەدا بوون. ستالینیش جگە لە جێبەجێکەری وەسیەتێك زیاتر نەبوو. راستە لە سایەی ستالیندا

Marc Ferro

Naissance et effondrement du régime communiste en Russie



Unité des soviets
Apparatchiks et bureaucratisation
Caractéristiques du régime soviétique
Effets pervers de l'éducation
Gorbatchev et la « nouvelle pensée »
L'implosion du système

گونامەکە بوو بە تاوانێکی ترسناک و تۆقێنەر، بەلام ستالین تووڕێکی زەمراوی دانسقەو کوڕێکی حەرام نەبوو: ئەو کوڕێکی شەرعی ئەو سیستمە بوو کە بەرهەمی هێنا. راستە لە رەفتارەکانی پاشتریدا وا دەرکەوت کە تەنها مەسخێکەو هیچی تر، بەلام مەسخبوونی شتێك نەبوو وەریگرتبێت، بەلکو هەر لە لەدایکبوونیەوە قەدەری بوو. چونکە سیستەمی بەلشەفیزم بەو شێوەیەی خۆی دامەزراندبوو لەوە زیاتری پێنەبوو (تەنها ئەو مەسخانەی بەرهەم هێنا). تا چەند لە وەسفکردنیشدا دلرەق بین ئەمە رێگەی ئەوەمان لێناگرێ کە بلێین میراتە مەسخنامێزەکەی ستالین سەر بەو خاك و خۆڵەیە کە تێیدا رواوە: ئەوەی پێیدەوترا (شۆڕشی بەلشەفیزم). بەلام (مارك فرۆ) ئەمەی قبوڵ نییە. ئەو دەڵێت بەلشەفیەکان لە **1905** و **1917**دا شۆڕشی گەلیان هەڵنەگیرسان، بەلکو دەستیان بە سەردا گرت. گەر لەبەر دلرەقیش نەبوایە دەیگوت: دزییان.

ئەم پرۆسەی دزینەش (دزینی شۆڕش) لە هەشت مانگدا تەواو بوو: لە نێوان **27**ی فێبریوەری **1917** (یەکەم رۆژی شۆڕشی روسی کە قەیسەری ناچار کرد مل بدات و بکشێتە دواوە)و نێوانی **25** ی ئۆکتۆبەری **1917** (رۆژی دەسەلاتگرتنە دەستی بەلشەفیەکان). ئاشکرایە کە بەلشەفیەکان، بە شۆڕش نامۆ نەبوون، بەلکو بە پێچەوانەوە ئەو بە ئاسانی دەسەلاتگرتنە دەستەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەمان لە ناوەوە کۆنترۆلی شۆڕشیان کرد نەوەکو لە دەرەوە. بەلشەفیەکان ئەو بەشەی شۆڕش بوون کە پاشتر بوو بە گشت. هەر ئەم پرۆسەیەش (پرۆسەی بە گشت بوونی بەش) بوو بە میکرۆبی دلخوران و داڕزانی سیستەمی کۆمۆنیزم لە یەکەم رۆژی دامەزراندنیەوە تاوەکو **1991**.

ئەو دروشمەی لە شۆڕشی فێبریوەری **1917**دا بەرزیان کردەوەو بریتی بوو لە: (هەموو دەسەلاتەکان بۆ شوراکان). بەلام لە سەرەتای ئۆکتۆبەری **1917**دا دروشمە عەمەلیەکەیان بوو بە: (هەموو دەسەلاتی ناو شوراکان بۆ بەلشەفیەکان). دەکرێ ئەم گۆڕانە لە دروشمی (بە شوراکردن)ەوە بۆ دروشمی (بە بەلشەفیکردن) بە زمانی ژمارەش بخوێنرێتەوە. لە کۆنگرەی یەکەمی شوراکاندا – شوراکان ئەو فۆرمی رێکخستنە بوون کە شۆڕشی روسی بۆ خۆی داهێنا– کە لە یۆنیۆی **1917**دا بەسترا،

بەلشەفیەکان خاوەنی تەنها 13٪ی دەنگەکان بوون. لە کۆنگرەی دووەمیشدا کە لە ئۆکتۆبەری 1917 بەسترا، بوون بە خاوەنی 45٪ی دەنگەکان. لە کۆنگرەی سێیەمیشدا کە ساڵی 1918 بەسترا، ژمارەی بەلشەفیەکان بوو بە (434) نوێنەر لە کۆی (710) نوێنەر، واتە 61٪ی دەنگەکان. سەرەڕای ئەوەی لەو کاتەدا هێشتا شوراکان ملکەچی فرەدەنگی و دیموکراسی بوون، بەڵام ئارەزووی باڵادەستی بەلشەفیەکان ڕێگەی بۆ بەلشەفیەکان خۆشکرد بەسەر لیژنەی جێبەجێ کردنی شوراکاندا زاڵبن، ئەمەش بەهۆی زیادبوونی ژمارەیان لە ئەنجومەنە گشتیەکاندا. ئەگەر لە کۆنگرەی یەکەمدا 61٪ی دەنگەکانیان هێنا، ئەوا ژمارەی نوێنەرەکانیان لە لیژنەی جێبەجێکردندا بەرز بۆوە بۆ 83٪. لە 1919دا بەرزبۆوە بۆ 86٪. بەر لەوەی لە سەرەتای 1922دا بۆ دواجار حیزب بە تەنها کۆنترۆڵی دەسەڵات بکات، ڕێژەی نوێنەرایەتی بەلشەفیەکان لە لیژنەی جێبەجێکردنی شوراکاندا 80٪ کەمتر نەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە دوا هەڵبژاردنی دیموکراتیانەدا کە ساڵی 1918 ئەنجامدرا ڕێژەی نوێنەرەکانیان لە کۆمەڵەی دامەزراندندا تەنها 25٪ بوو. هاوشانی پرۆسەی بە بەلشەفیکردن لە ناو شوراکان و سەندیکا و سوپادا، لەناو حیزبی بەلشەفی خۆیدا گۆڕانێك بەرەو دیسپۆتیزم ڕوویدا. تاوەکو سەرهەڵدانی شۆڕشی فێبروەری 1917 حیزب باڵە جیاجیاکانی ناوخۆی دەپاراست. دوو دوا هێڵیش کە لەو قۆناغەدا بەریەك کەوتن، هێڵی (کامینیف) و دژە هێڵی (لینین) بوون. ناکۆکیەکەشیان لەسەر ڕۆڵی حیزب بوو لە شوراکاندا. کامینیف وەك پەرلەمانی دیموکراسی لە شوراکانی دەڕوانی و باوەڕی وابوو کە قبوڵکردنی بنەماکانی گەمەی دیموکراسی ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی بەلشەفیەکان لە حیزبی کەمینەوە ببنە حیزبی زۆرینە. لە بەرامبەریشدا لنینین پێی وابوو حیزب تا چەندە کەمینەش بێت دەبێ ئیرادەی خۆی بەسەر شوراکاندا بسەپێنێ تا بە دەسەڵات دەگات. بەم شێوەیە لینین دەسەڵاتی کۆنفرانسی شوراکان و دەسەڵاتی شوراکانی پترۆگرادی بەزاند کە ترۆتسکی خۆی سەرۆکایەتی دەکرد تاوەکو لە 25ی ئۆکتۆبەردا بەناوی لیژنەی سەربازی شۆڕشگێڕی ئەو شورایەوە بڕیارێك دەربکات دەربارەی دامەزراندنی حکومەتێکی کاتی. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو خۆی سەرۆکی ئەو لیژنە سەربازییە شۆڕشگێڕانەیە نەبوو، بەناوییەوە هەموو ئەو مەراسیمانەی ئیمزا کرد کە دەسەڵاتی بە بەلشەفیەکان بەخشی. سەرۆکی هەڵبژێرراوی ئەو لیژنەیەش کە سۆشیالیستی شۆشگێڕی چەپڕەو (لازیمیر) بوو تەنها سێبەرێك بوو هیچی تر. لە نێوان 20ی ئۆکتۆبەرو 2ی نۆڤەمبەردا 58 جار ناوی لە بەیانە ڕەسمییەکاندا هاتووە، لە نێوان 2 و 15 ی نۆڤەمبەردا 8 جار ناوی هاتووە، ئیدی لە پاش ئەوەوە تەنیا یەکجار ناوی هاتووە. بەڵام ئەو وێنە فۆتۆگرافیەی لیژنەکە کە بۆ یادگاری گیراوە هەموو ئەندامە مێژووییەکان وەکو ترۆتسکی و سفردلۆف و بودفویسکی تێدایە تەنها لازیمیر نەبێت کەوا دیارە لەگەڵ زۆریەی هاوڕێکانیدا چوونە زبڵدانی مێژووەوە.

لە راستیدا ئەو ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕانەیە لە 25ی ئۆکتۆبەری 1917دا حیزب سەرۆکایەتی کرد هیچ نەبوو جگە لە رەتکردنەوەی شوراکان لە دەسەڵات و بەخشینی بە نوێنەرانی گەل کە هەموویان بەلشەفی بوون. یەکەم بڕیارێکیش کە ئەو دەسەڵاتە تازەیە دای، قەدەغەکردنی ئەو ڕۆژنامانە بوو کە دژی دەسەڵاتی شوراکان بوو؛ هەروەها لابردنی ئەو کۆمەڵەی دامەزراندنەی ڕێژەی بەلشەفیەکان تێیدا چواریەکی بوو، وە دامەزراندنی دەزگایەکی پۆلیسی نهێنی بەناوی (تشیکا)وە دامەزراندنی سفردلوف بە سەرۆکی لیژنەی سەربازی شۆڕشگێڕان و بوونی لینین بە سەرۆکی حکومەت. یەکێك لەو کارە سەرەکیانەی حکومەتی نوێنەرانی گەل پێی هەستا لە ناوبردنی هەموو ئەو شورایانە بوو کە لە ناویاندا بەلشەفیەکان زۆرینە نەبوون، بۆ نمونە شورای لۆغا و پاشتریش شورای کرونشتاد کە زۆر خوێناویانە سەرکوت کرا. لە سەرەتای 1918یشدا لینین بڕیارێکی ڕەسمی دەرکرد سەبارەت بە دامەزراندنی دادگای تایبەتی بۆ سزادانی (تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری). دەسەڵاتێکی رەهاشی بە تشیکا بەخشی بۆ

دەستێوەردان لەم جۆرە مەسەلانە. بەدوای ئەمەشدا کۆمەڵی مەراسیم دەستیان پێکرد بۆ قەدەغەکردنی چالاکی ئەو حیزبە سیاسیانەی دژ بە دەسەڵاتی شوراکان بوون، تەنانەت حیزبی سۆشیالیستە شۆڕشگێڕە چەپڕەوەکان کە لە ڕاپەڕینی ئۆکتۆبەری 1917دا هاوکاری بەلشەفیەکان بوون. لە کۆتایی 1918دا دادگایەکی بەرفراوانیان بۆ ئەندامانی ئەو حیزبە دانا، 30 لە ئەندامانی سەرکردایەتی ئەو حیزبەیان لە سێدارە داو ئەوانی دیکەیان نەفی کرد. لیژنەی مەرکەزی حیزبی بەلشەفییش بڕیارێکی دەرکرد سەبارەت بە دەزگیرکردنی هەموو ئەو مەنشەفیانەی گومان لە لایەنگیریان بۆ شۆڕش دەکرێت، لینینیش خۆی لەکاتی چەسپاندنی سیاسەتێکی ئابووری تازەدا نوسیویەتی و دەڵێت: (جێگەی مەنشەفیەکان و سۆشیالیستە شۆڕشگێڕەکان ئیدی گەر ئەوانەیان بێت کە ئاشکرابوون یا ئەوانەیان کە لە ژێر دەمامکی ناحیزبییەوە خۆیان شاردۆتەوە، زیندانە). پاشتریش بە ئەندامانی لیژنەی مەرکەزیشەوەو دوو هەزار حیزبییان لێگیرا و هەموویان لە سێدارە دران. لە هەمان کاتیشدا حیزبی بەلشەفی پێی لەسەر ئەوە داگسرت ببێتە حیزبی سەرکردەی دەوڵەت و کۆمەڵگە.

ئیدی هەموو دەزگاکانی لە سەروەرییەکانیان داماڵی تەنانەت شوراکانیش، هەروەها جگە لە تەنها دەسەڵاتێك کە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی لیژنەی مەرکەزی حیزبە هیچی دیکەی بۆ نەمێشتنەوە. ئەنجامێکی مەترسیداریش لەم پاشکۆیەتییە بۆ دەزگا کۆمەڵایەتییەکان کەوتەوە: وازهێنان لە دابین کردنی هەلومەرجەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ڕەتکردنەوەی هەر فۆرمێك لە فۆرمەکانی ئەو دەسەڵاتەی (لە ژێرەوە) بە قازانجی ئەو دەسەڵاتە کە لەسەرەوەیە، ئەوەی لەکاتی خۆیدا پێی دەوترا سەنتەریزمی دیموکراسی کە لە پراکتیککردنی عەمەلیدا سەلما بە 100٪ سەنتەریزمەو لە 1٪ دیموکراسی نییە. یەکێك لە گەورە موفارەقەکانی (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا)ش کە لینین بنەما تیۆری و عەمەلیەکەیی دانا، ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی سەندیکا کرێکاریەکان و داماڵینی چینی کرێکار بوو لەوەی کە بتوانێت خاوەن بڕیاری سیاسی یا ئابووری بێت. وەك لە وتەکەی (زینوفیف) لە خولەکەی ساڵی 1919شدا هاتووە (مادامەکی سیستەمی تازە تەعبیر لە چینی کرێکار دەکات، دەبێ سەندیکاکان پاشکۆی حکومەت بن). پاشتر تەنانەت مافی مان گرتنیشیان لە کرێکاران سەندەوە: (مادامەکی کۆماری شوراکان دەوڵەتێکی کرێکارییە، ئیدی زۆر نالۆجیکییە کرێکاران مان لە دژی خۆیان بگرن).

ئا بەو جۆرە حیزبی کۆمۆنیستی بەلشەفی تەنها بەوەوە نەوەستا خۆی لە حیزبێکی یەکگرتوودا دابمەزرێنێ، بەڵکو خۆیشی کردە تەنها ئامێری فەرمانڕەوایی کردن. ئیدی دەوڵەت و کۆمەڵگەی قوتداو هاوڕێ حیزبیەکانی خۆی لە هەموو دەزگاکانی سەرکردایەتیدا چاند: لە دەزگاکانی بەڕێوەبردن و سوپاکان و سەندیکاکان و دەزگاکانی هاریکاریکردندا ئەمەش لە پرۆسەیەکی ڕاستەقینەی کۆلۆنی کردنی دەوڵەت و کۆمەڵگەدا. هەر لە چوارچێوەی ئەم پرۆسەی بەلشەفی کردنەشدا تۆتالیتاریزمی ستالینی توانی گەشە بکات، ئەو کرمە (ستالین) سەر بەو خاك و خۆڵەیە (لینینزم). بە پێچەوانەی ئەو خوێندنەوەیە کە ساڵانێکی درێژ بۆی کرا، ئەو لادان و دابڕان نەبوو لە ئۆتۆکراتیەتی لینینیزم بەڵکو بەردەوامی پێدانی لینینیزم و گەیاندنی بوو بە دوا پلەی.

**سەرچاوە:**

*ژمارە (12574)ی ڕۆژنامەی الحیاة*

# شەڕو زیندان و ئەزموونی نووسین

**"ئەحمەدۆ کۆرۆمۆ" لە ساحل ئەلعاج و "پۆل ریکۆر" لە فەرەنساو "تیاب" لە ڤێتنام**
**چەند بەشێك لە سەرگورشتەکانیان ئەگێڕنەوە**

■ حەسونە ئەلمیسباحی

● و. لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

ئەحمەدۆ کۆرۆمۆ سالی **1927** لە گوندێکی بچوکی ساحل ئەلعاج لە دایك بووە. لە تەمەنی حەوت ساڵاندا بوو کاتێك خراوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانە فەرەنسیەکەی شاری (بوندیالی).

پاش ئەوەی خوێندنی زانکۆیی لە (باماکۆ) تەواو کرد، بۆ سزادانی لە پای چالاکیە سیاسیەکانی لە دژی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسا، لەنێو ریزەکانی سوپای فەرەنسادا خزمەتی سەربازی کردووە. لە یەکەمین رۆمانیدا کە ناونیشانی (خۆرەکانی سەربەخۆبوونەکان)ی هەڵگرتووەو بەهۆیەوە دان پێدانانێکی جیهانی بەدەست هێنا بۆ توانا هونەریەکانی. تیایدا پرۆتستۆی رژێمە دیکتاتۆریەکانی ئەفریقیاو ئەو زوڵم و ستەمانەیان دەکات کە بەسەر میللەتانیاندا سەپاندووە. سەرجەم ئەو رۆمانانەش کە تا ئێستا نووسیونی و بڵاوی کردونەتەوە، هەمیشە پەیوەست و وابەستەبوون بەو گرفت و کێشەو مەسەلە سیاسیو کۆمەڵایەتیانەوە کە کیشوەری ئەفریقیاو میللەتەکانی بە درێژایی پەنجا ساڵ رووبەڕوی بونەتەوە.

ئەحمەدۆ کۆرۆمۆ دەڵێ: "بە زەرورەت بوومە نووسەر، چونکە ساڵی *1963* زۆرێك لە رۆشنبیران لە ساحل ئەلعاج بەرەو زیندان پەلکێش کران و، منیش لەنێویاندا بووم. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ئازادیان کردم لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەم فەرەنسی بوو. لەکاتی دەرچوونم لە زیندان، خۆم بە تەنیاو بێ کار بینیەوە. ئیدی بڕیارم دا بنووسم بۆ داکۆکی کردن لە خۆم و لە هاوڕێیانی زیندانکراوم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسان نەبوو بتوانم راستەوخۆ سەرزەنشتی حکومەت بکەم، ئیدی هانام بردە بەر خۆ شاردنەوە لە پشت هێماکانەوە، یەکەم رۆمانیشم: "خۆرەکانی سەربەخۆبوونەکان". بەرهەمی ئەم قۆناغەی ژیانی ئەدەبیمە. لەکاتی خۆیدا ئاستەنگێکی زۆرم هاتە رێگا لە بڵاوکردنەوەی رۆمانەکەدا، چونکە بڵاوکەرەوەکان لە فەرەنساو لە ئەفریقیا رەزامەندییان دەرنەبڕی بۆ چاپکردنی، لە ئاست ئەم رەوش و

بارودۆخەدا بڕیاری سەفەرم دا بۆ جەزائیر بەمەبەستی کارکردن، ڕۆژێك یەکێك پێمی ڕاگەیاند کە دانشگای (مۆنتریال)ی کەنەدا دەگەڕێت بە شوێن ڕۆمانی ئەفریقیایی‌دا بە مەبەستی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی، ئیدی دەسبەجێ ڕۆمانەکانم نارد بۆیان. لە پاش چەند مانگێکی کەم ڕۆمانەکە بە چاپ گەیشت و خەلاتێکم لە کەنەداوە وەرگرت".

کۆرۆمۆ لە درێژەی باسکردنی کاروانی ئەدەبی خۆیدا، دەڵێت: "لە پاش یەکەم ڕۆمانم، بۆ ماوەی بیست ساڵ بەڕێژ بووم، ڕەنگە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە من نەمتوانی زمانی شیاو بدۆزمەوە بۆ ئەو بابەتانەی سەرقاڵیان کردبووم. تەنیا دوای ئەوەی توانیم زمانی فەرەنسی کە پێی دەنووسم، لە زمانی دایك کە قسانی پێ دەکەم نزیك بکەمەوە، ئینجا توانیم لەو تەڵزگەیە قوتار بم. وەختێ کە منداڵ بووم فێربوونی زمانی فەرەنسی و قسەپێکردنیم بەسەردا سەپێنرا، ئەمەش فەرمانێك بوو درا بەسەر منو کەسانی وەك مندا، بەڵام دواتر زمانی فەرەنسی بوە زمانی ئێمە. زمانی فەرەنسی زمانێکی هەڵکۆڵراوە لەنێو فەزای شارستانیەتی مەسیحی‌دا، هاوکات زمانی کۆمەڵێك ئەقڵی لۆجیکی‌یە.

لەبەرئەوە بەهەرحاڵ ناتوانێ ببێتە ڕەنگدەرەوەی واقیعی ڕاستەقینەی ئەفریقی و لەگەڵیشیدا ناگونجێ. لە جیهانی ئەنگلۆ-ساکسۆنی‌دا مەسەلەکە جیاوازە چونکە ئینگلیزەکان زمانی خۆیان ئەسەپاندووە بەسەر ئەو میللەتانەدا کە ژێردەستەیان کردوون، بەڵام لەلای ئێمە فرانکفونیەت ئامرازێکی سیاسی و ئایدیۆلۆجی‌یەو ئەرکە سەرەکیەکەی پارێزگاری کردنە لە خاوێنی زمانی فەرەنسی. کاتێکیش لەسەر ئەم ڕێسایە لامداو بەسەریدا ڕاپەڕیم و کۆمەڵێك واژەو وێنەی نامۆ بەو زمانەم هاوردە نێوی، بەوە تاوانبار کرام کە من لاقەی زمان دەکەم. لە ڕاستیدا من بە ناچاری ئەو کارەم کرد، چونکە ئەوسا و ئێستاش ئامانجی من گوزارشت بووە لە واقیعی ئەفریقی. لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم کە لەنێو کۆشکی گەورەی زمانی فەرەنسیدا خانۆچکەی زمانی خۆمم لە یاد چووە".

سەبارەت بە داهاتووی کیشوەری ئەفریقیا. کۆرۆمۆ ئەڵێ: "بە شێوەیەکی گشتی من زۆر ڕەشبینم، بەڵام ئەبێ ئەوە بڵێم کە هەندێ جار خۆشبین دەبم، هەموو شتەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو فەوزاو پەشێویەی لە دوای ماوەی تاریکی کۆیلەیەتی هاتە ئارا. لە پاش کۆلۆنیالیزم و شەڕی ساردیش دەکرێ بگوترێت کە دژوارە خۆمان لە بار گرژیە خێڵەکیەکان بەدوور بگرین. بەڵام ناشکرێت بارودۆخەکە هەر ئەوها بەو شێوەیە بمێنێتەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان شتەکان دەگۆڕێن و ئەفریقیاش لە دیکتاتۆریەتەکان ڕزگاری دەبێ، هەروەك چۆن لە کۆلۆنیالیزم ڕزگاری بوو. لەبەرئەوە من ئەوەم بۆ خۆم هەڵبژاردووە کە هەمیشە بەرهەڵستکاربم، چونکە بەرهەڵستکارێتی تەنیا ئامرازێکە کە دەرفەتی ژیانمان لە وڵاتێکی ئەفریقیایی‌دا دەداتێ".

**"ئاراستەی فەیلەسوفێکی فەرەنسی"**

بە بۆنەی دەرچوونی کتێبەکەیەوە "یادەوەری، مێژوو، لەبیرچوونەوە" لە لایەن دەزگای (ئەلسوی ) لە پاریس، فەیلەسوفی فەرەنسی "پۆل ریکۆر" لە بارەی ئاراستە فەلسەفیەکەی دووا و وتی: "پێم وانی‌یە فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆم هەبێ و لەهەر کتێبێکی نوێدا کە دەریدەکەم ڕوخسار و تایبەتمەندیەکانی ئاشکرا بکەم. هەر کتێبێك کە دەریدەکەم توخنی مەسەلەیەکی فەلسەفی دیاری کراو دەکەوێت. ئەم مەسەلانەش لە یەکدی جیاوازن. تەنیا بە پاریدەی خوێنەرانم و بەهۆی دەزوویەکی دیاری‌کراوەوە بە یەکتریانەوە گرێ دەدەم. یەکەمین کارم دەربارەی ئیرادە بوو، کە لەژێر کارتێکردنی هۆسرل و مارلۆپۆنتی‌دا نووسرابوو. لەکاتی خۆیدا دەمپرسی: ئیرادەی ئازادانە چی‌یە؟ ئەو ئیرادەیە دەتوانێ چی بکات؟ کردەی نائیرادی چی‌یە؟ سنووری ئیرادی و نائیرادی چی‌یە؟ دوای ئەوە چووم بەلای مەسەلەی خراپە (الشر)دا، ئامانجیشم لەم کارەمدا دۆزینەوەی خراپە بوو لە ڕێگای هێماو ئەفسانەکانەوە، ئەم کارە وەك شۆڕشێکی بچوك وەها بوو لەنێو میتۆدی هۆسرلدا، کە ئەوکاتە من پێوەی وابەستە بووم. لە ڕێگای ئەم کارەمەوە خۆمم لە بەرەنگاری

چەندین تێڕوانین و دیدو بۆچوونی جیاوازدا بینیەوە کە پەیوەندیان هەبوو بە خراپەوە، تێڕوانینی گریکی‌و چەند تێڕوانینێکی دی کە پەیوەست بوون بە ئینجیل و بە ئاینە دێرینەکانەوە، بە تایبەت ئایینی بابلی. پاش ئەوە بە چاکی فرۆیدم خوێندەوەو رووم کردە گرنگیدان بە سایکۆلۆجیا. ئەو مەسەلە بنەڕەتیەش کە سەرقاڵی کردبووم سنووری ئاگایی (الوعی) و نائاگایی بوو، لەو کتێبە تازەیەشدا کە بەم زووانە دەرچووە گرنگیم داوە بە یادەوەری و پەیوەندی بە مێژوو و بە لەبیر چوونەوەوە".

دەربارەی پەیوەندیشی بە (جاک لاکان)ەوە، ریکۆر ئەڵێ: "پەیوەندیەکی دژوار بوو تەنانەت تا ئێستاش دەپرسم ئەوە چی بوو کە لە نێوان من و لاکاندا روویدا، گەمەی پشیلەو مشك هەبوو، ئەو پشیلەکە بوو. لە (بۆنفال) ئاشنایەتیمان پەیدا کرد لەلای زانای دەروونناسی گەورە (هنری ئای)، لەو شوێنە باسێکم دەربارەی فرۆید پێشکەش کرد. لاکانیش گوێی راگرتبوو بۆ باسەکە. پاش ئەوە لەگەڵم هات بۆ پاریس، هەوڵیدا چەواشەم بکات و پێشنیاری کرد ئامادەی لێکچەرە بەناوبانگەکانی ببم. ئیدی منیش وامکرد، بەڵام دانی پێدا دەنێم کە هیچ شتێکی ئەوتۆ زۆر لەوە تێنەگەیشتم کە دەیووت. هاوکات بەردەوام بووم لە دانانی کتێبەکەمدا کە ساڵی **1965** لە ژێر ناونیشانی (دەربارەی شرۆڤە)دا دەرچوو. هەر دەسبەجێ لاکان لە توڕەییدا تەقی‌و تاوانباری کردم بە تاڵانکردن و دزینی بیروڕاکانی ئەو!"

پۆل ریکۆر رۆژی **27**ی فێبرایەر (شوبات)ی ساڵی **1913** لە دایك بووە، واتە پێش ساڵێك لە هەڵگیرسانی یەکەمین شەڕی جیهان، ناوبراو سەر بە بنەماڵەیەکی پرۆتستانتی‌یەو لە کاتێکی زووەوە دایکی و پاشان باوکی لە دەستداوە کە لە شەڕی (مارن) ساڵی **1915** کوژراوە. هەر لە منداڵیەوە خولیای خوێندنەوە بووە، زوربەی کاتەکانیشی لەنێو کتێبدا دەبردە سەر. لە ساڵانی سەرەتای لاوێتیدا بە شێوەیەکی بەردەوام ئامادەی (ئەڵقەکانی هەینی) دەبوو کە فەیلەسوفی مەسیحی بونگەرا گابرێل مارسیل بەڕێوەی دەبرد، هەر لەو ئەڵقانەشەوە فێری چۆنێتی گوێگرتن بوو لە کەسانی دی و چلۆن چۆنیش لە بیروڕایەکانیدا سەربەخۆ دەبێ. ساڵی **1933** زانکۆی (سۆربۆن) بەشی فەلسەفە تەواو دەکات و دەست دەکاتە بڵاوکردنەوەی وتارەکانی لە گۆڤاری (فیکر)دا، کە یەکێك بووە لە گەورەترین و بەناوبانگترین گۆڤارە فیکریەکانی ئەو کاتە.

ساڵی **1939** پەیوەندی دەکات بە بەرەکانی شەڕەوەو لە هەفتەکانی سەرەتای دووەمین شەڕی جیهانی‌دا لە لایەن ئەڵمانەکانەوە بە دیلی دەگیرێ. لە سەربازگەکانی دەست بەسەریدا ریکۆر بە دیداری کۆمەڵێك لە رۆشنبیران شاد دەبێت و بەشداری چەندین کۆڕی گەرمی گفتوگۆ دەبێت، دەربارەی فەلسەفەو فەیلەسوفانی لە نموونەی (کارل یاسبرس) و (هۆسرل). لە پاش ئازاد کردنی دەکرێتە مامۆستای فەلسەفەو، لە هەمان کاتیشدا سەرقاڵ دەبێ بە دانانی یەکەم کتێبی دەربارەی ئیرادە.

دوای دووەمین شەڕی جیهان سەردەمی بونگەرایی (الوجودیة) دێتە پێش و لەگەڵ خۆیشیدا سیمبول و ناودارانی گەورەی دەهێنێت لە نموونەی (جان پۆل سارتەر) و (کارل یاسبرس) و (کێرکجارد) و (ئەلبێر کامۆ). لەم ماوەیەشدا ریکۆر دەکرێتە مامۆستای فەلسەفە لە ستراسبۆرگی، دەستدەکاتە بڵاوکردنەوەی وتارەکانی لە گۆڤاری (بەرەبەیانی کۆمەڵایەتی)دا. لەکاتی شەڕی ساردیشدا روودەکاتە داکۆکی کردن لە رێگای سێیەم، ئەو رێگایەی کە ئەوروپا بە دوور بگرێت لە ململانێی توندی نێوان جوتە زلهێزی ئەو رۆژگارە، واتە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت.

### "نووسەرێك لە ڤێتنامەوە"

نجیوان هوای تیاب لە (هانۆی) دەژیاو چێشتخانەیەکی بچوکی بەڕێوە دەبرد. کاتێك هەستی کرد کە دەسەلاتدارانی کۆمۆنیستی ولات بەچاوی گومان و ناڕەزامەندیەوە تەماشای ئەو چیرۆك و رۆمانانە دەکەن کە ئەو کات دەینووسین، دەسبەجێ بڕیاری دا لە ولات هەڵبێ‌و دوور بکەوێتەوە، چونکە مانەوەی چیدی ناگەیەنێت جگە لە زیندانی

کردن و راوەدوونانی رۆژانە نەبێت، بەم جۆرە هاتە پاریس. ناوبراو لە بارەی بارودۆخی میللەتەکەی لە سایەی سیستمی کۆمۆنیستیدا ئەڵێ: "پێش سیاسەتی نوێکردنەوە کە پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنام لە ساڵی 1987دا گرتیە بەر، ڤێتنامیەکان وەکو ئاژەڵی بەند کراو لە گەوڕدا دەژیان کە چاوەڕوانی خاوەنەکەیان بوون خۆراکیان بداتێ. دوای ئەوە بە جۆرێك لە ئازادیەوە دەیانتوانی خۆراکیان لە دەوری گەوڕەکەدا دەستبکەوێت".

ئاشکرایە ئەو سیاسەتەی کە پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنام پێش ساڵی 1987 گرتبویە بەر ئێجگار زیانی گەیاند بە وڵات لە رووی ئابووری و سیاسی و رۆشنبیریەوە. پاش ئەوە لە ترسی روودانی تەقینەوەیەکی میللی گەورە، پارتی کۆمۆنیست بڕیاری دا سیاسەتێکی هاوشێوەی سیاسەتی نوێکردنەوە بگرێتە بەر، بەڵام لە راستیدا بە گوێرەی وتەی (تیاب) ئەو سیاسەتە چیدی زیاتر نەبوو جگە لە: "سیاسەتێکی بێ یاساو نامرۆڤانە"، هەروەها ئەڵێ: "سیاسەتی نوێکردنەوە وەکو واڵاکردنی دەروازەی گەوڕەکە وەها بوو، کە دەسبەجێ ئاژەڵە بەندکراوەکان بە پرتاو دەرپەڕین و یەکتریان پێشێل ئەکرد، هەریەکێکیان دەخوازێ خۆراك بخوات و هەناسە هەڵمژێ و گوێ نادات بەوی دی".

نجیوان هوای تیاب ساڵی 1950 لە دایك بووە. ئێستا بە یەکێك لە گرنگترین نووسەرانی نوێی ڤێتنام دادەنرێت. لە ماوەی گەشت و سەفەرە جۆراوجۆرەکانیدا بە وڵاتەکەیدا لە ماوەی ساڵانی هەشتاکاندا، بڕیاری دا ئەو شتانە بنووسێ کە بینیی و هەستی پێیان کردو بە توندی هەست و هۆشی هەژاند. لەو وەختەدا پۆشکین و گۆگۆل و مۆباسانی خوێندبۆوە، هەنوکە ئەڵێ خاوەن شێوازی تایبەت بە خۆیەو، بەهۆیەوە ئەو کورتە چیرۆکانە دەنووسێ کە ڤێتنامیەکانی دوورە وڵات و دابەشبوانیان بەسەر جیهاندا بەوپەڕی چێژو تامەزرۆییەوە دەیخوێننەوە و پێشوازی لێ دەکەن.

ڤێتنام کە ناوبراو باسی دەکات وڵاتێکی برسیەو ئیرادەو ئازادیشی زەوت کراوە. رۆمانی (ژەنەراڵێکی خانەنشینکراو) دادەنرێت بە گرنگترین کاری ئەم نووسەرە. تیایدا چیرۆکی ژەنەراڵێك دەگێڕێتەوە کە شەڕی لە دژی سوپای ئەمریکا کردووە، بەڵام لە تەمەنی پەککەوتەیدا خۆی بە تەنیاو لە بیرکراو دەبینێتەوە. هاوسەرەکەیشی دووچاری شێت بوون دەبێت و هاوسەری کوڕەکەیشی کە کاری پەرستیاری دەکات، خەریکی هاوردنی منداڵی لەباربراوی ئەو ژنانەیە کە مەبەستی لە باربردنیان کردنیانە بە خۆراکی بەرازان و سەگانی پاس بۆ قەڵەو کردنیان.

لە یەکێك لە چیرۆکەکانی ئەم چەند بڕگەیەمان هەڵبژاردووە: "چەند جۆرێك لە ئەدەب هەیە، هێژا بینەشی ئەمەی وت: ئەوەی کە یارمەتی ئەدات بۆ دەستکەوتنی نان و ئەوەی کە مرۆڤ هانئەدات کە باشتر بێت و ئەوەی کە وەکو پەناگایەك وەهایەو دەرفەتی هەڵهاتن لە ژیان و لە کردار ئەدات بە خاوەنەکەی، تەنانەت ئەوەش هەیە کە دەشێ ببێتە مایەی پەشێوی نانەوە. هێژا جیا هاواری کرد، پێم وابێ تێگەیشتم. من قەسابم و وڵتای پرسیارەکەش چاك دەزانم"

**سەرچاوە:**

*رۆژنامەی الشرق الاوسط*

*ژمارە 8044*

*2000/12/6*

# چەوساندنەوەی ستالینیزم و ڕۆمانی (کوڕانی شەقامی ئەربات)

## دیالۆگ لەگەڵ (ئەناتۆلی ریباکۆف)

● وەرگێڕانی: بروا

نوسەری سۆڤیەتی (ئەناتۆلی ریباکۆف) یەکێکە لەو نوسەرانەی تازە کەشف دەکرێ و دەخوێنرێتەوە. ڕۆمانەکەشی (کوڕانی شەقامی ئەربات) کە زیاد لە سێ ساڵ قەدەغە کرابوو بە شێوەیەکی هێندە چاوەڕوان نەکراو ناوبانگی پەیدا کرد کە زیاد لە 30 ملیۆن ژمارەی لێ چاپکراو بۆ زۆرینەی زمانە جیهانییەکان وەرگێڕدرا. ریباکۆف لە ڕۆمانەکەیدا وێنەی ژیانی نەوەیەکی تەواوی لاوانی کۆمەڵگەی سۆڤییەتیمان دەدلتێ کە قەدەغە بووە بە دەنگی بەرز بیروڕاکانی خۆیان دەربڕن و تەنها بە چرپە یەکتریان دواندووە. ئەم نوسەرە توانیویەتی بە جەسارەت و هێزو توانا ئەدەبییە تایبەتییەکەی خۆیەوە و بێ هیچ جۆرە موجامەلەیەك تیشك بخاتە سەر قۆناغی چەوساندنەوەی ستالینیزم. ئەم دیالۆگەش (ئانا بۆغاج) پەیامنێری گۆڤاری (یونست)ی لاوانی سۆڤییەتی لەگەڵیدا سازی کردووە:



*ئانا بۆغاج: خۆش دەبێت گەر باسی سەرەتاکانت بۆ خوێنەرانمان بکەیت. کەی توانای نوسینت لە خۆتدا کەشف کرد؟*

**ریباكۆف:** من زۆر تامەزرۆی ئەدەب بووم، ئێمە خۆمان نەوەیەك بووین كتێب پەروەردەی كردین نەك تەلەفزیۆن یان ئامرازەكانی دیكەی رابواردن. من كە گەیشتمە تەمەنی 17 ساڵی هەموو ئەدەبی كلاسیكی خۆمانم خوێندبۆوە. بەڵام شەرمم دەكرد لە تەنیشت پۆشكین و تۆلستۆییەوە بنوسم، ئەمانە كۆمەڵێ ناوی كلاسیكی ناو ئەدەبی ئێمەن. چونكە هێندەش بلیمەت و دانا بوون، پیاو دەترسا دەست بكات بە نوسین. هاوڕێكانم و ئەوانەی لێمەوە نزیكبوون هەندێ هەوڵی نوسینیان هەبوو، بەڵام من هەر گومانم هەبوو. پاش جەنگ و گەڕانەوەم لە سوپا دایكم دەفتەرێكی دابوومێ منیش چەند بیروڕایەكی خۆم تیا نووسیبوو، دوای ئەوەی بە وردی لێیان رامام بینیم دەتوانم بنوسم.

*ئانا بۆغاج: زۆر كەس دەڵێن رۆمانەكەت (كوڕانی شەقامی ئەربات) بیبلۆگرافیای ژیانی تایبەتی خۆتە. ئایا ژیانی پاڵەوانەكەت (ساشا بانكراتۆف) لە ژیان و ئەزموونی خۆت دەچێت لە گەنجێتیقدا؟*

**ریباكۆف:** تا رادەیەك. منیش وەكو ساشا قوتابی بووم لە پەیمانگەی ئەندازیاریی مێلی ئاسنین، تەمەنیشم 22 ساڵ بوو كە نەفی كرام بۆ سیبریا. پاش مەنفاكەش لە زۆر ناوچەی یەكێتی سۆڤییەتیش شۆفێر و میكانیكی و ئەندازیار بووم، هەر لە سەرەتای رۆژانی جەنگی جیهانی دووەمیشەوە نێررام بۆ بەرەی جەنگ. لە هەموو ئەم شتانەدا ژیانی خۆم لە ژیانی پاڵەوانی رۆمانەكانم (ساشا بانكراتۆف) دەچێت.

*ئانا بۆغاج: ئەمە مانای وایە ژیانت هێندە لەبار نەبووە تاوەكو پارمەتیدەرت بێت بۆ ئەوەی ببیت بە نوسەر؟*

**ریباكۆف:** بەڵێ، دەتوانیت ئەوە لە رۆمانەكەدا ببینیت و تێبینی بكەیت. من كاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان لە شەقامی ئەربات كە هەموو منداڵیی خۆمم لێبەسەر بردبوو، كەسی نزیكی خۆم نەبینی. زۆربەیان لە جەنگەكەدا و ئەوانی دیكەش پەر لە جەنگ مردبوون. ئەم بارودۆخە بەشێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو یادگارییەكانی منداڵیی تێدا زیندوو كردمەوە. ئیدی بەخۆمم وت: هەوڵبدە بنوسیت. تەمەنم 35 ساڵ بوو یا دەبوایە بنوسم یا تا هەمیشە نەنوسم. یەكسەر چووم بۆ یەكێك لە گوندە نزیكەكانی و تیایدا نیشتەجێ بووم و بە خۆمم وت: تا نەنوسم ئەم گوندە بەجێ ناهێڵم. هەرواش بوو، یەكەم بەرهەمی خۆم چیرۆكی (چەقۆ)م نوسی.

*ئانا بۆغاج: تۆ چیرۆكی (چەقۆت) وەك هونەری ریسكی منداڵان نوسی، بەڵام لە لایەن گەورەكانیشەوە خوێنرایەوە. لەوانەیە نهێنیی ئەمە لە ناوەرۆكی چیرۆكەكەدا بێت. چۆن توانیتان لە یەكەم كاری ئەدەبیتاندا ئەمە بەدی بهێنن؟*

**ریباكۆف:** نوسەر دوو رەگەزی لە بەردەمدایە بۆ كاركردن ئەوانیش: یادەوەری و خەیاڵ. یادەوەری رەگەزە خۆشەكانی ژیان هەڵدەبژێرێ بۆ كاركردن، بەڵام خەیاڵ توانای نوسەرە بەسەر دانانی راستیەكاندا بە شێوەیەك كە وەكو بارودۆخە راستەقینەكەی خۆی نییە لە ژیاندا، بەڵكو دانانیەتی بە شێوەیەك كە لەگەڵ مەرج و داخوازییە هونەری و ئیستاتیكییەكانی كاری هونەریدا دەگونجێت. میحوەری سەرەكی چیرۆكی (چەقۆ) بە پاڵپشتی یادگارییەكانی خۆم نوسراوە و بونیات نراوە. رۆژێك لە رۆژان یەكێك لە پیاوانی دەریاوانی كە ناوی (كریلۆف) بوو -خۆشم لە چیرۆكەكەدا ناوم ناوە (بۆلیف چەقۆ)- چەقۆیەكی بە دیاری دامێ. بۆ بیشارمەوە؟ میحوەری چیرۆكەكەم لەسەر بنەمای ئەو چەقۆیە بونیات ناوە. ساڵی 1947یش كە لە نوسینی ئەو چیرۆكە بوومەوە، لەو گۆشەگیریە و تەنهاییەم هاتمە دەرێ.

*ئانا بۆغاج: لەو ساڵانەدا - واتە چلەكان- كە تۆ ئەو چیرۆكە (چەقۆ)ت بڵاوكردەوە نەوەیەك لە نوسەران خەریكی نوسین بوون سەبارەت بە شەڕەكانی پێشوو. بەڵام تۆ لە یەكەم كاری ئەدەبیتدا بەر لە جەنگی بیستەكانی سەدەو یەكەم قۆناغی پەرەسەندنی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لەسەر بابەتی منداڵییت نوسی. ئەمە سەرەڕای ئەوە تۆ لە یەكەم رۆژەوە تاوەكو سەركەوتن لە جەنگدا بەشدار بوویت، ئایا ئارەزووی پیاچوونەوە بە*

***ئەزموونی خۆت لە جەنگ و نوسین لە بارەیەوە ناکەیت؟***

**ریساکۆف:** نەوەیەك نوسەری جەنگمان هەیە، ئەم نەوەیە ئەو لاوانەن کە لە تەمەنی 18 بۆ 19 ساڵی روویان کردۆتە بەرەکانی جەنگ کە گەورەترین بومەلەرزەی ژیانیان بوو، هەر بۆیە لە بارەی ئەزموونی جەنگەوە نوسییان. ئەوان نەیانتوانی لە بابەتی جەنگ رزگار بن، یا زۆر بە قورسی رزگاریان بوو (بە هۆی خۆ سەرقاڵکردن بە بابەتی دیکەوە). بەڵام ئەوانەی لەو بابەتە رزگار نەبوون تا ئەمڕۆش هەروەکو نووسەری جەنگ ماونەتەوە. بەلای خۆشمەوە جەنگ یەکەم رووداوی دراماتیکی نەبوو لە ژیانمدا. من بەر لە جەنگ ئەزموونی مەنفای سیبریا و کۆمەڵێ رووداوی ترازیدی دیکەم هەبوو. بۆیە کە دەستم کرد بە نوسین گەڕامەوە بۆ یادەوەری خۆم و باشترین شتی ناوی: منداڵیم. منداڵیم باشترین ماوەی ژیانم بوو کە لە مۆسکۆ بە ئازادی دەژیام. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بدەم کە زۆر لە نوسەران بە بابەتی منداڵیی دەستیان پێکردووە (تۆلستۆی، مەکسیم گۆرکی، ئەلکسی تۆلستۆی). هەمیشە نوسەران لە ماوەی جیاواز جیاوازدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەم بابەتە.

***ئانا بۆغاچ: کەی بۆ یەکەم جار رۆمانەکەتان (کوڕانی شەقامی ئەربات) کەوتە بەر دیدەی خوێنەران؟***

**ریساکۆف:** یەکەم جار ساڵی 1966 لە گۆڤاری (نۆڤی میر) کە گۆڤارێکی ئەدەبی مانگانە بوو بەشی یەکەمی بڵاوکرایەوە، بەڵام پاش ئەوە قەدەغە کراو دوا بەدوای ئەوە رۆمانەکانی دیکەشم (رۆمانی لمە قورسەکە بۆنمونە) قەدەغە کران سەرەڕای قەدەغەکردن بەشی دووەمی رۆمانی (کوڕانی شەقامی ئەربات)یشم نوسی، بەردەوام بووم تاوەکو بەشی سێهەمیشم تەواو کرد، ئەمە سەرەڕای نائومێدیم لە گەیشتنی بە خوێنەران.

***ئانا بۆغاچ: سەرەڕای لەو قەدەغەکردنەی رووبەرووی بوونەوە چی پاڵی پێوەنان بەردەوام بن لە نوسین، چونکە لە مڕۆ تەنانەت نوسەرە گەنجەکانیش کە تازە دەستیان کردووە بە نوسین داوای گرەنتی بڵاوکردنەوە دەکەن، واتە پرسیار لە خانەی بڵاوکردنەوە یا گۆڤارەکان دەکەن چ ماوەیەك بڵاو دەکەنەوە، یاخود ئەو ماددانە بڵاودەکەنەوە کە ئەمان بۆیان دەنێرن.***

**ریباکۆف:** ئەگەر هەموو ئامانجی مرۆڤ لە نوسینەکانی بڵاوکردنەوە بێت، ئەوا هەرگیز نابێتە نووسەر. من کە چیرۆکی (چەقۆ)م نوسی نەمدەزانی بڵاو دەبێتەوە یان نا، لەگەڵ هیچ دەزگایەکی بڵاوکردنەوە رێك نەکەوتبووم و پێشەکیشم وەرنەگرتبوو من هەستم دەکرد پێویستە ئەو چیرۆکە بنووسم. ئەگەر ئەو چیرۆکەش بڵاونەکرابایەوە، چیرۆکێکی دیکەم دەنوسی. هەمان شت لەگەڵ رۆمانی (کوڕانی شەقامی ئەربات)یشدا. بەشی یەکەمی رۆمانەکە بڵاونەکرایەوە چونکە تا رادەیەك باسی ستالینم کردبوو، بەڵام بەردەوام بووم تاوەکو لە بەشی دووەمی رۆمانەکەدا زیاتر باسی ستالین بکەم. لە بەشی سێهەمیشدا بە شێوەیەك باسی ستالینم کرد کە پێشتر کەس باسی نەکردبوو.

***ئانا بۆغاچ: هیچ نامەیەکتان لە خوێنەرە لاوەکانەوە پێگەیشتووە پێچەوانەی بۆچوونی خۆتان سەبارەت بە رۆمانەکە؟***

**ریساکۆف:** بڕێکی زۆر نامەی هاوڵاتیانی سۆڤیەتم بەدەست گەیشتووە، ئەمە جگە لە نامەی هەڕەشەلێکردن و پەیماندان بە کوشتنم لە لایەن هەوادارەکانی ستالینەوە. بەڵام ئەوەی کە چاوەڕوانی نەبووم نامەی ئەو خوێنەرە گەنجانە بوو کە تەمەنیان لە نێوان 17 بۆ 32 ساڵیدا بوو، وە لە وڵاتەکانی واقیعدا بە دوای راستیدا دەگەڕان. گەنج هەمیشە حەزی بە تەعبیری زاتی خۆیەتی و لە 16 ساڵییەوە [illegible] دەگەڕێن، تایبەتمەندیتی گەنجان لە چالاکی و هۆشیاری سیاسیداید. بەڵام ئەمڕۆ زۆر بە داخەوە زۆربەی گەنجەکانمان تەنها [illegible] جلوبەرگ و قژبڕین لە خۆرئاوا وەردەگرن. سەرەڕای ئەم ئاراستەیەش لەناو گەنجاندا [illegible] خوێندنەوەی نامەکانیان هەستم بە بوونی ئارەزوویەکی گەورە بۆ زانین و ئاگاداری لە سیاسەت کرد.

**سەرچاوە:** [illegible] (130 - 132).

# شانۆی ئینتیم

## لە حەوتەم فیستیڤاڵی ستریندباری‌دا لە ستۆکهۆڵم

● دانا رەووف

ئەمساڵ شانۆی (ئینتیم) بووە ناوەندێکی گرنگی چالاکیەکانی حەوتەم فیستیڤاڵی نووسەری گەورەی سویدی ئاگۆست ستریندباری. فیستیڤاڵەکە لە 7 بۆ 15ی مانگی ئۆکتۆبەری خایاندو تێکرا چالاکیەکانی فیستیڤاڵەکە لەسەر شانۆی ئینتیم پێشکەشکران.

شانۆی (ئینتیم)یش یەکێکە لە شانۆ دێرینەکانی سویدو ستریندباری خۆی لە ساڵی 1907دا لە ستۆکهۆڵم دایمەزراندووە.

چالاکیەکانی فیستیڤاڵەکەی ئەمساڵ چەندین سیمینار، خوێندنەوەی شیعرو بەرهەمەکانی ستریندباری، کۆنسارت و ئاهەنگی گۆرانی، پێشاندانی فیلم و شانۆنامەکانی ستریندباری لەخۆگرت.

گرنگترین سیمینارەکان: بێنگت لاگەرکڤیست سەبارەت ستریندباری وێنەکێش دەدوێت، ئینگمار باریمان و سۆناتای تارمایی لەلایەن پرۆفیسۆر ئێگیل تۆرنگڤیست، ریژیسۆر و ئەکتەری ناسراو کێڤی هێلم دەربارەی مامەڵەی خۆی لەتەک ستریندباریدا دەدوێت، پانێلێکی گفتوگۆ لەلایەن کۆمەڵێ پسپۆڕو رەخنەگرانی سینەماو شانۆوە سەبارەت بە ئینگمار باریمان- ستریندباری، ستریندباری و فەیلەسوفی ئەڵمانی فریدریش نیچە- خوێندنەوەی گولبژێرێک لە نامە بڵاونەکراوەکانی نێوان ئەو دوو بلیمەتە گەورەیە، هونەرمەندی سینۆگراف سێورێن بریونێس وتوێژێکی فەلسەفی سەبارەت بەو وتەیەی ستریندباری کە دەڵێت:




"دەکرێت دیمەنێك لە تاریکدا پێشکەش بکرێت و چێژیشی لێوەربگیرێت، تەنها گەر باش ,ئەبێندرێتەوە". پێشکەش کردو دواجاریش سیمنارێك سەبارەت بە شانۆی ئینتیم لە دوێنێ ـ ئەمڕۆدا.

چالاکیە شانۆییەکانی فیستیڤاڵی ئەم ساڵ زۆر دیاریکراو بوون و

گرنگترینیان شانۆنامەی (باوك و پاریا) لە ریژی (دەرهێنان) هونەرمەند تۆشتن ڤلینك، خاتوو ژۆلیا وەك سەمایەكی ڤلامینكۆ، پرۆسەی زەماوەندو نمایشێكی سەما ئامێز.

وەك لەوەوبەر ئاماژەم بۆ كرد شانۆی ئینتیم بووبووە ناوەندو چەقی چالاكیەكانی فیستیڤاڵەكە. لەبەر گرنگی ئەو شانۆیە هەوڵ ئەدەم لێرەدا بە كورتی تیشكی سەرنج بخەمە سەر مێژوو، چۆنیەتی سەرهەڵدان و رەوتی شانۆی (ئینتیم) لە ستۆكهۆلم بدوێم.

**شانۆی ئینتیم**

ئاگۆست ڤالك ***August Falch*** یەكێك بووە لە ریژیسۆرە گەنجەكانی سەردەمی ستریندباری. ئەم گەنجە لە خێزانێكی هونەرپەروەرو شانۆییدا گەورە بووە. باوكی لە شانۆی پادشایەتی كاریكردووە. ڤالك لە سالی ***1901***دا لە یەكێك لە دیارترین قوتابخانە شانۆییەكانی ئەوكاتەی ستۆكهوڵمدا بەناوی (شانۆیەكی نوێ)ەوە خوێندوویەتی. دواجار لە شانۆی سویدی لە هێلسینگۆشی پایتەختی وڵاتی فینلاند بۆ كاركردن دەگیرسێتەوە. ئەم گەنجە زۆر هەڵپەی كاركردنی داوەو بەچاوێكی پڕ لە رێزو خۆشەویستیشەوە مامەڵەی لەتەك پیەسەكانی ستریندباری كردووە. یەكەم پرۆژەی سەركەوتوی ڤالك شانۆیی (خاتوو ژۆلیا) دەبێت. سەرەتا لە روانگەی گەشتێكی هونەرییەوە لە زۆربەی شارەكانی سوید شانۆنامەی خاتو ژۆلیا نمایش دەكات. دواجار گەشتی ئەو سەركەوتنە هونەرییە لە ***13***ی مانگی دێسێمبەری سالی ***1906***دا و لە (شانۆی گەل) لە ستۆكهۆلم كۆتایی دێت. ئەم سەركەوتنەی ڤالك و شانۆیی خاتو ژۆلیا، سەرلەنوێ بیرۆكەی دامەزراندنی شانۆیەكی تایبەت لەلای ستریندباری دەوروژێنێت[1]. ستریندباری بۆ ئەو مەبەستە (ئاگۆست ڤالك) وەك ریژیسۆرێكی گەنج بە بەڕێوەبەرێكی شیاوی ئەو پرۆژەیە دەبینێت.

ئاگۆست ڤالك و هاورێ ئەكتەرەكانی زۆر بە پەرۆشەوە بەپیر بیرۆكەی دامەزراندنی شانۆكەی ستریندباریەوە دەچن. ستریندباری پیەسە شانۆ نوێیەكانی خۆی كە بە تایبەتی بۆ ئەو شانۆ نوێیە دەنووسێت ناو دەنێت (گەمەی ژوور) ***Kammarspel***.

پایزی سالی ***1907*** شانۆ ژوورەكەی ستریندباری و ڤالك لە شەقامی (نۆرە بانتۆرییەت) لە ستۆكهۆلم بە شانۆیی (سەقاقوش) دەكرێتەوە. بەهاو گرنگی مێژوویی ئەم شانۆیە لەوەدایە ستریندباری كۆمەڵێك پیەسی گرنگ بەناوی (گەمەی ژوور)ەوە راستەوخۆ بۆ ئەم شانۆیە دەنووسێت. ئەم پیەسانەش لە نێوان مانگی یەك تا مانگی شەش سالی ***1907***دا نووسیونی بریتین لە: (زریان، زەوی سوتاو، تارمایی سۆناتاو سەقاقوش). بەلام پێنجەم شانۆیی گەمەی ژوور (دەسكێشی رەش)ە، ستریندباری ئەم پیەسەیان لە كۆتایی سالی ***1908*** و سەرەتای سالی ***1909***دا دەنووسێت. ستریندباری ئەم پیەسانە لە شێوازی كۆمەڵێ جوڵەی مۆسیقیدا دەنووسێت. هەر پیەسەی جوڵەیەكی مۆسیقیەو پێكەوە پارچە مۆسیقایەكی پێنج بەشی پێك دەهێنن.

هەروەها ئامانجی دامەزراندنی ئەم شانۆ تایبەتەی ستریندباری، جگە لە پیەسەكانی (گەمەی ژوور) نمایشكردنی ئەو پیەسانەی تری ستریندباری بوون كە تا ئەوكاتە لە سوید پێشكەش نەكرابوون. دواجار ئەو شانۆیە لە ستۆكهۆلم ناودەنرێت بە شانۆی (ئینتیم) ***Intima Teatern***. وشەكەش زۆر نامۆ نەبووە بەنێوەندی رۆشنبیری و هونەری ئەوكاتەی ستۆكهۆلم. بۆ یەكەمجار لە سالی ***1895***داو لە گۆڤاری (وشەو وێنە)دا بابەتێكی ئامادەكراو بەناوی (شانۆی ئینتیم)ەوە كە لە گۆڤارێكی ئەڵمانیەوە وەرگیراوە سەبارەت بەو شێوازە نوێیەی شانۆ، بلاوكراوەتەوە.

زاراوەی (ئینتیم)یش مانای هاودەم و نزیك دەگەیەنێت. لەو رووەوەی شانۆكە، یان شانۆیەكی بچوكی ژوور ئاسایەو ژمارەی كورسیەكانی دیاریكراوە. شانۆی ئینتیم لە ستۆكهۆلم لەكاتی كردنەوەیدا تەنها ***161*** كورسی دانیشتنی لە خۆگرتووە. تەختەی شانۆكەش شەش مەتر درێژ و چوار مەتر قوڵ بووە. ئەمەش پێویستی بە بارودۆخێكی جیاواز و خوڵقاندنی فۆرمێكی تازە بووە بۆ نووسینی شانۆنامەكان و پێشكەش كردنیان.



دامەزراندنی شانۆیەکی لەو چەشنەش بەرجەستەکردنێکی خەون و بۆچوونە دێرینەکانی ستریندباری بووە بۆ خولقاندنی شانۆیەکی راستەقینە. ستریندباری لە پێشەکیە گرنگەکەی خاتو ژۆلیادا دەڵێت: (سەرەتاو کۆتایی تەختەیەکی بچوکی شانۆیی و هۆڵێکی نزیک و بچکۆلە پێویستە).

ستریندباری خۆی لە یەکێك لە نامەکانیدا بەم شێوەیە سەبارەت بە شانۆی ئینتیم دەدوێت: "گەر ئێستە لە من بپرسن شانۆیەکی ئینتیم چی دەوێت، مەبەست لە بیرۆکەی گەمەی ژوور چیە، دەتوانم بەم شێوەیە وەڵام بدەمەوە: لە دراماکەدا ئێمە هەوڵی دۆزینەوەی هۆکارە پڕ ماناو بەهێزەکانی دەدەین، بەڵام بە شێوەیەکی سنوردار و دیاریکراو، لە چارەسەرکردنەکاندا هەوڵی وەلاوەنانی هەموو جۆرە زەخرەفەکاری، کاریگەری چاوەڕوانکراو، چەپڵە رێزان، رۆڵی بریقەدارو سەرەکی دەدەین. نابێت هیچ جۆرە فۆرمێکی دیاریکراو نووسەر ببەستێتەوە، لەبەر ئەوەی هۆکارەکە خۆی مەرج بۆ فۆرم دادەنێت. بە مانایەکی تر سەربەستی لە چارەسەرکردندا، تەنها پابەندی یەکەی پرۆژەو شێوازو هێڵە هەستیەکە دەبن"[2].

شانۆیی (سەقاقوش) کە شانۆکەی پێدەکرێتەوە، وەك زۆربەی شانۆییەکانی تری ستریندباری کە لە شانۆی (ئینتیم) نمایش دەکرێت، وەك دیاردەیەکی نوێ بۆ ئەوکاتەی شانۆی سویدی، بەر شاڵاوێکی توندی رەخنەی رۆژنامەنووس و رەخنەگرە شانۆییەکان دەکەوێت. ئەمەش حاڵەتێکی چاوەڕوانکراوە بۆ کەسێکی وەك ستریندباری کە بە ماوەیەکی درێژ پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو. ئەو شاڵاوە رەخنەییانەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو شانۆییانە جەماوەرێکی زۆری لێکۆنەبێتەوەو دوای چەند هەفتەیەك نمایشەکە رابگیرێت.

هۆکاری ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆربەی ئەکتەرەکانی ئەو شانۆ نوێیە ئەکتەری لاو و تازە پێگەیشتوو بوون و توانای هونەرییان لە ئاستێکی بەرزدا نەبووە. ئەمە جگە لەوەی (ئاگۆست فالك)یش ئەو ریژیسۆرە بلیمەتە نەبووە بتوانێت نمایشەکان بگەیەنێتە ئاستێکی هونەری بەرز و نهێنی پیەسەکان بدۆزێتەوە.

ستریندباری ناچار دەبێت خۆی یارمەتی و هاریکاری ئەکتەرەکانی بکات. بۆ ئەو مەبەستەش خۆی کاری ریژی هەندێ لە نمایشەکان دەکات و چەندین وتاری گرنگیش

سەبارەت بە هونەری نواندن و ڕیژی دەنووسێت. ئەو وتارانەی لە ڕێگای (نامەی کراوە)وە ئاراستەی شانۆی ئینتیم و ئەندامەکانی کردووە[3].

ئێستە ئەو نامانە لەگەڵ هەزارەها نامەی تری ستریندباری دادەنرێت بە کلتورێکی گرنگی ئەدەبی هاوچەرخی سوێدی و لە چەندەها بەرگدا بۆ چەندین جار چاپ و بڵاو کراونەتەوە[4].

(شانۆی ئینتیم) تەنها چوار ساڵ بەردەوام دەبێت و بەهۆی بارێکی زۆر گرانی داراییەوە ناچار دەبێت لە ساڵی *1910*دا دابخرێت[5].

شانۆی ئینتیم لەو چەند ساڵەی تەمەنیدا توانیویەتی بیست و چوار شانۆیی جۆراوجۆری ستریندباری پێشکەش بکات. هەروەها تێکڕا *1025* جار ئەو نەمایشانە پێشکەشکراون.

ئاگۆست فالك لە ساڵی *1935*دا کۆی ئەو ئەزموونە گرنگەی ڕەوتی شانۆی سوێدی لە کتێبێکدا بەناوی (پێنج ساڵ لەگەڵ ستریندباریدا) بڵاودەکاتەوە، کتێبەکە باس لە ئەزموونی خۆی (ئاگۆست فالك) لەگەڵ ستریندباری و شانۆی ئینتیمدا دەکات.

هەروەها ئەو کتێبە ڕێپورتوار و پرۆگرامی شانۆییە نەمایشکراوەکانی ئەو چەند ساڵەی شانۆی ئینتیم و گەشتە هونەرییەکانیان بۆ دەرەوەی ستۆکهۆلم لەخۆ دەگرێت. لەبەرئەوە ئەو کتێبە دادەنرێت بە دیکۆمێنتێکی گرنگ و پڕ بایەخ بۆ لێکۆڵینەوەو لەسەر نووسینی ئەو شانۆ گرنگە، وەك قۆناغێکی لەبەرچاوی ڕەوتی شانۆی سوێدی، نەك هەر شانۆی سوێدی بەڵکو ئەو شانۆیە بەهایەکی گرنگی مێژوویشی لە ڕەوتی شانۆی جیهانیدا هەیە[6].

شانۆی ئینتیم کۆمەڵێ تەکنیك، هزرو دیدی نوێی پێشکەش کردووە، زۆر نامۆ بووە بەوکاتەی شانۆی سوێدی. ستریندباری و فالك بەوپەڕی پەرۆش و وریاییەوە چاودێری گۆڕانکاری و ڕووداوەکانی شانۆی ئەوروپیان کردووەو هوشیار بوون بەرانبەر بە تەوژم و ڕێبازە شانۆییە هاوچەرخەکان. ئاگۆست فالك لە کتێبەکەیدا کە لەلای سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە دەڵێت: (گەر ئێمە خاوەنی ئیمکانیاتێکی زیاتر بووینایە، بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم هەموو ئەو بیرو دیدانەی ستریندباری هەیبوو، کە زۆربەی شەوان بەوپەڕی هێمنیەوە گفتوگۆمان لەسەر دەکرد و لەسەر ڕووپەل ئامادەمان دەکرد، دەبووە شۆڕشێك لە بواری شانۆدا. چونکە خەونەکانی شانۆی ئینتیم زۆر گەورە بوون). پیەسەکانی (گەمەی ژوور) کاریگەرییەکی لەبەرچاویان بەسەر شانۆی هاوچەرخی جیهانیەوە هەیە. ئەو کاریگەرییە بەتایبەتی لە دوای جەنگی جیهانی دووەمدا، بە ڕوونی لەلای (بێکیت و یۆنسکۆ) دەبینرێت.

## پەراوێزەکان:

*1-دامەزراندنی شانۆیەکی تایبەت بەخۆی خەونێکی دێرینی ستریندباری بووە. بۆ هێنانەدی ئەو خەونەش چەندین تەقەلای داوە. پایزی ساڵی 1876 بۆ یەکەمجار لە یەکێك لە نامەکانیدا بۆ (سیری ڤۆن ئێسن)ی یەکەم خێزانی باس لە گرنگی شانۆیەکی تایبەتی بە خودی خۆی دەکات. هاوینی ساڵی 1880 ستریندباری خەونی بەوەوە بیوە شانۆی* **Ladugardsland** *بەکرێ بگرێت بۆ دامەزراندنی بیرۆکەی شانۆیەکی تایبەت بەخۆی. ساڵی 1881 بۆ هێنانەدی ئەو خەونە هەوڵی داوە* **Hjalmar Hirsch** *هانبدات کە وەك ئەکتەر و ڕیژیسۆر هاریکاری بکات. پایزی ساڵی 1887 زۆر بە پەرۆشەوە ویستوویەتی شانۆیەکی (گەڕۆك) لەگەڵ ئاگۆست لیندباری* **August Lindberg** *دابمەزرێنێت. لیندباری ئەکتەرێکی ناسراوی ئەوکاتەی شانۆی سوێدی بووە. مەبەستی ستریندباری لە دامەزراندنی ئەو شانۆ گەڕۆکە ئەوە بووە بە نەمایشی شانۆیی گەشتی هونەری بکەن بە شارەکانی سوێددا. لەو ڕووەوە ستریندباری لە یەکێك لە نامەکانیدا کە بۆ ئاگۆست لیندباری 1846-1916 نوسیوە دەڵێت: "سەرلەنوێ بووبنیادنانەوەی، یان گۆڕانکاری لە شانۆدا خەون و مەبەستی من نیە، لەبەر ئەوەی ئەوە کارێکی گران و نەکراوە. مەبەست تەنها تەقەلایەکە بۆ نوێکردنەوە". ئەم تەقەلایەی ستریندباری لەو ڕۆژگارەدا تەنها لە بواری پێشنیارەکەدا دەمێنێتەوەو سەرناگرێت. بەڵام ستریندباری کۆڵ نادات.*

پایزی ساڵی 1888 لە ستۆکهۆڵم ویستویەتی شێوە (شانۆیەکی سەربەست)ی بچوک دابمەزرێنێت. پێشنیاری ستریندباری بۆ ئەو شانۆ (سەربەست)ە بچوکە ئەوە بووە کە تەنها هەشت ئەکتەر لە هۆڵێکی بچوکی چوار سەد کورسیدا لەخۆ بگرێت.

لە ساڵی 1888دا، دوای ئەوەی هیچ کام لە تەقەلاکانی بۆ دامەزراندنی شانۆیەکی تایبەت بەخۆی لە سوێد سەرناگرێت، لە شێرپێنهامنی پایتەختی دانمارك لەگەڵ (سیری ڤۆن ئیسن) شانۆیەکی ئەزموونگەری ئەسکەندەنافی دامەزراندوە. لە سەرەتادا مەبەستی ئەوە بووە کۆمەڵێ شانۆیی لە شێرپێنهامن پێشکەش بکات. دواجار ئەو نەمایشانە لە ڕوانگەی گەشتی هونەرییەوە لە هەموو وڵاتانی ئەسکندەنافی پێشکەش بکرێتەوە. بەڵام ئەو تەقەلا ئەزموونگەرییەش تەمەنی درێژ نابێت و تەنها دوای سێ نەمایش لە شێرپێنهامن و یەکێکیش لە شاری (مالمیۆی) سوێد دادەخرێت.

وەرزی شانۆیی ساڵانی 1891–1892 پلانی دامەزراندنی شانۆیەکی–ستریندباری لە ناوچەی یوشهۆڵم Djursholm دەدرێت. ئەو تەقەلایەش وەك خەون و پرۆژەیەکی کاتی دەمێنێتەوە.

هاوینی ساڵی 1893 ستریندباری ڕوو لە ئەڵمانیا دەکات. لە ئەڵمانیا لەگەڵ (ئادۆلف پاوڵ) دەیانەوێ شانۆیەکی–ستریندباری لە بەرلین دابمەزرێنن. ئەو پرۆژەیە دەبێتە خەونێکی گرنگ و بەرین. ستریندباری دەیەوێت (فریدە ئول)ی دووەم خێزانی هاریکاری بکات تا شانۆیەکی لەو چەشنە لە (لەندەن)یش دابمەزرێنێ.

ستریندباری دوای گەڕانەوەی بۆ ستۆکهۆڵم دەیەوێت لە ساڵی 1902دا شانۆیەکە لەگەڵ ئێمیل هێلباری دابمەزرێنێت.

لە مانگی سێپتێمبەری ساڵی 1905دا سەرلەنوێ ستریندباری خەون بە شانۆیەکی بچوکی گەڕۆکەوە دەبینێت. شانۆیەکی بچوك کە تەنها سێ ئەندامی هەبێت. ژنە بچوکەکەشی (هارییەت بوسێ) ببێتە ئەستێرەو ئەکتەری یەکەمی ئەو شانۆ گەڕۆکە. بەڵام دوای ئەوەی لە پایزی ساڵی 1906دا ئاگوست ڤاڵك دەبینێ، خەونی دامەزراندنی شانۆیەکی تایبەت بەخۆی زیاتر فۆرمێکی ئاشکرا لەخۆدەگرێت. بەمەش شانۆی (ئینتیم) لەدایك دەبێت.

2–هەروەها ستریندباری لە نامەیەکی تریدا بۆ ئادۆلف پاوڵ لە 6ی مانگی یەکی ساڵی 1907دا سەبارەت بە شانۆی گەمەی ژوور دەڵێت: (بابەتێکی بچوك، گشتگیر قووڵ و چارەسەرکراو، کەسایەتی و ئەکتەری کەم، دیدێکی گەورەو فراوان، فەنتازیایەکی سەربەست، بەڵام زۆر بە وردی داڕێژراو، پڕ لە ئەزموون، ساکار، بەڵام زۆر ساکار نا؛ دوور لە هەموو جۆرە ماشینە کۆن و گەورەکان، هیچ یاسایەکی داڕێژراوی پێنج پەردەیی، ڕۆڵی بچوك و لاوەکی و شەوگاری درێژ لەخۆ نەگرێت". ستریندباری لەگەڵ نامەی تایبەتی و بابەتی تری تیئۆریدا دیدو بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە چەمکی (گەمەی ژوور) نووسیووە.

3–ستریندباری کۆمەڵێ دیدو سەرنجی تیئۆری گرنگی سەبارەت بەهونەری نواندن نووسیوە. لە ڕوانگەیەکی زۆر تایبەتمەندەوە وەك (نووسەرێکی شانۆیی) بە سەلیقەو داهێنەر، هونەری نواندن و ئەکتەریی ڕاڤەکردووە، بۆ نموونە هونەری نواندن هونەرێکی سەربەخۆ نیەو پاشکۆیەکی ڕاستەوخۆی نووسەرە. ئەمە جگە لەوەی (ئەکتەر) لەلای ئەم نووسەرە بلیمەتە، وەك پیشەو هونەرمەندێکی داهێنەری سەربەخۆ ئاماژەی بۆ ناکرێت. دەکرێت لە بوارێکی تری سەربەخۆدا بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی تیئۆری نواندن و هونەری شانۆ لەلای ستریندباری.

4–ساڵی 1999 و بەهۆی تێپەڕبوونی 150 ساڵ بەسەر لەدایك بوونی ستریندباریدا، هەڵبژاردەیەك لە نامەکانی سەرلەنوێ لە دوو بەرگی جیاوازو لە ڕوانگەی دوو دەزگای گرنگی چاپەمەنی جیاوازەوە بڵاوکراوەتەوە.

هەروەها لە نێوان ساڵانی 1907–1910 کە ستریندباری شانۆ تایبەتەکەی خۆی (شانۆی ئینتیم)ی لەگەڵ ئاگوست ڤاڵك دەبرد بەڕێوە، پێنج بابەتی گرنگی بڵاوکردۆتەوە، لەوانە: کۆکراوەی دیدو بۆچوونی ڕێژیسۆرێك بۆ ئەندامانی شانۆی ئینتیم 1908، هاملێت،

بیرەوەرییەك بۆ 26ی نۆڤێمبەری 1908، سیزەر، دراما مێژووییەكانی شەكسپیر، هەندێ تێبینی و هەڵوێسته سەبارەت بە رەخنەو هونەری نواندن، پاشكۆیەك سەبارەت بە قەیرانی شانۆ- و هەرای شانۆ 1908. هەروەها خوێندنەوەیەكی ماكبث، ئۆتێللۆ، رۆمیۆو یولی، زریان، هاملیت، هینریكی هەشتەم، خەونی نیوە شەوێكی هاوینی شەكسپیر 1909، بێگومان نامە كراوەكانیشی بۆ شانۆی ئینتیم 1909.

كۆتایی ساڵی 1999 ئەم بابەتانە كۆكراونەتەوەو سەرلەنوێ لە بەرگێكی قەشەنگی زنجیرەی چاپە نەتەوەییە كۆكراوەكانی ستریندبەری ژمارە (64) لە ژێر ناوی (شانۆو شانۆی ئینتیم)دا بڵاوكراونەتەوە. ئەو ناونیشانەش پێشنیارێكی كۆنی ستریندبەری خۆی بووە بۆ ئەو بابەتە كۆكراوانە.

لەم بەرگەدا ستریندبەری جگە لە دیدو بۆچوونەكانی خۆی سەبارەت بە هونەری نواندن، چالاكیەكانی شانۆی ئینتیم هەڵدەسەنگێنێ، لە نزیكەوە شەكسپیر دەخوێنێتەوەو ئاوڕێكی بابەتیانەش لە پیەسەكانی رابردووی خۆی دەداتەوە. ئەمە جگە لەوەی لەم بەرگەدا كۆمەڵێك بابەتی تری ستریندبەری كە بەتایبەتی بۆ ئەندامان و ئەكتەرەكانی شانۆی ئینتیم و (ئاگۆست فالك)ی نووسیووە بڵاودەكرێتەوە. كتێبی (شانۆو شانۆی ئینتیم) بنەمایەكی گرنگی لێكۆڵینەوەو خستنەرووی مێژووی ئەو شانۆییە.

5-ستریندبەری لە یەكێك لە مانیفێستەكانیدا بەم شێوەیە ئاماژەی بە باری نالەباری دارایی شانۆی ئینتیم دەكات: دارایی شانۆی ئینتیم رۆژ بە رۆژ بەرەو هەڵدێر دەچێت. بەڵام بە پێچەوانەوە بەهای بیر، ئیستاتیكاو هونەری لەبەرز بوونەوەدایە. بینەران دوای هەموو نەمایشێك كاتێكی باشیان بۆ دەڕەخسێت بۆ ئەوەی گفتوگۆ بكەن سەبارەت بەوەی دیویانەو گوێیان لێ بووە.

6-شانۆی ئینتیم گرنگیەكی مێژوویی و هونەری لە رەوتی شانۆی هاوچەرخی ئەورووپیدا هەیە. جێگای خۆیەتی لە بوارێكی تردا، بەتایبەتی بگەڕێمەوە سەری و لێكۆڵینەوەیەكی فراوانی لەسەر بنووسم.

## سەرچاوەكان:

1-Strindberg, August. Kammarspel, Strindbergs samlade Verk, texten redigerad och kommenterad av Gunner ollen, 1991.

2-Strindberg, August. Teater och intima teatern, Strindbergs samlade verk , nr 64, texten redigered och Kommenterad av Per Stam, 1999.

3-Strindberg, August, Forord och memorandum, Teater 1, Polemik, Teorier, Manifest, En antologi av Ingvar Holm, 1970.

4-Festivalen Strindberg I Stockholm, 2000

پرۆگرامی فیستیڤاڵەكە

# سێکسوالیتی لە نێوان مەرگ و ژیاندا

● ئامادەکردنی: مژدە محەمەد

**ناوی کتێب/ سیکسوالیتی**
**ناوی نووسەر: جۆزێف برستۆ**
**چاپی یەکەم/ 1997**
**قەوارە/ 248**

ئەوەی لە دوا دەیەکانی سەدەی رابردوو کلتووری خۆرئاوا بەخۆیەوە بینی لە هیچ دەیەیەکی تری ئەو سەدەیەدا ئەو گۆڕانە کتوپڕیانەی بەخۆیەوە نەبینی، لە چوونە ناو فەزایەک کە رەفتاری ئیرۆتیکی، ناسنامە، شێوازەکانی جیاواز کردن، دەوری سەرەکی خۆیان پیشان دا لەو کاتەی سێکسواڵە شەفەوییەکان بۆ شەرعی کردنی مافی بەهاووڵاتی بوونی خۆیان تێدەکۆشان؛ ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ دروست کردنی ئەو چوارچێوەی کە چۆن بزوتنەوە نوێیەکان تێدەکۆشن بۆ بردنی ئەو کاتیگۆریە ترانیسۆنانەی کە لە تەفسیرکردنی ئیرۆتیسزم دا بەکاردەهێنرێن.

ئەو بزوتنەوە کۆنکریتیانەی دەیانەوێت جیاوازی سیکسی بسەلمێنن بە هەردوو بارەکەدا (خراپ، باش) کاریگەریەکی زۆری دەبێت بۆ فەزای ژیانی کلتووری، رەنگە بە دیوێک لە دیوەکان ئەمە ببەسترێتەوە بە پۆست مۆدێرنەوە، بێگومان رۆحی پۆست مۆدێرن توانای پێناسەیەکی تایبەتی خۆی بدات بە تیۆری هۆمۆسێکسوالی، چەمکی لادان، ئابوری لیبیدنال، سیکسوالی.. هتد.

گفتوگۆکردن لەسەر بەها ئینسانیەکان لە سەردەمی پۆست مۆدێرنەدا نادڵنیاییەکی سەیری دروست کرد، جێفری وێك ئاماژەی بەوە داوە کە ئەوە پۆست مۆدێرنەیە، هەردوو چالاکی هۆمۆ سێکسوالیو تیۆری سێکسوالی بە هێڵێکی نادیار بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

دوای بڵاوبوونەوەی چەمکی جیاوازی و ئازادی تاکەکان دواتر ئەم جیاوازییە هەموو ئاستەکانی گرتەوە، هەر ئەوەش بوو بوە هۆی ئەوەی جیاوازی ئیرۆتیکی ببێتە دیاردەیەك، دیاردەکەش تەنیا لە شێوەو فۆرمێکدا دەرنەکەوت بەڵکو زۆر فۆرمی جیاوازی سێکسوالی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە هەریەکە لەو فۆرمانە ئیش لەسەر تۆخ کردنەوەی سنورەکانی خۆیان دەکەن و داوای بە هاوڵاتی بوونی خۆیان دەکەن، ئەم دیاردەیەش زیاتر لە ئەورووپاو ئەمریکا بڵاوە، سێکسوالیتی خۆی کە وەکو چەمکێك دەردەکەوێت




کاتێك پێشگری *trans, bi, hetero, homo*... هتد وەردەگرت دەبێت بە خودی کەسەکان خۆیان ئەوانیش وەك هەر گروپێکی ئیتنینی هەوڵی جددی خۆیان ئەدەن بۆ گەیشتن بە خواستەکانیان ئەمانیش وەك چەندین گروپی ئیتنی جیاواز دەردەکەون و کلتوری تایبەتی خۆشیان هەیە، شێوەی ژیان و رەوتی ژیانی تایبەتی خۆیان هەیە کە جیاواز دەردەکەون لە چاو کەسانی دی، واتە ئەوان خۆیان نەك هەر بەرگری لە مافێکی تایبەتی خۆیان دەکەن کە پەیوەندە بە سێکسەوە بەڵکو ئەوان بەرگری لە شێوەی ژیان و گوزەرانی خۆیان دەکەن، کە جیا لەوانی دی دەژین، سەرتاپا کاراکتەرێکی جیاواز دەردەکەون، ئەوان بە تەنیا حەزێکی سێکسی تایبەتیان نیە، بەڵکو حەزێکی بەجیا ژیانیشیان هەیە کە ئەوان ئیتر تێکەڵاوی کەسانی دی نابن، لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەو پرسیارەی لە سەرەتای ئەم کتێبەدا دەکرێت (سێکسوالیتی چییە؟) پرسیارێکی سادەیە، وەڵامدانەوەشی سەخت و ئاڵۆزە. هەر وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە دابنرێت دواتر پێویستی بە روونکردنەوەو لەسەر وەستان هەیە ئەمەش پەیوەندە بەوەوە کە ئەم پرسیارە وەڵامێکی ئامادەکراو و پێناسەیەکی دیاری کراوی نیە.

سێکسوالیتی بەرلەوەی بەدەستهێنانی ناسنامەی دیاری کراوی خۆیان بکەنە خواستێك، هاوکات دەگەرێن بەدوای چێژێکی سێکسیشدا، بەڵام ئەوان لەوە بێ ئاگان کە ئەوان لە سەفەرێکی بەردەوامن لە نێوان مەرگ و ژیاندا، چێژی سێکسی وا ناکات تەنیا عاشقەکان بمرێنێ لەو شوێنەی کە تێیدا دەژین، بەڵکو ئەوان مەرگێکی حەقیقی لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن کە زۆر نزیکترە لەو چێژەی کە پێیان دەبەخشرێ. بە واتایەکی دی ئەوان ئەزمونی مەرگێکی بچوك دەکەن کە ئالوگۆرێکی دژواری هەیە؛ باوەڕهێنان بە سێکسی مەرگ هێنەر بوو بە بەرهەمێکی کلتوری سەدەی رابردوو کە رەخنەگرەکان قسەیان لەسەر ئەوە کردووە بەر لەوەی سێکسی مەرگ هێنەر بگاتە رەگەزی (مێ)، زووتر بە رەگەزی (نێر) دەگات و دواتر دەیکوژێت، بوونی نێر بە قوربانی چێژێکی مەرگاوی کە سێکسوالیتی پیادەی دەکات، نووسەری ئەم کتێبە هۆی سەرەکی بەشێك لەم هاوکێشانە دەبەستێتەوە بەو نمایشە پۆرنۆگرافیانەوە کە سەرتاپای دونیای گرتۆتەوەو بازارێکی گەورەش لە ئابوری لیبیدناڵی دروست کردووە.

ئەو ئاماژە بەوە دەدات کە ئەو نمایشانە هاندەرێکی باشن بۆ بڵاوبوونەوەی رەمزی مەرگ بۆ سێکس کە زیاتر لە توندوتیژییە سێکسیەکاندا دەردەکەوێت.

